


# تەفسیری زمناکۆیی

بەقەڵەمی

مەلا سعیدی زمناکۆیی












# تەفسیری زمناکۆیی

بەقەڵەمی

مەلا سعیدی زمناکۆیی

جزمی ﴿٢٨، ٢٩، ٣٠﴾

بەرگی دوازدەهەم

ناوی کتێب : تەفسیری زمناکۆیی .
ناوی نووسەر :مەلا سعیدی زمناکۆیی .
جزمی بیست و هەشتەم و بیست و نۆهەم و سیهەم .
بەرگی دوازدەهەم.
چاپی یەکەم .
چاپی کۆمپیوتەر و ڕاکێشانی : ﴿ چاپخانەی ئۆفسێتی بابان ﴾
ژمارەی سپاردنی (٤٠٩) ی ساڵی ( ٢٠٠٠ ) ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێ سپێردراوە .



به ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان. سوپاس و ستایش بۆ خودای هەموو بوونەوەران. دروودی بێ ئەندازە لەسەر پێشەوا و ڕابەری ئادەمیزاد و، لەسەر هەموو پەیڕەوانی بێ.

## ﴿ سورەتی ئەلموجادەلە ﴾

لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: جگە لە ڕستەی ﴿ ما يكون من نجوى ثلاثة إلاّ هو راجعهم ﴾ هەندێ تر لە زانایان ئەڵێن: (١٠) ئایەتی پێشەوەی لە مەدینە هاتوونەتە خوارەوە. ئەوانی تری لە مەکە هاتوونەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٢٢) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ
وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ (١) الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ
مِنكُم مِّن نِّسَائِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا اللَّائِي
وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ الْقَوْلِ وَزُورًا وَإِنَّ
اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ (٢) وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ
لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ
بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (٣) فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ
مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ
مِسْكِينًا ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ
وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٤)

گێڕراوەتەوە کە خەولەی کچی سەعلەبەی ئەلئەنساری ژنی ئەوسی کوڕی سامیت بوو لە سەردەمی پێغەمەردا ﴿ﷺ﴾ ئەوس پیاوێکی تووڕە بوو، داوای شتێکی کرد لە ژنەکەی، ئەویش وولآمی نەدایەوە، ئەوس تووڕە بوو بە ژنەکەی خۆی ووت: (تۆ لە لای من وەك پشتی دایکم وایت) نەریتی پێش سەردەمی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، بەو شێوەیە پیاوێك ئەو ڕستەیەی بەکاربهێنایە لەگەل ژنەکەی خۆی تەلآقی ئەکەوت و قەدەغە ئەبوو لەو پیاوە، ئەو ڕستەیە پێی ئەوترا (زیهار)، ژنەکەی زۆر خەفەتبار بوو، مێردەکەشی پەشیمانی پەیداکرد و بە ژنەکەی خۆی ووت: من پێم وایە تۆ لە من قەدەغەی، ئەو زیهارە یەکەم ڕوودابوو لە سەردەمی پێغەمەردا ﴿ﷺ﴾، دانیشتووان نەیان ئەزانی فەرموودەی ئیسلام لەو بارەیەوە چۆنە؟

دوایی ژنەکە ڕۆیشت و ئەو ڕووداوەی گێڕایەوە بۆ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، بۆ ئەوەی پێغەمەر فەرموودەی تێدا بفەرموێت و فەرمان بدات بە کۆبوونەوەی لەگەڵ مێردەکەی ون بە ڕەوایی بچێتەوە بۆلای مێردەکەی. پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: من لەو بارەیەوە هیچ فەرمانێکم پێ نەدراوە، سروشم بۆ نەهاتووە، خەولە ووتی: من هانای خۆم و هەژاری خۆم ئەبەم بۆلای خودا، ئەو پیاوە مێردمە و ئامۆزایشمە، چەندین منالّی یچووکم لەو پیاوە هەیە. ئەگەر ئەیانبەمە لای خۆم تووشی برسێتی ئەبن، ئەگەر بیاندەم بەو پیاوە لەناو ئەچن، ئەو پیاوە منی بە گەنجی خواستووە، خاوەنی دارایی بووم و کەس و کاریشم هەبوون، دوای ئەوە لاویم بەسەرچوو، دارایییەکەی خواردم و کەس و کارم پەرژوبلآوبوون، (زیهاری) کردووە لەگەڵ مندا و وازی لێهێنام، خودای مەزن پاڕانەوە و هاناکەی لێوەرگرت. ئەم ئایەتانەی خوارەوەی نارده خوارەوە، پێغەمەر فەرمووی بە خەولە: مێردەکەتم بۆ بانگ بکە، ئەم ئایەتانەی بەسەردا خوێندەوە:

## بسم الله الرحمن الرحيم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ﴾ بە ڕاستی خودا گفتوگۆی ئەو ژنەی ئەوتۆی بیست هاتوچۆی لای تۆی ئەکرد لە بارەی کاری مێردەکەیەوە، هانای برد بۆلای خودا و، لەو پاڕایەوە و خەفەتی خۆی دەربڕی و، خودا وولآمی دایەوە.

﴿وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ وە خودا گفتوگۆی ئەو ژن و پیاوە و، هاتوچۆی ئەوانی ئەبیست، داواکانیان و پاڕانەوەکەی ئەوانی لەوان وەرگرت و وولآمی دانەوە. بەڕاستی خودا داوای هەموو کەسێ ئەبیسێ، هەموو شتێ ئەزانێ لە نیاز و کاروباری ئادەمیزاد.

بۆ زانین: مەرجەکانی (زیهار) ئەمانەن: یەکەم ئەو ڕستەیە لە مێردەوە بێ و، شێت و منال نەبێ، دووەم ئەو کەسەی زیهاری لەگەڵ ئەکرێ ژنی ئە پیاوەبێ و بێگانە نەبێ، سێهەم: ئەو ژنەی کە پیاوەکەی ژنەکەی وەك ئەو دائەنێ، قەدەغە بێ لەسەر ئە پیاوە و، هەرگیز بۆی درووست نەبێ ئەو پیاوە بیخوازێ، وەك دایك و کچ و خوشك، پشتی بن یا شیری، چوارەم، پێویستە ڕەستەیە هەبێ ئەو ژنەی پێ قەدەغەبکرێ، وەك ئەوەی بە ژنەکەی خۆی بڵێ: تۆ وەزك پشتی یان لەشی دایکم وای لە قەدەغەیی‌دا.

﴿الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَائِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا اللَّائِي وَلَدْنَهُمْ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ لە ئێوە ئەڵێن: بە ژنەکانیان، ئێوە وەك پشتی دایکی ئێمەن و قەدەغەن لە ئێمە، ئەو ژنانە لە ڕاستی‌دا دایکی ئەوان نین، دایکی ڕاستی ئەوان هیچ شتێ نی‌یە مەگەر ئەو ژنانەی ئەوتۆ دایکی ئەوانن ئەوانیان لە منداڵدانی خۆیانا بوبن و کەوتبنە خوارەوە.

﴿وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ الْقَوْلِ وَزُورًا وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾ وە بە ڕاستی ئەو کەسانە ئەو گفتوگۆیە ئەکەن دژی دەستووری خودایە و، درۆیەکی پووچە لە گفتوگۆدا و بێ مانایە، بە ڕاستی خودا لێبوردنی زۆرە بۆ کەسێ لە دەستوور لابدا، لێخۆشبوونی زۆرە بۆ کەسێ پەشیمان بیێتەوە.

ئەو پیاوانەی زیهار ئەکەن لەگەڵ ژنەکانی خۆیانا و، لە پاش ئەو گفتوگۆیە ئەوەندە کات بەسەریاندا بڕوات بتوانێ ژنەکەی تەلاق بدا و تەلاقی نەدا و، ئەو پیاوانە گەڕانەوە بۆلای ژن و مێردایەتی و، لە گفتوگۆی خۆیان پەشیمان بوونەوە، لە دوای ئەو کاتە پێویست ئەبێ لەسەریانبریتی یانێ (کەفارە) بەوجۆرەی لەمەودوا باسی ئەکرێت، ئیتر هەر پێویستە بریتی بدەن یا لە دوای ئەو ماوەیە ژنەکانیان تەلاق بدەن و، قەدەغەن لەسەر ئەو پیاوانە، ڕابوێرن لەگەڵ ئەو ژنانە بە هیچ شێوەیە، با ماچ و شتی تریش بێ. وەك خودای مەزن ئەفەرموێ:

﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ زیهار بکەن لەگەڵ ژنەکانیان لە پاشان گەڕانەوە لە شتێ وتبوویان و پەشیمان بوونەوە و ویستی‌یان لەگەڵ ژنەکانیانا ڕابوێرن و ژن و مێردیشی‌یان لەگەڵ بکەن و ژنەکانیان تەلاق نەدابوو، بەو جۆرەی باسکرا.

﴿فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ پێویستە لەسەریان بەر لە دەستدانیان لە یەکتری ئازادکردنی بەندەیەکی باوەڕدار، لای حەنەفی‌یەکان پێویست نی‌یە ئەو بەندەیە باوەڕدار بێ، ئازادکردنەکەیش لە پێش ئەوەوە ئەبێ، ئەو ژن و پیاوە دەست بدەن لە یەکتری بە هەموو جۆرێ، بە وبریتی دانە ئامۆژگاری ئێوەی پێ ئەکرێ هەتا ئێوە تەمێ‌خواربن جارێ تر کاری وا خراپ نەکەن و، خودا ئاگادارە بەشتێ ئێوە بیکەن و، لە بریتی دان و لە نەدانی.

﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أن يَتَمَاسَّا﴾ دوایی هەرکەسێ توانای ئازادکردنی بەندەی نەبوو، یا ئەوەی پێویست بووە لەسەری دەستی نەکەوت، پێویستە لەسەری ڕۆژووگرتنی دوو مانگ لەسەریەك، ڕۆژ بەڕۆژ بە بێ ئەوەی ڕۆژێ یشکێنێ بە بێ بیانوو، ئەگەر بیانووی هەبوو زانایان بیریان جیاوازە: هەندێکیان ئەڵێن: چەند ڕۆژی ماوە هەر ئەوە بگرێ، ئەو ڕۆژو گرتنە بەر لەوە بێ ئەو ژن و پیاوە دەست بدەن لە یەکتری، ئەگەر بەشەودا بچنە لای ژنەکانیان قەدەغە نیەو تەتابوغ نابچڕێ لای حەنەفی و مالیکی نابێ بچنە لای ژنەکانیان لە شەویشدا.

﴿فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا﴾ دوایی هەرکەسێ توانای ڕۆژووگرتنی نەبوولەبەر پیری و نەخۆشی بەردەوام، یا زۆر ئارەزۆی لە ژن و مێردی بوو خۆی پێ ڕاگیر نەئەکرا، دوایی پێویستە لەسەریان خواردەمەنی بدەن بە شەست هەژار، هەریەکەیان مودێ.

هەرچەندە خوای مەزن نەیفەرمووە: (بەر لەوەی دەست بدەن لە یەکتری) خواردەمەنی ببەخشێ بەلاَم ئەمیش وەك پێشووەکان وایە قەدەغەیە ڕابوردنیان لەگەڵ یەکتری بەر لە بەخشینی خواردەمەنی. زانایان بیریان جیاوازە: ئایا مەبەست لە تەماس: هەموو جۆرێکە، یان هەر چوونە لای، دوور نیە مەبەست ڕاکشان بێ لەگەڵ ژن. ئەگەر کەسێ چووە لای ژنەکەی بەر لە بریتیدان، ئەو کەسە گوناهبار ئەبێ و، هەر یەك بریتی پێویستە لەسەری، لای کەمێ لە زانایان پێویستە دوو بریتی بدات.

﴿ذَلِكَ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەو بریتیدانانە و ئاسان کردنی فەرمانی خودا، لەبەر ئەوەیە ئێوە باوەڕ بە خودا و بە پێغەمەری خودا بهێنن و، ئەوانە سنوورێکی دیاری کراوی خودان و، بۆ ئەو بێ باوەڕانە هەیە دژی فەمانی خودان سزایەکی خاوەن ئازار.

إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ كُبِتُوا۟
كَمَا كُبِتَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ وَقَدْ أَنزَلْنَآ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۚ وَلِلْكَٰفِرِينَ
عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٥﴾ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُم بِمَا
عَمِلُوٓا۟ ۚ أَحْصَىٰهُ ٱللَّهُ وَنَسُوهُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٦﴾
أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ مَا يَكُونُ
مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ

وَلَآ أَدۡنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمۡ أَيۡنَ مَا كَانُواْۖ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم
بِمَا عَمِلُواْ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴿٧﴾ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ
نُهُواْ عَنِ ٱلنَّجۡوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ وَيَتَنَٰجَوۡنَ بِٱلۡإِثۡمِ
وَٱلۡعُدۡوَٰنِ وَمَعۡصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوۡكَ بِمَا لَمۡ يُحَيِّكَ
بِهِ ٱللَّهُ وَيَقُولُونَ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ لَوۡلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُۚ حَسۡبُهُمۡ
جَهَنَّمُ يَصۡلَوۡنَهَاۖ فَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا
تَنَٰجَيۡتُمۡ فَلَا تَتَنَٰجَوۡاْ بِٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ وَمَعۡصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَتَنَٰجَوۡاْ
بِٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴿٩﴾ إِنَّمَا ٱلنَّجۡوَىٰ
مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ لِيَحۡزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَيۡسَ بِضَآرِّهِمۡ شَيۡـًٔا
إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١٠﴾

﴿إِنَّ الَّذِينَ يُحَادُّونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ كُبِتُوا كَمَا كُبِتَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ بە ڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ دژایەتی خودا و پێغەمەری خودا ئەکەن، دەستووریّ بۆ خۆیان درووست بکەن جگەی ئەو دەستوورەی خودا ناردوویە بۆ سەر فروستادەی خۆی، ڕسوا ئەکرێن بەو جۆرەی پێشووەکانی ئەوان ڕسوا کران و سەرشۆڕ ئەبن.

﴿وَقَدْ أَنزَلْنَا آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ و بە ڕاستی ئێمە ڕەوانەمان کردووە چەندین بەڵگەی ئاشکرا لە قورئاندا و جگەی قورئان لەسەر ڕاستی پێغەمەر و چاك و خراپ جویّ ئەکەنەوە و، پێویستی تر ناکا بە دەستووریّ ترو، بۆ بی باوەڕان هەیە سزایەکی ڕسواکەر بۆیان.

﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا أَحْصَاهُ اللَّهُ وَنَسُوهُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ تۆ بیری ئەو ڕۆژە بکەوەخودا هەموو گیاندارانی مردوو زیندوو ئەکاتەوە دوای مردنیان بۆ پرسیار و پاداشت، دوایی ئێمە هەواڵ ئەدەین بەوان بەشتیّ ئەوان کردوویانە و، خودا ئەو شتەی پاراستووە و ئاگاداری‌یەتی و، ئەوان ئەو شتەیان لە بیر چووەتەوە و، خودا ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکا و، پاداشت وەرئەگرن بە گوێرەی ئەوشتە.

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ ئایا تۆ نەتزانیو کە بە ڕاستی خودا ئەزانێ بە شتێ لە ئاسمانەکاندایە لە فریشتە و ئەستێرە و گیانی مردووەکان، بە شتێ لە زەویدایە لە کانگا و لە درەخت و لە ڕووەك و گیانداران.

﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَى ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَا أَدْنَى مِن ذَلِكَ وَلَا أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا﴾ چفە و نهێنی سێ کەس پەیدا نابێ مەگەر خودا ئەیزانێ، وەك چوارەم کەسیانە، نهێنی و چفەی پێنج کەس نابێ مەگەر خودا ئەیزانێ، مەگەر شەشەمیانەوە کەمتریش لەوانە و زۆرتریش لەوانە پەیدانابێ مەگەر خودا لەگەڵیانە لەهەر جێگەیە بن.

﴿ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ لە پاشانا خودا هەواڵ ئەدا بەوان لە ڕۆژی دوواییدا بە شتێ ئەوان کردوویانە. بە ڕاستی خودا بە هەموو شتێ ئەزانێ، بگرە بە هاتوچۆی لێوەکانیان.

کۆمەڵی لە جووەکان و لە دووڕووەکان کۆئەبوونەوە بە نهێنی و بە چفە گفتوگۆیان لەگەڵ یەکتری ئەکرد بە شتێ ئازاری بە باوەڕداران ئەگەیاند، هانی هەندێ تریان ئەدا کە بێفەرمانی خودا و نێردراوی خودا بکەن و، هەرکاتێ باوەڕداران تێیپەڕینایە بەلایاندا، تاوانیان تێ ئەگرتن، بە چاو و بە زمان و بە جووڵاندنەوی لێوەکانیان. بە گفتوگۆی پەنهان لە سەربەخۆ و، بە جۆرێ باوەڕداران مەبەستەکەیانیان نەئەزانی.

لە دڵی خۆیانا ئەیانووت: لەوانە کەس و کار و خزمانمان لە جەنگدا کوژرابن یا شکابن. بەو بۆنەوە باوەڕداران تووشی خەفەت ئەبوون. دوایی کاتێ ئەو کارە درێژەی کێشا لە جووەکان و دووڕووەکانەوە. باوەڕداران هانایان برد بۆلای پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ پێغەمەر فەرمانیدا واز لە چفە کردن بهێنن لە بارەی باوەڕدارانەوە، بۆ ئەوەی خەفەتبار نەبن، بەڵام هەر بەردەوامبوون لەسەر کردەوەی خراپ، لەسەر ئازاردانی دڵی باوەڕداران بە چفەکردن و تاوانج گرتن.

جووەکان و دووڕووەکان بەو پیلانەیشەوە نەوەستان، کاتێ ئەچوونە خزمەت پێغەمەر ئەیانووت: (السام عليك) یانێ مردن لەسەر تۆبێ لە، دانیشتوانیان وا ئەگەیاند کە ئەڵێن: (السلام عليك يا محمد) پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەیزانی چ شتێ ئەڵێن، پێغەمەریش لە وولامیاندا ئەیفەرموو: (عَلَيكم). ڕۆژێ عائیشە گوێی لێبوو بە پێغەمەریان ئەوت (السلام عليك) عائیشە تووڕە بوو، ووتی (بل عليكم السام واللعنه)، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەو گفتوگۆیەی عائیشە دڵخۆش نەبوو، ئەیەویست زمانی عائیشە دەق بگرێ بە چاك ووتن و وولامی چاکەوە، بگرە لەگەڵ دوژمنانیشدا، فەرمووی: عائیشە لەسەرخۆبە، خودا گفتوگۆی خراپی لا ناخۆشە، بەڵکو ئەوان چ شتێ ئەڵێن تۆیش بەو ووشەیە وولامیان بدەرەوە و بڵێ: (السام عليكم) یا بێ دەنگ بە، بۆیە لەو بارەوە ئەو ئایەتانە هاتنە خوارەوە و فەرمووی:

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نُهُوا عَنِ النَّجْوَى ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُواعنه﴾ ئایا تۆ نەترووانیوە بۆلای کەسانێکی ئەوتۆ قەدەغەکرابوو لەوان چفەکردن و گفتوگۆی نهێنی، وەك جووەکان و دووڕووەکان کە ئازاری دڵی باوەڕدارانیان ئەدا، خودا فەرمانی دابوو وازی لێبهێنن، لە پاشانا گەڕانەوە بۆلای شتێ لەوان قەدەغە کرابوو، دەستیان کردەوە بە چفەکردن.

﴿وَيَتَنَاجَوْنَ بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ الرَّسُولِ﴾ وە ئەو کەسانە گفتوگۆی نهێنی ئەکەن بە درۆکردن و ستەمکردن و بێفەرمانی نێردراوی خودا.

﴿وَإِذَا جَاؤُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ اللَّهُ﴾ وە هەرکاتێ بهاتنایە بۆلا تۆ مەرحەبای تۆیان ئەکرد بە شتێ خودا مرحەبای تۆی بەو شتە نەئەکرد، لە جیای ئەوەی بڵێن: (السلام علیك) ئەیان ووت: (السام علیك) مردن لەسەرتۆبێ، یا ئەڵێن: (إنعم صباحا) یانێ بەیانیت باش.

﴿وَيَقُولُونَ فِي أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا اللَّهُ بِمَا نَقُولُ﴾ و لە دڵی خۆیانا ئەڵێن ئەگەر موحەمەد ڕاست ئەکا و پێغەمەرە بۆچی خوا سزای ئێمە نادا بەهۆی شتێکەوە ئێمە ئەیلێین.

﴿حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ بەسە بۆ ئەوان سزادانی دۆزەخ ئەخرێنە ناوی و ئازاری ئەچێژن، دوایی دۆزەخ خراپترین جێگەیە بۆ گەڕانەوەی ئەوان.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَنَاجَيْتُمْ فَلَا تَتَنَاجَوْا بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ الرَّسُولِ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: هەر کاتێ ئێوە بە نهێنی گفتوگۆتان کرد، دوایی ئێوە چفەمەکەن و گفتوگۆی نهێنی مەکەن بە گوناه و درۆکردن و، بە ستەمکردن و دەست درێژی و، بە بێ فەرمانیکردنی نێردراوی خودا.

﴿وَتَنَاجَوْا بِالْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ وە ئێوە گفتوگۆی نهێنی بکەن بە چاکەکردن و ترسان لە خودا و خۆپاراستن لە بێ فەرمانی خودا و، ئێوە لەو خودایەی ئەوتۆ بترسن ئێوە بۆلای ئەو کۆ دەکرێنەوە.

﴿إِنَّمَا النَّجْوَى مِنَ الشَّيْطَانِ لِيَحْزُنَ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ بە ڕاستی چفەکردن بە گوناه و بە دەستدرێژی لە شەیتانەوەیە، لەبەر ئەوەی ئازاری کەسانێکی ئەوتۆ بدەن باوەڕییان هێناوە.

﴿وَلَيْسَ بِضَارِّهِمْ شَيْئًا إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ وە شەیتان زیان بە باوەڕداران ناگەیەنێ مەگەر بە دەستووری خودا و، باوەڕداران پێویستە پشت هەر لەسەر یاریدەی خودا ببەستن.

بە ڕاستی زۆر کەس هەن لە ئادەمیزاد باوەڕیان بە خودا هەیە، نوێژ ئەکەن و ڕۆژوو ئەگرن و، بە ڕاستی و بە بێ دووڕوویی. بەڵام بەداخەوە ناوەڕۆکی ئەو ئایەتانەیان لە بیر نامێنێ زۆرجاران و، لە زۆر کاریانا و، چفە لەگەڵ یەکتری ئەکەن بۆ زیان گەیاندنی بە دانیشتووان.

پێغەمەری خودا ﴿ﷺ﴾ کاتی وا ئەبوو دائەنیشت لە هەندێ جێگەدا بۆ ئامۆژگاری کردن و فێرکردنی دانیشتووان بۆ کاروباری هەردوو جیهانیان، دانیشتووانیش پێشبڕکێیان ئەکرد و، جێگەی خۆیانیان ئەگرت لە نزیك پێغەمەرەوە، وایش ئەبوو جێگەیە تەنگ ئەبوو، لە ناویاندا کەسانی وا هەبوون پیربوون، یا گوێیان گرانبوو، یا زاناتر و بە تەمەنتر بوون، بە پێوە ئەوەستان بۆ گوێ گرتن لە فەرموودەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، پێغەمەر کاتی وا ئەبوو ئەیفەرموو: بڵاووەبکەن هەتاکو جێگەی هەمووتان ببێتەوە، یا هەندێ کەس هەڵئەسان بۆ یەکێ تری پیرۆز و زاناتر دابنیشێ لە جێگەی ئەودا، هەندێ کەس ئەو کارەیان پێ ناخۆشبوو، بۆیە خودای مەزن ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە، فەرموی:

یَا أَیُّهَا الَّذِینَ
ءَامَنُوا إِذَا قِیلَ لَکُمْ تَفَسَّحُوا فِی الْمَجَالِسِ فَافْسَحُوا یَفْسَحِ
اللَّهُ لَکُمْ وَإِذَا قِیلَ انشُزُوا فَانشُزُوا یَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِینَ ءَامَنُوا
مِنکُمْ وَالَّذِینَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِیرٌ ﴿١١﴾
یَا أَیُّهَا الَّذِینَ ءَامَنُوا إِذَا نَاجَیْتُمُ الرَّسُولَ فَقَدِّمُوا بَیْنَ یَدَیْ نَجْوَاکُمْ
صَدَقَةً ذَٰلِكَ خَیْرٌ لَّکُمْ وَأَطْهَرُ فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِیمٌ
﴿١٢﴾ ءَأَشْفَقْتُمْ أَن تُقَدِّمُوا بَیْنَ یَدَیْ نَجْوَاکُمْ صَدَقَاتٍ فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُوا
وَتَابَ اللَّهُ عَلَیْکُمْ فَأَقِیمُوا الصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا الزَّکَوٰةَ وَأَطِیعُوا اللَّهَ
وَرَسُولَهُ وَاللَّهُ خَبِیرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٣﴾

﴿یَا أَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا إِذَا قِیلَ لَکُمْ تَفَسَّحُوا فِی الْمَجَالِسِ فَافْسَحُوا یَفْسَحِ اللَّهُ لَکُمْ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: هەرکاتێ بێژرا بە ئێوە بڵاوەبکەن لە جێگەی دانیشتنی خۆتانا بۆ ئە کەسانەی دێن جێگەیان نییە، یا بە پێوە وەستاون و، یا ئەیانەوێ دانیشن، دوایی ئێوە بڵاوە بکەن بە خۆتان، خودا فراوان ئەکا بۆ ئێوە میهرەبانی خۆی لە هەردوو جیهاندا و، بە پلەی بەرز لە کاتی چوونتان بۆ بەهەشت.

﴿وَإِذَا قِیلَ انشُزُوا فَانشُزُوا یَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِینَ آمَنُوا مِنکُمْ﴾ وە هەرکاتێ بێژرا بە ئێوە: ئێوە هەڵسن لە جێگەی خۆتانا بۆ کەسانێ دێن و بە پێوەن، دوایی ئێوە هەڵسن، خودا بەرز ئەکاتەوە

پلە و ڕێزی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە لە ئێوە و، بە پاداشتی بەرز لە پاشەڕۆژدا ئەگەر ئێوە هەڵسن.

﴿وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ وە خودا بەرز ئەکاتەوە کەسانێکی ئەوتۆ بەخشراوە بەوان زانیاری زۆرتر لە باوەڕداران بە چەندین پلەوپایە، ڕێزیان ئەدا بەسەر جگەی خۆیاندا و، خودا ئاگادارە بە شتێ ئێوە بیکەن لە چاك و لە خراپ و، لە هەڵسان و لە هەڵنەسان لە جێگەی خۆتانا.

خودای مەزن ئاماژە ئەفەرموێ بۆلای سێ شت، شایستەیە ڕوون بکرێتەوە:

١- ئاماژە ئەفەرموێ: هەرکەسێ دەرگای چاکەکردن و ڕێز و ئارامی بکاتەوە و پەرەی پێبدا، بۆ کەسانی تر شایستەی ئە و چاکانەن، لەبەر ئەوەی تەمەنیان زۆرترە و بەڕێزترن، خودای مەزنیش فراوان ئەکا بۆ ئەوان چاکەی هەردوو جیهان.

٢- ئاماژەیش ئەفەرموێ: بۆ بەرزی شانی زانایان کە ڕێزیان دراوە بەسەر کەسانی تردا، زانستییان کەمترە بە چەندین پلەوپایە. هەروەها ڕێزی باوەڕدارانی داوە بەسەر بێ باوەڕاندا.

٣- ئاماژەیشی فەرموو: پلەوپایە، هەر بە زانست و هەر بە لە خودا ترسانە. نەك بە دارایی و بە پلەوپایەی جیهان و، بەوەی کە لای ژورووی کۆڕوکۆمەڵەوە دانیشێ، لەلای خودا پلەوپایەی زانایان، دوای پلەوپایەی پێغەمەرانە و، پێش پلەی شەهیدانە، ئەوەتە پێغەمەر ئەفەرموێ: (یشفع یوم القیامة الأنبیاء ثم العلماء ثم الشهداء) لەو بارەوە ئایەت و زۆر و فەرموودەی زۆی پێغەمەر هەن.

هەندێ لە موسڵمانان ئەیانویست بە تەنها کۆببونایەتەوە لە خزمەت پێغەمەردا و، چفەی لەگەڵ بکەن بە نهێنی، هەندێ تریان مەبەستیان لەو کارە ئەوەبوو، دەری بخەن بۆ دانیشتووان کە لە لای پێغەمەر پلەوپایەی تایبەتییان هەیە، وەك دەبینرێ هەندێ کەس لە زۆر جێگە خۆی نزیك ئەکاتەوە لە کاربەدەستان بە مەبەستی کاری جیهان، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ چاوپۆشی ئەکرد و پاڵی بە هیچ کەسێکەوە نەئەنا زۆرتر گفتوگۆی نهێنی لەگەڵ بکا، وای لێهات پێغەمەر تووشی ئازار بوو، بۆ ئەو مەبەستەی خودای مەزن ئەو ئازارەی لەسەر سوك بکا، پێویستی کرد هەرکەسێ چفە لەگەڵ پێغەمەر بکا، پێویستە لە پێشەو سەدەقەیە بکا بە هەر شتێ بێ و بیدا بە هەژاران، زۆر کەس بۆ ئەو فەرمانە، چفەیان لەگەڵ پێغەمەر نەئەکرد، لەترسی ئەوەی نەوەك بەو بۆنەیەوە داراییان بەرەو کەمی بڕوات، یا نەتوانن سەدەقە بدەن، لەو بارەوە خودا فەرمووی:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَاجَيْتُمُ الرَّسُولَ فَقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَةً﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە هەرکاتێ ئێوە ویستتان چفە لەگەڵ پێغەمەردا بکەن، دوایی بە ڕاستی پێویستە ئێوە بەر لە چفەکردنەکەتان سەدەقەیە پێشکەش بە هەژاران بکەن.

﴿ذَلِكَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَأَطْهَرُ فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەو پێش خستنەی سەدەقە بەر لە چفەکردن چاکترە بۆ ئێوە و، دەروونتان پاکتر ئەکاتەوە لە گوناه، دوایی ئەگەر ئێوە هەژاربوون و، دەستتان نەکەوت شتێ بیکەن بە سەدەقە و، ئەتانویست چفەبکەن لەگەڵ پێغەمەر و، چفەتان کرد، دووایی خودا لێبوردنی زۆرە و میهرەبان و خاوەن بەزەیی‌یە، بۆ ئەوانە چفەئەکەن و هەژارن.

کاتێ ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە، پێویست کرا لەسەر هەموو کەسێ کە بیەوێ گفتوگۆی نهێنی بکا لەگەڵ پێغەمەردا چاکەیە بکا و ببەخشێ بە هەژاران، ئەو فەرمانە گران کەوت لەسەر ئادەمیزاد، چونکە ئەوان پێیان خۆشبوو چفە بکەن لەگەڵ پێغەمەردا ﴿ﷺ﴾، بەلاّم ئەترسان دارایی و سامانیان لەو کارەدا بڕوا و، یا دەستکورتن و ناتوانن سەدەقە بکەن، خودای مەزن کارەکەی لەسەر بەندەکانی خۆی سووك کرد و، دەستووری پێدان چفەبکەن لەگەل پێغەمەردا و سەدەقە نەبەخشن، لەو کەسانە خۆشبوو کە سەدەقەیان نەبەخشیبوو، چفەیانکرد لەگەل پێغەمەری خوادا، بەو مەرجەی کەمتەرخەمی نەکەن لە نوێژکردن و زەکات دان و فەرمانەکانی تری خودا. خودای گەورە لە بارەیەوە فەرمووی:

﴿أَأَشْفَقْتُمْ أَن تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَاتٍ فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُوا وَتَابَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ﴾ ئایا ئێوە ترسان لە نەمانی دارایی خۆتان و، ڕژدیتان کرد سەدەقە بکەن لەبەر ئەوەی چفە بکەن لەگەڵ پێغەمەر، دوایی کاتێ ئێوە ئەو کارە ناکەن بەر لە چفەکردن سەدەقە ناکەن و، خودا.

ئەو کارەی لەسەر ئێوە ئاسانکرد و، سزادانی لەسەر ئێوە هەڵگرت، بەهۆی وازهێنانتان لە بەخشینی سەدەقە بەر لە گفتوگۆی نهێنی‌کردن لەگەڵ پێغەمەر. لەمەودوا بە یەکجاریی سەدەقەتان لەسەر هەڵگیرا و ئەتوانن بەبێ سەدەقە چفە بکەن لەگەڵ پێغەمەر و، سزای ئێوە نادا لەسەر وازهێنانتان لە پێشخستنی سەدەقە.

﴿فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ دوایی ئێوە پێویستە نوێژەکانتان بکەن بەو جۆرەی فەرمانتان پێدراوە و، زەکاتەکانتان بدەن بە هەژاران، بە گوێرەی سنووری دیاری‌کراو بۆی، ئێوە پەیڕەوی فەرمانەکانی خودا و نێردراوی خودا بکەن و، خودا ئاگادارە بە شتێ ئێوە ئەیکەن لە چاك و لە خراپ، بە بۆنەی ئەو فەرموودانەی خودای مەزن ئەم شتانەی دوایی ڕوون دەکەینەوە:

١ – موقاتیلی کوڕی حەیان لە تەفسیرەکەی خۆی‌دا ئەڵێ: بە ڕاستی ساماندارەکان زۆریان سەندبوو، بەسەر هەژارەکاندا لە خزمەت پێغەمەردا، ئەو ڕەوشتە ڕەوشتی هەموو سامانداریکە لە هەموو سەردەمێکدا، ساماندارەکان بەهۆی دارایی خۆیانەوە، چفەی زۆریان ئەکرد لە خزمەت پێغەمەردا ﴿ﷺ﴾ بە جۆرێ پێغەمەر لای ناخۆشبوو، درێژە بدەن بە دانیشتن، دوایی

خودای گەورە فەرمانی دا بە سەدەقەکردن ، بەر لەوەی چفەبکەن لەگەڵ نێردراوی خوادا، دوای ئەوە ئەو سامانداران وازیان لە چفەکردن نەهێنا. بەڵام هەژارەکان ئاواتیان ئەخواست دارایییان هەبووایە و بیانبەخشییایە و بگەیشتنایەتە خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، بەوبۆنەوە پلەی هەژاران بەرزبوویەوە و پلەی سامانداریش دابەزی.

٢- هەندێ لە خاوەن تەفسیرەکان ئەڵێن: ئەو ئایەتە هاتووەتە خوارەوە، فەمووی: بەر لە گفتوگۆی نهێنی پێویستە سەدەقەیە بکەن هیچ کەسێ کاری پێ نەکرد جگە لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب، تاکە دینارێکی هەبوو گۆڕییەوە بە (١٠) درهەم، دوایی هەرکاتێ بیویستایە چنەی لەگەڵ پێغەمەر بکردایە، دیرهەمێکی ئەبەخشی، دواتر ئەو فەرمانە کاری پێ نەکرا و گۆڕرا هەموو کەسێ بە بێ سەدەقە ئەیتووانی چفە لەگەڵ پێغەمەردا بکات.

فەرموودەی خودا ﴿ يَرْفَعُ الذينَ أمنُوا أمنكم وَالذينَ أوتُوا العِلْمَ دَرَجاتِ ﴾ ئەمەمان فێر ئەکا کە باوەڕداران و زانایان لە لای خودا ڕێزیان ئەگیرێ، ناوەڕۆکی ئەو فەرموودەیە، شارستانییەت و دادپەروەری ڕاستەقینەیە، بۆ ئەو کەسانەی خزمەتی مرۆڤایەتی بکەن، ئەو کەسانەی زانای ڕاستین و پلەی بەرزییان ئەدرێتێ لای خودا. نەك ئەو کەسانەی درووستکەری ساروخی (مینوتمان- س س) و جگەی ئەوان بۆ کاولکردنی نیشتمان و بنەبڕکردنی گیانداران. ئەو کەسانە نرخییان بۆ دانانرێ مەگەر لای شەیتان و قوتابییەکانیان نەبێ، ئەو شتانە شارستانییەتی ستەم و دەست درێژین.

مرۆڤی نیشتمانپەروەر و مافی مرۆڤ پارێز، پێویستە سوودی گشتی بخاتە سەرووی سوودی تایبەتی خۆی و سوودی ڕەگەزی خۆی. نەك بە وێنەی سەرۆك و سەرانی ئەم سەردەمە بە گشتی و، سەرۆکی ڕژێمە بەهێزەکان بە تایبەتی: بۆ نموونەی خۆپەرستی و ڕەگەزپەرستی، لە ساڵی (١٩٤٥) زایینی دوای جەنگی جیهانیی دووەم، چێرچڵی سەرۆك شالیاری بەریتانیا، ستالینی سەرۆك کۆماری ڕووسیا، ڕۆزفلتی سەرۆك کۆماری ئەمریکا، پێك هاتن لەسەر گفتوگۆ و ڕاوبۆچوونیان لەسەر پاشەڕۆژی خۆیانەوە، لە شاری (بوداپێست). بەڵام ناکۆکییان لێ پەیدابوو، کام لایان لە پێشا بچنە ژوورەوە بۆ ناو جێگەی دانیشتن و درێژەی کێشا، دوایی کۆتایی پێ هات بچنە ژوورێ سێ دەرگای هەبێ و لە یەك کاتتدا هەر یەکەیان لە دەرگایەکەوە بچنە ژوورێ، وێنەی ئەو خۆپەرستانە خزمەتی مرۆڤایەتی ئەکەن؟.

أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْاْ قَوْمًا
غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى ٱلْكَذِبِ

وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟
يَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَيْمَـٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَهُمْ
عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٦﴾ لَّن تُغْنِىَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ
شَيْـًٔا ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿١٧﴾ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ
ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ ۖ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ ۚ أَلَآ
إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْكَـٰذِبُونَ ﴿١٨﴾ ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ فَأَنسَىٰهُمْ ذِكْرَ
ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ حِزْبُ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱلشَّيْطَـٰنِ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ
﴿١٩﴾

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ تَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ﴾ ئایا تۆ نەتزانیوە و نەتڕوانیوە بۆلای کەسانێکی ئەوتۆ لە بێ باوەڕان دۆسایەتی تاقمێ ئەکەن لە جووەکان خودا سزای ڕژاندووە بەسەریانا، ئەو دووڕووانە لە ئێوەی موسڵمانان و، نە لە جووەکانن. بەڵکو دووڕوون لەسەر هیچ ئایینێ نین.

﴿وَيَحْلِفُونَ عَلَى الْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ وە ئەو دووڕووانە سوێند ئەخۆن لەسەر ئەوەی موسڵمانن. لەگەڵ ئەوەیشدا درۆ ئەکەن و، خۆیشیان ئەزانن بە دەستیان قەس سوێند ئەخۆن و درۆ ئەکەن.

﴿أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ خودا ئامادەی کردووە بۆ ئەو دووڕووانە سزایەکی زۆر سەخت بە ڕاستی ئەو دووڕووانە کارێکی خراپ ئەکەن، کارەکەیان خراپ کارێکە.

﴿اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ ئەو دووڕووانە سوێند خواردنەکەی خۆیانیان کردووە بە قەڵغان و سوپەرێ خۆێن و دارایی خۆیان ئەپارێزن، دوایی ڕێگە ئەگرن لە بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام، دوایی بۆ ئەوان هەیە سزایەك ڕسوا و بێ‌نرخی‌یان ئەکا.

ئەو ئایەتە لەوە هاتووەتە خوارەوە، دووڕووەکان لە خزمەت پێغەمەردا دائەنیشتن، دوایی فەرموودەی پێغەمەر و هاوڕێکانی پێغەمەری‌یان ئەبرد بۆلای جووەکان، ئەو دووڕووانە

سەرۆکەکانیان بریتی بوون لە عەبدووڵای کوڕی ئوبەی و عەبدوڵای کوڕی نەتبەل، دوایی عەبدوڵای کوڕی نەتبەل هات بۆ خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ پێغەمەر فەرمووی بە عەبدواللە بۆ جنێوت پێداوم، عەبدواللە سوێندی خوارد و ووتی جنێوم پێ نەداویت.

﴿لَن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَالُهُمْ وَلَا أَوْلَادُهُم مِّنَ اللَّهِ شَيْئًا أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّار هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ دارایی و منالەکانی ئەو دووڕووانە لانادا لەوان لە سزای خودا هیچ شتێ، ئەو کەسانە دانیشتوو و یاری ئاگری دۆزەخن، لە ناو ئاگردا بەردەوامن.

﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە خودا ئەوان زیندوو ئەکاتەوە هەموویان، بە دووڕووەکان و جووەکانەوە، دوایی سوێند ئەخۆن بۆ خودا ئێمە موسڵمان بووین، هەر بەو جۆرەی لە جیهاندا سوێندیان بۆ ئێوە ئەخوارد.

﴿وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَى شَيْءٍ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ﴾ ئەو بێباوەڕانە گومان ئەبەن بە ڕاستی ئەوان بەو سوێندە لەسەر شتێ ئەبن ڕزگاریان بکا لە سزای خودا، ئێوە ئاگادار بن بە ڕاستی ئەوان لە ئەوپەڕی درۆزنیدان کە سوێند ئەخۆن بە خودا بەدرۆ.

﴿اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ فَأَنسَاهُمْ ذِكْرَ اللَّهِ أُوْلَئِكَ حِزْبُ الشَّيْطَانِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ الشَّيْطَانِ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ شەیتان دەستەڵاتی پەیداکردووە بە سەر ئەو بێباوەڕانەدا و، بووە بە گەورەیان و سواری ئەقڵیان بووە، دوایی شەیتان فەرمووده و یادی خوای لە بیربردوونەتەوە، ئەو کەسانە تاقمی شەیتانن، ئێوە ئاگادار بن ئەو کەسانە خۆیانیان لە ناوبردووە و، خۆشی بەهەشتیمان لە کیسی خۆیان داوە و تووشی زیان بوون.

إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡأَذَلِّينَ (٢٠)
كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغۡلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِيٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ (٢١)
لَّا تَجِدُ قَوۡمٗا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ يُوَآدُّونَ مَنۡ
حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوۡ كَانُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ أَوۡ أَبۡنَآءَهُمۡ
أَوۡ إِخۡوَٰنَهُمۡ أَوۡ عَشِيرَتَهُمۡۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ
ٱلۡإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٖ مِّنۡهُۖ وَيُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي
مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ
عَنۡهُۚ أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱللَّهِۚ أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ (٢٢)

﴿إِنَّ الَّذِينَ يُحَادُّونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَئِكَ فِي الأَذَلِّينَ﴾ بە ڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ دوژمنایەتی خودا و نێردراوی خودا ئەکەن، لە سنووری فەرموودەی خودا دەرئەچن، ئەوانە لەو تاقمانەن خودا ڕسوا و سەروخواریان ئەکات.

﴿كَتَبَ اللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا وَرُسُلِي إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ خودا فەرمانی داوە بە فەرمانێکی بێگومان، بە ڕاستی ئایینی من و نێرداوی من سەرئەکەون بەسەربێباوەڕاندا لە جیهاندا بە بەڵگەی ئاشکرا و بە چەك و بە سزای ئاسمان و بە ناوبردنی چاك هەتاهەتایە، ئەوەبوو خودا یارمەتی پێغەمەری دا و مەکەی داگیر کردو، شکۆی فارسو ڕۆم و پیلانی جووەکان لە ناوچوون. بە ڕاستی خودا زۆر بە توانایە یارمەتی پێغەمەرانی خۆی ئەدا. زۆر گەورەیە کەس ڕێگە بە مەبەستی ناگرێ.

﴿لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءهُمْ أَوْ أَبْنَاءهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾ تۆ دەستت ناکەوێ تاقمێ باوەڕبهێنن بە خودا و بە ڕۆژی دوایی دۆستایەتی کەسێ بکەن دوژمنایەتی خودا و پێغەمرەی خودایان کردبێ‌ن با وەکو ئەو کەسە دوژمنایەتی ئەوان ئەکا باوك و کوڕ و برا و هۆز و خزمیان بن؛ چونکە خودا ئەفەرموێ: (ما جعل الله لرجل من قلبين في جوفيه) خودا درووستی نەکردووە بۆ پیاوێ دوو دڵ لە ناو سکیا، بە دڵێکی خودای خۆشبوێ، بە دڵەکەی تری دوژمنی خودای خۆشبوێ.

﴿أُوْلَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ﴾ ئەو کەسانە دۆستایەتی دوژمنانی خودا ناکەن، خودا باوەڕهێنانی لە دڵیانا داناوە و جێگەی خۆی گرتووە و، یارمەتی ئەوان ئەدا بە ڕووناکی قورئان کە وەك گیان وایە بۆ ئادەمیزاد.

﴿وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُوْلَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ وە خودا ئەو کەسانە کە دۆستایەتی دوژمنانی خودا ناکەن ئەیان خاتە ناو چەندین بەهەشت ئەڕوا بە ژێر درەختەکانیا و بەم لاولای کۆشکەکانیا چەندین ڕووباری ئاوی شیرین، بەردەوامن لە ناو ئەو بەهەشتانەدا، خودا ڕازیيە لەوان و خۆشی ئەوێن و ئەوانیش لە خودا ڕازین. خۆشنودن بەو چاکیە خودا لەگەڵ ئەوانی کردووە، ئەو کەسانە تاقمی خۆشەویستی خودان، ئێوە ئاگادرابن هەر تاقمی خودایە ڕزگاریان ئەبێ و سەرئەکەون بەسەر دوژمنانی خودادا.

موسڵمانان لە سەردەمی پێغەمەردا ﴿ﷺ﴾ خزمایەتی و هۆزایەتی‌یان بەکار نەئەهێنا لەگەڵ ئەو کەسانەدا دوژمنی خودابوون، ئەوەبوو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح باوکی خۆی کوشت لەبەدردا ئەبووبەکر لە ڕۆژی بەدرا داوای لە کوڕی خۆی کرد، مەسعەبی کوڕی عومەیر برای خۆی بکوژێ، عومەر عاسی خاڵی خۆی کوشت لە جەنگی بەدردا، نموونەی زۆر هەن لەو بارەوە.

# ﴿ سورەتی ئەلحەشر ﴾

لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٢٤) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ۖ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ
﴿١﴾ هُوَ الَّذِي أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِنْ دِيَارِهِمْ
لِأَوَّلِ الْحَشْرِ ۚ مَا ظَنَنْتُمْ أَنْ يَخْرُجُوا ۖ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ مَانِعَتُهُمْ
حُصُونُهُمْ مِنَ اللَّهِ فَأَتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا ۖ وَقَذَفَ
فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ ۚ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُمْ بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ
فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ ﴿٢﴾ وَلَوْلَا أَنْ كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِمُ
الْجَلَاءَ لَعَذَّبَهُمْ فِي الدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابُ النَّارِ ﴿٣﴾
ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۖ وَمَنْ يُشَاقِّ اللَّهَ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ
الْعِقَابِ ﴿٤﴾ مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً
عَلَىٰ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ ﴿٥﴾

جووەکان لەسەرەتای ئیسلامدا لە مەدینە و خەیبەر و جێگەکانی تردا نیشتەجێبووبوون، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ دوای ئەوەی لە مەککە کۆچی کرد بۆ مەدینە، بوو بە دراوسێی جووەکان. هەندێکیان لە دەوروبەری مەدینەبوون. جووەکان بریتی بوون لە سێ هۆز: بەنوقەینقاع. بەنو نەزیر، بەنو قورەیزە. گێڕراوەتەوە بەنو نەزیرەکان، ئاشتەوایی و دۆستایەتی‌یان لەگەڵ پێغەمەر تۆمارکرد. کە جەنگی لەگەڵ نەکەن و ئازاری بۆ نەرەخسێنن و، یارمەتی کەس نەدەن لە دژی پێغەمەر﴿ﷺ﴾، دوایی کە پێغەمەر لە جەنگی بەدردا سەرکەوت، بەنونەزیرەکان ووتیان: موحەمەد ئەو کەسەیە شێواز و ناوی لە تەوراتا ڕوون کراوەتەوە، بەیداخی نانەوەێ. کەچی پاش ئەوەی موسڵمانەکان لە جەنگی ئوحوددا شکان، کەوتنە گومانەوە لە پێغەمەرایەتی پێغەمەر. پەیمانەکەیان شکاند، سەرۆکەکەیان کە کەعبی کوڕی ئەشرەف بوو لەگەڵ چل

سواری تردا چوون بۆ مەککە، بوون بە سوێندخواری قورەیشەکان لە دژی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، جبرەئیل ئەو هەواڵەی دا بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، جگە لەوەیش ئەو کەعب ناوە، پێشتر دەستی کردبوو بە جنێودان بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ زۆر بە ناڕەوایی، بە جۆرێ پێغەمەری توورە کردبوو، بۆیە پێغەمەر فەرمانیدا بە موحەممەدی کوڕی سەلَە بە کوشتنی کەعب، ئەویش کەغبی کوشت، بە بۆنەی کوژرانی کەعبەوە بەنونەزیر هێزیان ڕووخا و دابەزی، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ دوای ئەوەش بە دڵپیسی ئەوانی زانی هەر لە سەر پەیمانی خۆی مابووەوە، ئەوەبوو چووبوو بۆلایان، هەتا داوای یارمەتییان لێبکا لە بارەی خوێنی دووکوژراو لە هۆزی بەنوعامیر کە کەسێ بە ناوی عەمری کوڕی ئومەیە ئەو دوو کەسەی کوشتبوو، کاتێ پێغەمەر لە تەنیشتی دیواری خانوویە لە خانووەکانیان دانیشتبوو، جووەکان کۆبوونەوە، بە نیازی پیلان دانان بۆ کوشتنی پێغەمەر.لەسەریەکێ لە خانووەکانیانەوە بەردێ فڕە بدەن بەسەر پێغەمەردا. هەواڵەکە لە ئاسمانەو هات بۆلای پێغەمەر لە بارەی ئەو پیلانەوە، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هەڵسا و بەرەو دوا گەڕایەوە بۆ مەدینە و بۆلای هاورێکانی، لەبەر ئەو هەموو پیلانەی هۆزی بەنونەزیر لە دژی پێغەمەر سازاندیان، پێغەمەر بڕیاری دا بە جەنگ کردن لەگەڵیاندا، فەرمانیدا بە کۆکردنەوەی سوپا بە گشتی، چون بۆ سەریان. جووەکان خۆیان حەشاردا لە ناو کۆشکەکانیاندا، پێغەمەر ئاگاداری کردن لە ماوەی ١٠ ڕۆژدا کۆشکەکانیان بەجێ بهێڵن و بێن بۆ مەدینە، یەکەم جار پاڵیان نا بە فەرمانەکەی پێغەمەرەوە، دواجار ملیان دانەواند بۆ فەرمانەکەی پێغەمەر، بەلاَم کۆمەڵێ لە دووڕووەکان لە هۆزی بەنوعەوف ناردیان بۆلای جووەکان، بەوانیان ڕاگەیاند خۆیان بگرن و ئێمە واز لە ئێوە نایەرین و، ئەگەر موحەمەد جەنگتان لەگەڵ بکا، ئێمەش جەنگ لەگەڵ ئەو دەکەین، ئەگەر ئێوەی دەرکرد ئێمەش لەگەڵتان دەرئەچین، جووەکان چاوەڕوانییان ئەکرد بێن بە دەمیانەوە، بەلاَم دووڕووەکان هیچیان بۆ نەکردن، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کە زانی قەلاَکانیان زۆر سەختن و بە گرانی پەلاماریان ئەدرێ، ناچار بوو بۆ ئەوەی بیانترسێنێ فەرمانی دەرکرد بە بڕینی هەندێ لە دارخورماکانیان کە گرنترین هۆی ئابووری ئەوان بوون، بەوبۆنەوە بێئومێدی کەوتە دڵیانەوە و لە دوو کار بەدەر هیچیان بۆ نەمایەوە، یا ئەبێ سەردانەوێنن بۆ فەرمودەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ یا جەنگی لەگەڵ بکەن، دوایی خۆ بەدەست دانەوەیان بۆ خۆیان هەڵبژارد، داوایان لە پێغەمەر کرد دەستووریان پێدا لە قەلاَکانیان بێنە دەرەوە، بەو مەرجەی خوێنییان پارێزراوبێ و، بەو مەرجەی هەر یەکەیان باری یەك هوشتر کەل و پەل و دارایی لەگەڵ خۆیان ببەنە دەرەوەجگە لە چەك و کەرەسەی جەنگ، جووەکان ئەو مەرجانەیان وەرگرت و کۆچییان کرد بۆلای خەیبەر و بۆلای شام و حیرە، بەو بۆنانەوە خودای مەزن لە سورەتی (ئەلحەشردا) ئەفەرموێ:

## بسم الله الرحمن الرحیم

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ شتێ لە ناو ئاسمانەکان و لە ناو زەوی‌دایە، پاکی و دووری لە هەموو کارێکی ناشایستەیە دەرئەبڕن بەو زمانەی خودا بەوانی بەخشیوە و، خودا زۆر بە دەستەلاّتە، هەموو کارێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ.

﴿هُوَ الَّذِي أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِن دِيَارِهِمْ لِأَوَّلِ الْحَشْرِ﴾ خودا کەسێکی ئەوتۆیە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنا لە خاوەن نامەکانی بەنونەزیری دەرکردن لە خانوو جێگەی خۆیان لە یەکەم کۆبوونەوە کە پێغەمەر بەستی بۆ جەنگ کردن لەگەڵ خاوەن نامەکان، ئەوەیش یەکەم دەرکردنە لە ناو نیمچە دوورگەی عەرەبدا بۆ جووەکان، هۆی دەرکردنەکەیان خراپەکاری و تێکدانی پەیمانەکەیان بوو.

بۆ زانین: یەکەم کۆبوونەوە بۆ دەرکردنیان، دەرکردنیان بوو بۆلای شام، دووەمین کۆبوونەوە بۆ دەرکردنیان: دەرکردنی عومەر بوو لە خەیبەرەوە بۆلای شام. مانای حەشر یانێ دەرکردنی تاقمێ لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیە تر.

پرسیار: پێغەمەری خودا بۆچی لەسەر خراپەکانی بەنوقورەیزە سزای دان بە دەرکردنیان و، دەست بەسەر دارایی گرتنیان و، ڕێگەی زۆرتر هەبوو بۆ سزادانیان؟

وەلاّم: بە ڕاستی پێغەمەر سزای دان بە گوێرەی یاسای ئایینی خۆیان کە لە تەوراتەکەی خۆیانا هاتووە:

(تۆ هەر شارێکت گرت بۆ خۆت، دوایی هەموو دانیشتووانی ئەو شارە هەر بۆ تۆیە، بۆ بەدەست بەسەراگرتنیان و کردنیان بە بەندە بۆ خۆت، دوایی خۆیانیان نەدا بە دەستەوە. بەڵکو جەنگیان لەگەڵ کردی، تۆ ئابلۆقەی ئەوان بدە. هەرکاتێ پەروەردگاری خودای تۆ دانیشتووانی ئەو شارەی دا بە دەستی تۆوە، دوایی تۆ نێرینەکانیان بکوژە، بەلاّم ژن و منالّ و ئاژاڵی ئەوان و هەرشتێ لەو شارەدایە بە دەستکەوتی تۆیە).

(صحاح (٢٠) من التثنية) بێگومان ئەو جوانە پابەندی ئایینی خۆیانیان بەجێ هێنا.

﴿مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُوا وَظَنُّوا أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ اللَّهِ﴾ ئێوەی موسڵمان گومانتان وابوو کە بەنونەزیر لە کۆشکەکانیان ناچنە دەرەوە و، جێگەی خۆیان بەجێ نایەڵن و، خاوەن نامەکان بەهێزن و، خاوەن نامەکانیش گومانیان وابوو کە قەلاّ سەختەکانیان ئەیانپارێزن لە دەستەلاّت و هەڵمەتی خودای مەزن. پێشخستنی ووشەی (مانِعَتُهُمْ) لەبەر ئەوەیە گومانی خۆیان بەرگری کردنیان مسۆگەرە.

﴿فَأَتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ﴾ دوایی سزای خودا چوو بۆلای خاوەن نامەکان لە جێگەیەکەوە ئەوان گومانیان نەئەبرد و چاوەڕوانیان نەئەکرد و نەئەهات بە دڵیانا، چونکە بە گومانی خۆیان بەهێز و بەتوانان و، خودا فڕەی دایە ناو دڵیان ترسێکی سەخت، بە تایبەتی دوای کوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەفی سەرۆکیان، هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ڕاناوی (آتاهُمْ) ئەگەڕێتەوە بۆلای باوەڕداران، یانی خودا بەخشی بەوان کۆمەکی و یارمەتی. بە جۆرێ نەئەهات بە دڵیانا سەرکەوتن بۆ خۆیان.

﴿يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ﴾ جووەکانی بەنونەزیر بەرلەوەی بچنە دەرەوە جێگە نایابەکانی خانووەکانی خۆیان ئەڕووخان بە دەستی خۆیان و دارایی بەنرخییان هەڵئەگرت هەتا موسڵمانان سودیان لێ وەرنەگرن و، باوەڕدارانیش خانووەکانی ئەوانیان ئەڕووخان هەتا نەتوانن بچنە ناویان، دوایی ئێوە تەمێ خواربن ئەی کەسانێکی ئەوتۆ خاوەنی ئەقڵن و، پشت مەبەستن بە کاری خراپ.

﴿وَلَوْلَا أَن كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِمُ الْجَلَاءَ لَعَذَّبَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابُ النَّارِ﴾ وە ئەگەر خودا فەرمانی نەدایە بە دەرکردنیان و پێویستی نەکردایە لە سەریان دەرچوونیان بە خۆیان و خێزانیانەوە بە ڕاستی خودا سزای ئەوانی ئەدا لە جیهاندا بە کوشتن و بنەبڕکردنیان بە وێنەی جووەکانی بەنوقورەیزە و بە وێنەی قوڕەیشییەکان و، بۆ ئەوان هەیە سزای ئاگر لە ڕۆژی دووایی‌دا، جگەی سزای جیهان.

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَمَن يُشَاقِّ اللَّهَ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ ئەو سزایە تووشی ئەوان بووە، ئەوان دژایەتی خودا و نێردراوی خوایان ئەکرد، دوایی هەرکەسێ دژایەتی خودا بکا، بە ڕاستی خودا سزای زۆر سەختە.

کاتێ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ گەمارۆی قەڵاکانی بەنونەزیری دابوو، دوای شکاندنی پەیمانەکەیان و بوون بە سوێندخواری بت پەرستان لە دژی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، گەمارۆکەی درێژەی کێشا و، فەرمانی‌دا بە بڕینی هەندێ لە دارخورماکانیان، جووەکان زۆریان لاگرانبوو، ووتیان: ئەی موحەمەد: تۆ گومانت ئەبرد پێغەمەری و، ئەتەوێ چاکە بکەی، ئێستا دارخورماکان ئەبڕی! ئەیان سووتێنی، ئەوەیە چاکەکردن؟ پێغەمەر ئاوڕی لێ نەدانەوە، فەرمووی: مـن هیـچ شتێ بە بێ‌فەرمانی خودا ناکەم، لەو بارەوە خودا فەرمووی:

﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَىٰ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ﴾ ئێوەی موسڵمان هیچ دارێ لەو دارخورمانەتان نەبڕیوە، یا ئێوە وازتان نەهێناوە بە پێوە بن، دووایی ئەوانە دەستووری خودا بوون و، لەبەر ئەوەیش بووە ئەو کەسانەی لە سنووری خودا دەرچوون، ڕسوایان ئەکات.

وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ
عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ
وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ
قَدِيرٌ ﴿٦﴾ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ
وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ
دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا
نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾
لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ
يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾

﴿وَمَا أفَاء اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنهُمْ فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ﴾ وە هەرشتێ لە دارایی و لە ماڵی بەنونەزیر جێماوە خوا گێڕاویەتەوە بەسەر نێردراوی خۆیا و، بەخشیویە و، ساماندااران بەشیان نیە لە دارایی و سامانی بەنونەزیر، دوایی ئێوە دەستتان نەگرتووە بە سەر دارایی و سامانی ئەواندا، نە بە سواری چارەوێ و نە بە سواری هوشتر تووشی هیچ ئازار و ماندووبوونێ نەبوون بۆ پەیداکردنیان، ئیتر بۆیە ئێوە بەشتان نادرێ، پێغەمەر خۆی ئەزانێ بە چ کەسێکی ئەدا، بە گوێرەی ڕوونکردنەوەی دەستووری خودا.

﴿وَلَكِنَّ اللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُ عَلَى مَن يَشَاء وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بەلام خودا ترسی پێغەمەری خستە دڵی بەنونەزیرەوە، هەتا خۆیان بدەن بە دەست پێغەمەرەوە بە بێ جەنگ کردن لەگەڵیان، بەبێ جەنگ خودا نێردراوی خۆی سەرئەخا بەسەر هەر کەسێکا ئارەزۆی بکا و، خودا توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە.

بۆ زانین: خودای مەزن باسی (الفيء) و (الغنيمة)ی کردووە، جیاوازییان بەم جۆرەیە:

١- (الفئي) بریتییە لەو سامانەی بەبێ جەنگ پەیدا ئەکرێ لە سامانی بێ باوەڕان: یا بەهۆی دەرچوونیان لە جێگەی خۆیان و بەجێ ئەهێڵن بۆ موسڵمانان، هەروەها وەك سەرانە و (١٠) یەکی سوودی بازرگانی و، پاش ماوەی ئەو کەسەی لە ئایین وەرئەگەڕێ یا کەسێ

ئەمرێ و میراتبەری نی‌یە، سامانی تری وایە بێ جەنگ پەیدابێ. ئەم بەشانە بە تایبەتی بۆ پێغەمەرە. خۆی ئەزانێ چۆن بەشی ئەکا، بەو جۆرەی حودا لە ئایەتی (٧-٨) ئەم سوورەتە باسی بەش کردنیان ئەکرێ.

٢- (الغنیمە) ئەو شتانەیە موسڵمانان لە بێباوەڕانی داگیر ئەکەن بەهۆی جەنگ و پەلاماردانیان، ئەو شتە ئەکری بە پێنج کەرتەوە: چوار بەشی ئەدرێ بە جەنگاوەران. هەریەکە لە سوارەکان دووبەشن و، پیادەکان یەك بەش ئەدرێ. بەشێ تر لەو پێنج بەشانە ئەخرێتە گەنجینەوە. وەك رفەئی بەش ئەکری لەسورەتی (ئەلئەحقافدا) بە درێژی باسی هەردوولایان کراوە.

﴿مَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ﴾ شتێ خودا ئەیگێڕێتەوە بەسەر ئێوە و بە ئێوەی ئەبەخشێ لە دارایی دانیشتووانی بێباوەڕانی ئەو گوند و شارانە بەبێ جەنگ ئەگیرێن، دوایی ئەدرێ بە خودا و بە نێردراوی خودا و بە خزمانی پێغەمەر لە بەنو هاشم و بەنوموتەلیب و، ئەدرێ بە هەتیوان و بە هەژاران و بە ڕێبواران. یانێ ئەو سامانەیان ئەکرێ بە پێنج بەشەوە: بەشێکیان ئەدرێ بە خودا و بە پێغەمەر و، بەکارئەهێنرێ لە سوودی گشتی‌دا، وەك دروستکردنی مزگەوت و پرد و نەخۆشخانە و خزمەتی کەعبە و موچەی قازی و زاناکان و گڕینی چەك و شتی تر. بەشی تریان ئەدرێ بە خزماتی پێغەمەر، بە بێ جیاوازی لە نێوان نێر و مێ‌دا. بەشێ تریان ئەدرێ بە هەتیوان بەبێ جیاوازی بەشێ تری ئەدرێ بە هەژاران. بەشێ تر ئەدرێ بە ڕێبواران دەستیان ناگاتە دارایی خۆیان.

﴿كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنكُمْ﴾ ئەو فەیئەیە کە بەشی هەژاران و ئەو تاقمانەی پێشوون، لەبەر ئەوەی ئەو سامانە بە تەنها نەبێ بەشی نێوان ساماندار و سەرۆکەکانی ئێوە و هەژاران بێبەش بکرێن.

ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەستوورێکی خودایی‌یە، چاودێری سوودی گشتی ئەکا بە بێ جیاوازی، پێویستی ئادەمیزاد پێویستە جێ‌بەجێ نەکرێ لەسەر زیانی لایەنێك و سوودی لایەنێکی تر. کەواتە هەموویان لای یاسای ئیسلام یەکسانە. ئەو مەبەستە لەو ئایەتەوە باشتر ڕوون ئەبێتەوە کە ئەو دارایی‌یە بە تەنها سامانداران دەستی بەسەردا نەگرن و، لە نێوان خۆیانا ئەم دیو ئەودیوی پێ بکەن و، هەژاران بێ‌بەش بن لێرەدا هەرچەندە سامانداران بێبەش کراون. بەڵام دادپەروەری و یەکسانی چاودێری کراون هەتا هەژارانیش بگەنە پلەی سامانداران و، وەك یەکیان لێ‌بێ لە دەرامەتتدا، یا لەوانەوە نزیك ببنەوە و، هەست بە کەم و کوڕی خۆیان نەکەن.

﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ وە هەرشتێ نێردراوی خودا فەرمانی پێ ئەدا و، هەرشتێ ئەو بە ئێوەی ئەبەخشێ لە دارایی، دوایی ئێوە بە خۆشی و دادپەروەری بگرن و پەیڕەوی بکەن و، ئەو شتەی نێردراوی خودا قەدەغەی ئەکا ئێوە وازی لێبهێنن و بێ فەرمانی نێردراوی خودا مەکەن و لە خودا بترسن. بە ڕاستی سزای خودا زۆر سەختە بۆ کەسێ بێفەرمانی خودا و نێردراوی خودا بکا. لە پاشانا خودا ڕوونی ئەکاتەوە کە مەبەست لە خزمەکان و هەژاران و ڕێبواران چ کەسانێکن و ئەفەرموێ:

﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ﴾ بۆ ئەو هەژارانەی کۆچیان کردووە لە مەکەوە بۆلای مەدینە لە خزمەت پێغەمەردا، بە زۆر دەرکراون لە جێگەی خۆیانا و لە دارایی خۆیان بێبەش کراون، جگە لە خودا و لە نێردراوی خودا، کەسی تریان نییە بەخێویان بکات.

﴿يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ﴾ ئەو هەژارە دەرکراوانە داوای خواردەمەنی پاداشت و ڕەزامەندی لە خودا ئەکەن و، یارمەتی ئایینی خودا و نێردراوی خودا ئەدەن، ئەو کەسانە ڕاست ئەکەن لە باوەڕهێنانا.

وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلۡإِيمَٰنَ مِن قَبۡلِهِمۡ
يُحِبُّونَ مَنۡ هَاجَرَ إِلَيۡهِمۡ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمۡ حَاجَةٗ
مِّمَّآ أُوتُواْ وَيُؤۡثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ وَلَوۡ كَانَ بِهِمۡ خَصَاصَةٞۚ
وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٩﴾
وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا
وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا
غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾ ۞ أَلَمۡ تَرَ إِلَى
ٱلَّذِينَ نَافَقُواْ يَقُولُونَ لِإِخۡوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ
ٱلۡكِتَٰبِ لَئِنۡ أُخۡرِجۡتُمۡ لَنَخۡرُجَنَّ مَعَكُمۡ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمۡ
أَحَدًا أَبَدٗا وَإِن قُوتِلۡتُمۡ لَنَنصُرَنَّكُمۡ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ
﴿١١﴾ لَئِنۡ أُخۡرِجُواْ لَا يَخۡرُجُونَ مَعَهُمۡ وَلَئِن قُوتِلُواْ لَا يَنصُرُونَهُمۡ

وَلَئِن نَّصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ ٱلْأَدْبَٰرَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٢﴾
لَأَنتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِى صُدُورِهِم مِّنَ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ
لَّا يَفْقَهُونَ ﴿١٣﴾ لَا يُقَٰتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِى قُرًى
مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَآءِ جُدُرٍۭ ۚ بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ ۚ تَحْسَبُهُمْ
جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴿١٤﴾
كَمَثَلِ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ قَرِيبًا ۖ ذَاقُوا۟ وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ
أَلِيمٌ ﴿١٥﴾

لە پاش ئەوەی خودا باسی کۆچکەرانی کرد باسی ئەو کەسانەیش ئەکات دانیشتووی شاری مەدینەن چاکەیان باس ئەکا و ئەفەرموێ:

﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّؤُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ یاریدەی پێغەمـەریان داوە و، لە مەدینە دانیشتوون و کردوویانە بە نیشتمانی خۆیان و بە نیازی پاکەوە باوەڕیـان هێنـاوە لـە پێش ئەوەی موسڵمانان کۆچ بکەن لە مەکەوە بۆلایان و بۆلای مەدینە.

﴿يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْـهِمْ وَلَـا يَجِـدُونَ فِـي صُدُورِهِـمْ حَـاجَةً مِّمَّـا أُوتُـوا﴾ ئـەو کەسـانەی دانیشتووی مەدینەن ئەو کەسانەیان خـۆش ئـەوێ کۆچیـان کـردووە لـە مەکـەوە بۆلایـان و، دەستیان ناکەوی لە دڵی خۆیانا ڕق و دڵ پیسی لە بۆ ئەو شتەی بەخشراوە بە کۆچکەران لـەو دارایی‌یەی بەجی‌ماوە لە بی‌باوەڕان یا لێیان ئەگیرێ.

﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾ وە یاریدەدەران کۆچکەران لە پێش خۆیان ئەخەن لە دارایی و لە جێگەدا و ڕێزیان ئەدەن بەسەر خۆیانـا و، بـاوەکو زۆریـش هـەژاربن و پێویستی‌یان بە دارایی هەبێ.

﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ وە هەر کەسێ دەروونی خـۆی بپـارێزێ لـە ڕژدی و لە ئاواتی دواڕۆژی پوچی جیهان، دوایی ئەو کەسانە سەرئەکەون لە جیهاندا و باسیان ئەکرێ بە چاکە و لە پاشەڕۆژ و پاداشتی چاکیان ئەدرێتێ و ئەچنە بەهەشت.

﴿وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِـن بَعْدِهِـمْ يَقُولُـونَ رَبَّنَـا اغْفِـرْ لَنَـا وَلِإِخْوَانِنَـا الَّذِيـنَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَـانِ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ لە دوای کۆچی دووایی پێغەمەر و کۆچکەران و یاریدەدەرانەوە دێن چـین بـە چین هەتا ڕۆژی دوایی ئەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە: تۆ لە ئێمە و لەو برایانـەی ئێمـە پێـش ئێمە کەوتوون بە باوەڕهێنان خۆشببە.

﴿وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ و تۆ ئەی پەروەردگار دامەنێ لە دڵی ئێمەدا ڕق و دڵ پیسی بۆ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە، ئەی پەروەردگاری ئێمە. بە ڕاستی تۆ خاوەنی بەزەیی زۆری و میهرەبانیت بێ ئەندازەیە.

لەو ئایەتەوە بۆمان ڕوون ئەبێتەوە: ئەو کەسانەی لە دڵیانا ڕق و کینە هەبێ بۆ هاوڕێکانی پێغەمەر، گفتوگۆی ناشایستە بەوان بڵێ و، داوای لێبوردنیان بۆ نەکا نابنە جێگەی بەزەیی و میهرەبانی خودا، هەروەها هەموو چینێ بۆ چینی پێشووی خۆی. نەك وەکو ئێستا کۆمەڵێ پەیدابوون بە ناوی ئیسلامەوە ئەڵێن: ئێمە خزمەتی گەشەپێدان و جووڵانەوە و برایەتی و بزووتنەوەی ئیسلام ئەکەین، کەچی کار و گفتوگۆی ناشایستە ئاراستەی هاوڕێکانی پێغەمەر و پێشەوانی پێشوو ئەکەن بە تایبەتی مالیك و نوعمان و ئەحمەد و شافیعی. هەروەها بۆمان ڕوون ئەبێتەوە: پەیڕەوانی پێغەمەر ئەکرێن بە سێ بەشەوە لە پلەوپایەدا: یەکەم کۆچکەران، دووەم یاردەدەرانی ئایینی خودا و نێردراوی‌خودا. سێ‌هەمیان ئەو کەسانەی دوای ئەوان دێن: کات لە دوای کات پێشووەکانیان پلەوپایەیان گەورەترە لە دوواکەوتووەکان.

﴿أَلَمْ تَر إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ﴾ ئایا تۆ نەتڕوانیوە بۆلای کەسانێکی ئەوتۆ دووڕوون، بەو برایانەی ئەوتۆی خۆیان ئەڵێن باوەڕیان نەهێناوەلە خاوەن نامەکان، بە تایبتی بە بەنونەزیر:

﴿لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا﴾ بە ڕاستی ئەگەر ئێوە دەربکرێن لە جێگەی خۆتانا لە لایەن موحەمەدەوە، بە ڕاستی ئێمەیش لەگەڵ ئێوە دێینە دەرەوە و، ئێمە پەیڕەوی هیچ کەسێ ناکەین جەنگ لەگەڵ ئێوە بکا هەرگیز و، بیەوێ ئێوە ڕسوا بکا.

﴿وَإِن قُوتِلْتُمْ لَنَنصُرَنَّكُمْ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ وە ئەگەر ئێوە جەنگتان لەگەڵ کرا، بە ڕاستی یارمەتی ئێوە ئەدەین لە دژی موسڵمان و موحەممەد و، خودا شایەتی ئەدا: بە ڕاستی ئەو دوو ڕووانە درۆ ئەکەن، لەوەی ئەیڵێن و، لە یارمەتی ئەوان و دەریش ناچن لەگەڵیانا وەك خودای مەزن ئەفەرموێ:

﴿لَئِنْ أُخْرِجُوا لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ وَلَئِن قُوتِلُوا لَا يَنصُرُونَهُمْ﴾ بە ڕاستی ئەگەر بەنونەزیر دەربکرێن دووڕووەکان لەگەڵیانا ناڕۆنە دەرەوە، ئەگەر جووەکان جەنگی‌یان لەگەڵ بکرێ و دووڕووەکان یارمەتی جووەکان نادەن، هەروایش بوو جووەکان دەریشکران و دووڕووەکان لەگەڵیان نەچوونە دەرەوە.

﴿وَلَئِن نَّصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ﴾ وە بە ڕاستی ئەگەر دووڕووەکان یارمەتی جووەکانیان بدایە، دووڕووەکان ئەشکان و بەرەودوا ڕایان ئەکرد، لە پاشان دووڕووەکان یارمەتی‌یان نەئەدا و، خودا لە ناوی ئەبردن و، دووڕوویەکەیان سوودی بەوان نەئەبەخشی، چونکە بێباوەڕی‌یان ئاشکرا ئەبێ:

﴿لَأَنتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِي صُدُورِهِم مِّنَ اللَّهِ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ﴾ بە ڕاستی جووەکانی بەنونەزیر و دووڕووەکان زۆرتر لە دڵیانەوە لە ئێوە ئەترسن لە خودای مەزن. چونکە چاوەڕوانی ئەوە ئەکەن سزای ئێوەیان توش ببی. بەڵام چاوەڕوان نین لە ڕۆژی دواییدا توشی سزای خودا بن، چونکە باوەڕیان بە خودا نییە و، ئەو ترسە زۆرەی ئەوان لە ئێوە لەبەر ئەوەیە ئەندازەی گەورەیی خودا نازانن.

﴿لَا يُقَاتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرًى مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَاء جُدُرٍ﴾ خودا ئەزانێ جووەکان و دووڕووەکان هەموویان توانای ئەوەیان نییە ڕووبەڕووی جەنگ لەگەڵ ئێوەی موسڵمان بکەن مەگەر لە ناو قەڵا سەختەکاندا، یا لە پشتی دیوارەکانەوە، بێگومان ئەو جۆرە کارانە پیشەی ئەو کەسانەیە ترسنۆکن و هورەیان ڕووخابێ.

﴿بَأْسُهُمْ بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّى ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ﴾ ئەو جووانە و ئەو دووڕووانە، ئازایی و توانایان هەر لە ناو خۆیاندایە و بۆ یەکتری ئازان. ئەگەر جەنگ لەگەڵ ئێوە بکەن، ئەو ئازایی و هەڵمەتەیان نامێنێ و، لە پشتی دیوار و لە ناو قەڵا سەختەکانەوە جەنگتان لەگەڵ ئەکەن، شێرن بۆ یەکتری ڕێوین بەرانبەر بە ئێوە، تۆ گومان ئەبەیتە ئەوان لەسەر دۆستایەتییە لە ناو یەکتریدا کۆبوونەتەوە، دڵیان پەراگەندە و جیاوازە بۆ یەکتری، چونکە بیروباوەڕ و مەبەستیان جیاوازە، ئەو دژایەتی و دڵپیسییەی ئەوان لەبەر ئەوەیە سوود و زیانی خۆیان نازانن.

﴿كَمَثَلِ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ قَرِيبًا ذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ وێنەی جووەکانی بەنونەزیر لە دوژمنایەتییان بۆ موحەمەد و، تۆڵەسەندنەوە لەوان بە وێنەی کەسانێکی ئەوتۆبوون لە پێش ئەوانەوەبوون، وێنەی بێباوەڕانی قورەیش، جەنگیان لەگەڵ موحەمەد کرد بەم نزیکە و، لە ڕۆژی بەدردا و، دوایی خراپەی بێباوەڕی خۆیان چێشتووە، بۆ ئەوان هەیە سزایەکی ئازاردەر لە ڕۆژی دواییدا.

كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَٰنِ ٱكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ
قَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾
فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِى ٱلنَّارِ خَٰلِدَيْنِ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟
ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْتَنظُرْ
نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ

﴿وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿١٨﴾ لَا يَسْتَوِىٓ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۚ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾

دووڕووەکان ووتیان بە بەنونەزیرەکان: ئێوە جەنگ بکەن لەگەڵ موحەممەد و، ئێمە لەگەڵ ئێوەین لە جەنگ کردن و دەرکردنتانا، کاتێ جووەکان تووشی ڕسوایی بوون، دووڕووەکان خۆیان شاردەوە لە هێلانەکانیانا نە بە چاو ئەبینران و نە شوێنەوەریان دیاربوو، خودای مەزن بەو بۆنەیەوە ئەفەرموێ:

﴿كَمَثَلِ الشَّيْطَانِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَانِ اكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِّنكَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾ ئەو دووڕووانە لە هاندانیان بۆ جووەکان کە یاخی ببن لە موحەممەد، بە وێنەی شەیتانن، کاتێ ئەڵێ بە ئادەمیزاد: تۆ بێباوەڕ ببە بە خودا، دوای ئەوەی بێباوەڕبوو بە خودا شەیتان ئەڵێ: بە ڕاستی من بێزارم لە تۆ. بە ڕاستی من لە خودای پەروەردگاری هەموو بوونەوەران ئەترسم.

﴿فَكَانَ عَاقِبَتَهُمَا أَنَّهُمَا فِي النَّارِ خَالِدَيْنِ فِيهَا وَذَلِكَ جَزَاءُ الظَّالِمِينَ﴾ دوایی پاداشتی شەیتان و ئەو ئادەمیزدە بە ڕاستی لە ناو ئاگری دۆزەخدان، بەردەوامن لە ناو ئەو ئاگرەدا. ئەو سزایە بەردەوامە پاداشتی ئەو کەسانەیە ستەم لە خۆیان ئەکەن.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: ئێوە لە خودا بترسن و بێفەرمانی خودا مەکەن، لەبەر ئەوەی خۆتان بپارێزن لە سزای خودا و، با هەموو کەسێ تەماشای شتێ بکا و لە پێشەوە کردوویەتی: ئایا چاکە ڕزگاری بکا، یا خراپە تووشی سزای بکا بەیانی کە ڕۆژی دوواییە، چونکە نزیکە هاتنی و، ئێوە لە خودا بترسن و خۆتان لە بێفەرمانی خودا بپارێزن. بە ڕاستی خودا ئاگادارە بە شتێ ئێوە ئەیکەن.

﴿وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّهَ فَأَنسَاهُمْ أَنفُسَهُمْ أُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ وە ئێوەی باوەڕدار وێنەی کەسانێکی ئەوتۆ مەبن وازیان لە یادی خودا و فەرموودەی خودا هێناوە، دوایی خودا پێویستی ئەوان لە بیری خۆیان باتەوە و، کاری چاك بۆ خۆیان نەکەن، ئەو کەسانە ئەوانەن لایانداوە لە پەرستنی خودا.

﴿لَا يَسْتَوِي أَصْحَابُ النَّارِ وَأَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمُ الْفَائِزُونَ﴾ دانیشتووان و یارانی ئاگری دۆزەخ و، دانیشتووانی بەهەشت وێنەی یەك نین، چونکە دانیشتووانی ئاگر ڕیسوا

ئەبن، دانیشتووانی بەهەشت شادمانن هەریەکەیان بە گوێرەی کرداری خۆیـان و، دانیشـتووانی بەهەشت هەر ئەوان ڕزگاریان ئەبێ لـە سزای ئاگر و بە ئاواتی خۆیان ئەگەن و بەرخوردارن لـە پاشەڕۆژدا.

دووایی خودای مەزن کاریگەری زۆری قورئانی پیرۆزی ڕوون کردەوە، بەو هەموو مژدە و هەڕەشەی لـە ناویاندایە و، بە هاندان و بە ترساندن و، بە ئامۆژگاری ئایەتە ئاشکراکانی قورئـان و، ئەوانە هەموو نەخشەی ڕێگـەی چـاك و خراپـی بـۆ ئـادەمیزاد کێشـا و، ڕێگـەی ڕانومـایی گومڕایی ڕوون کردەوە، ئەوانە هەموویان بۆ ئەوەبوو کەسانێکی ئەوتۆ بترسێنێ دڵیـان ڕەقـە و ڕووناکی قورئان وەرناگرن و فەرموودەی خودا نایان ترسـێنێ ئـەوەندە دڵیـان ڕەقـە، ئەوانـەی باسکران ئەگەر ڕووی پێبکرێ بۆلای کێوێ بە هەموو ڕەقـی و سـەختییە هەیـەتی، ترسـی لێ پەیدا ئەبێ و، فەرموودەی خودا بەجێ ئەهێنێ و لـە ترسی خودا پارچـە پارچـە ئـەبێ و، دوایـی ئادەمیزاد بەو لاوازی‌یەوە کە هەیەتی، بە جۆرێ تۆ ئەیبینی مێشوولـە ئازاری ئەدا و، کۆکەڕەشە ئەیکوژێ و، ئارەقی لـەشی بۆگەن و قێزەونی ئەکات، کەچی فەرموودەی قورئان کاری تێناکا، لـەو بارەوە خودا فەرمووی:

لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا
الْقُرْآنَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ
اللَّهِ ۚ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ
﴿٢١﴾ هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ ۖ
هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ
الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلَامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ
الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ
﴿٢٣﴾ هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ ۖ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ ۚ
يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٢٤﴾

﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ﴾ ئەگـەر ئێمـە ئـەو قورئانەمان ڕەوانە بکردایەتە خوارەوە بۆ سەر کێوێ، بەو ڕەقی و سەختی‌یەوە هەیەتی، بە ڕاستی تۆ ئەو کێوە ئەبینی ئەترسێ و نەرم ئەبێ و پارچە پارچە ئەبێ لـە ترسی خودا ئەکەوێتە خوارەوە.

دوایی بۆ ئەبێ ئادەمیزاد بەو بێ نرخییە هەیە سەر بۆ فەرموودەکانی خودا شۆڕ نەکا و نەبیسێ؟ ئایا لەبەر ئەوەیە خۆی بە ڕەقتر و سەختتر ئەزانێ. یا لەبەر ئەوەیە زۆر نەزان و بێباوەڕ و گومڕایە؟ بێگومان لەبەر بێ ئەقڵی و بێباوەڕیەتی بە خودای مەزن و خاوەن توانا.

﴿وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ وە ئێمە ئەو وێنانە ڕوون ئەکەینەوە بۆ ئادەمیزاد. بۆ ئەوەی ئەوان بیربکەنەوە لە فەرموودەکانی خودا و لە ناوەڕۆك و مەبەستی ئەو وێنە لێ دانانە. هەتا سوودییان لێ وەربگرن و، ئەقڵی خۆیان بخەنە کارەوە، بۆ دۆزینەوەی کاری چاك و خراپ.

دوای ئەوەی خودای مەزن ڕێزی قورئانی ڕوون کردەوە، باسی ڕوونکردنەوەی گەورەیی خۆی ئەکا کە ئەو قورئانە فەرموودەی خودایەکە، خاوەنی چەند شتێکە جگەی خودای مەزن ئەو شتانەی نییە و، ناتوانێ بڕیاری ئەو شتانە بدا بۆ خۆی و، نەبووە و نایشبێ و، ئەفەرموێ:

﴿هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ﴾ خودا کەسێکی ئەوتۆیە، هیچ خودایە نییە شایانی پەرستنبێ و، خاوەنی چەن شتێکە جگەی خودا کەسی تر نییەتی، وەك ئەم سێزدە شتانە:

١- ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾ خودایەکی ئەوتۆیە ئەزانێ بە هەموو شتێکی نهێنی و لەبەر چاو نییە، بە هەموو شتێ ئەبینرێن لە لایەن ئادەمیزادەوە.

٢- ﴿هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ﴾ خودا کەسێکی ئەوتۆیە، بەخشندەیی ئەو هەموو بوونەوەرانە ئەگرێتەوە، باوەڕدار بن یا بێباوەڕ، ئادەمیزادبن یا جگەی ئادەمیزاد، جگەی خودا کەسێ ناونەبراوە بە (الرحمان)، بەزەیی و میهرەبانی زۆرە بۆ باوەڕداران بە تەنها لە ڕۆژی دواییدا.

٣- ﴿هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ﴾ خودایەکی ئەوتۆیە هیچ کەسێ نییە، شایانی پەرستنبێ جگەی ئەو، تەنهایە، بێهاوبەش و بێ وێنەیە.

٤- ﴿الْمَلِكُ﴾ پادشا و خاوەنی هەموو بوونەوەرانە، خاوەنی زیندووکردنە و خاوەنی مردنی هەموو گیاندارانە. پەنای هەموو کەس ئەدا و، هیچ کەسێ پەنای ئەو نادا.

٥- ﴿الْقُدُّوسُ﴾ خودایەکی ئەوتۆ پاك و دوورە لە هەموو شتێ شایستەی گەورەیی ئەو نەبێ، پەستی و خراپی ڕووی تێناکا.

٦- ﴿السَّلَامُ﴾ خودایەکی ئەوتۆیە، خۆشی و بێوەیی و ئاسایش ئەبەخشێ بە گیانداران و، ترسیان لێ دوور ئەخاتەوە.

٧- ﴿الْمُؤْمِنُ﴾ خودایەکی ئەوتۆیە دۆستانی خۆی لە ستەم و لە ترس و سزا ئەپارێزێ و، دڵنیایان ئەکات.

٨- ﴿الْمُهَيْمِنُ﴾ خودایەکی ئەوتۆیە ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکا و، ئەیانپارێزێ، دادپەروەرە بۆیان.

٩- ﴿الْعَزِيزُ﴾ خودایەکی ئەوتۆیە بەهێز و بە توانا و بە دەستەلاتە، هیچ کەسێ ناتوانێ رێگە بە فەرمانەکانی بگرێ و، زیانی توش بکات.

١٠- ﴿الْجَبَّارُ﴾ خودایەکی ئەوتۆیە پلەوپایەی بەرزترە لە هەموو کەسێ و، بالادەستی نی‌یە و، خاوەنی گەورەیی‌یەکی ئەوتۆیە جگەی خۆی سەرشۆڕی ئەون.

١١- ﴿الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ خودایەکی ئەوتۆیە بێ ئەندازەیە لە گەورەیی‌دا، دوورە لە شتێ شایانی گەورەیی ئەو نەبێ، خودایەکە پاکە لەو شتانەی بت پەرستان باسی ئەکەن.

١٢- ﴿هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ﴾ ئەو خودایە خودایەکی ئەوتۆیە درووستکەری هەموو بوونەوەرانە و، شێوازی هەندێکیان لە هەندێ تریان جوێ ئەکاتەوە.

١٣- ﴿الْمُصَوِّرُ﴾ خودایەکی ئەوتۆیە نەخشەکێشی هەموو گیاندارانە و، پێکیانەوە ئەنێ لە منالدانی دایکیان پلەپلە و، بە جۆرێکی جیاواز.

﴿لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ هەر بۆ خودایە چەند ناوێ بەلگەن لەسەر شیرینی ماناکانیان، شتێ لە ئاسمانەکان و زەوی‌دان پاکی و دووری دەرئەبڕن بۆ خودا لە شتێ شایستەی گەورەیی خودا نەبێ، هەر یەکەیان بە زمانی تایبەتی خۆیان.

نووسراوێکم پێ نییە، عەلی شمشێرەکەی دەرکێشا لە کێلان و ترساندی، ژنەکە لە ناو مووی سەریدا نووسراوەکەی دەرهێنا، کاتێ هاتنەوە خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ پێغەمەر حاتیبی بانگ کرد و فەرمووی: چ شتێ پاڵی پێو نای ئەو کارە بکەی، حاتیب ووتی: ئەی نێردراوی خودا سوێندم بە خودا، بێباوەڕی و گومان بەسەرما نەهاتووە لەو کاتەوە موسڵمان بووم و، لەو کاتەوە خراپیم نەکردووە، دڵم دەربارەی ئیسلام نەگۆڕراوە، بەڵام من مرۆڤێکم بێ پشتیوان لە ناو مەکەدا ویستم چاکەیە بکەم لە بۆ قورەیشییەکان لە بۆ پاراستنی خزمەکانم لە خراپەی ئەوان. عومەری کوڕی خەتاب ووتی: ئەی نێردراوی خودا لێم بگەڕێ با بدەم لە سەری ئەو مرۆڤە دووڕووە، پێغەمەر ووتی: بە ڕاستی ئەو پیاوە جەنگی بەدری بینیوە، خودا بە چاوی میهرەبانییەوە تەماشای جەنگ کەرانی بەدر ئەکات، خودا بەو کەسانەی فەرمووە: من لە ئێوە خۆشبووم چ شتێ ئەکەن بیکەن، خودا لە بارەوە فەرمووی:

## بسم الله الرحمن الرحیم

## بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاء تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: ئێوە دوژمنی خۆتان مەکەن بە دۆست بۆ خۆتان، دۆستایەتی و خۆشەویستی خۆتان بەوان بگەیەنن.

﴿وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءكُم مِّنَ الْحَقِّ يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ﴾وە بە ڕاستی ئەو کەسانە باوەڕیان نەهێناوە بە شتێ هاتووە بۆلای ئێوە لە ڕاستی ئایینی ئیسلام و قورئان، ئەو کەسانەن نێردراوی خودا و ئێوەیان دەرکردووە لە مەکە، لەبەر ئەوەی ئێوە بە خودای پەروەردگاری خۆتان باوەڕتان هێناوە.

﴿إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَادًا فِي سَبِيلِي وَابْتِغَاء مَرْضَاتِي تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ﴾ ئەگەر ئێوە دۆستی منن دوژمنانی من بکەن بە دۆستی خۆتان، ئەگەر ویستتان بچنە دەرەوە لە نیشتمانی خۆتان لەبەر جەنگ کردن لە ڕێگەی ئایینی مندا و لەبەر ڕەزامەندی من بۆ بەرزکردنەوەی ئایینی من و پەرەپێدانی. ئایا ئێوە چۆن بە نهێنی دۆستایەتی خۆتان ئەگەیەنن بە دوژمنانی خودا. گومان ئەبەن خودا بە نهێنی ئێوە نازانێ؟

﴿وَأَنَا أَعْلَمُ بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنتُمْ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاء السَّبِيلِ﴾ وە من زاناترم لە هەموو کەسێ بە شتێ ئێوە پەنهانی ئەدەن و بە شتێ ئێوە ئاشکرای ئەکەن و، هەر کەسێ لە ئێوە ئەو نهێنییە بگەیەنێ بە دوژمنانی من، دوایی ئەو کەسە بە ڕاستی لایداوە لە ڕێگەی خودا.

# ﴿ سورەتی ئەلموتەحین ﴾

لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەكانی (١٣) ئایەتن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ تُلۡقُونَ
إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَقَدۡ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلۡحَقِّ يُخۡرِجُونَ ٱلرَّسُولَ
وَإِيَّاكُمۡ أَن تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمۡ إِن كُنتُمۡ خَرَجۡتُمۡ جِهَٰدٗا فِي سَبِيلِي
وَٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِيۚ تُسِرُّونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعۡلَمُ بِمَآ أَخۡفَيۡتُمۡ
وَمَآ أَعۡلَنتُمۡۚ وَمَن يَفۡعَلۡهُ مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١﴾ إِن
يَثۡقَفُوكُمۡ يَكُونُواْ لَكُمۡ أَعۡدَآءٗ وَيَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ وَأَلۡسِنَتَهُم
بِٱلسُّوٓءِ وَوَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ ﴿٢﴾ لَن تَنفَعَكُمۡ أَرۡحَامُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡۚ
يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَفۡصِلُ بَيۡنَكُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿٣﴾

كاتێ پێغەمەری خودا ویستی خۆی ڕێك بخا بۆ داگیركردنی شاری مەكە، یەكێ لە هاوڕێكانی پێغەمەر بە ناوی حاتیب كوڕی ئەبی بەلقەعە كە یەكێ بوو لە كۆچكەران و، زۆر بە باشی و بە كردەوەی ئازایانە لە ڕۆژی بەدردا تاقی كرابووەوە، خاوەنی باوەڕێكی بە تین بوو، خزم و منالەكانی لە مەكە بەجێ هێشتبوو، كە زانی بە مەبەستی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، ویستی چاكەیە بكا لەگەڵ بێباوەڕانی مەكە، بۆ ئەوەی خزم و منالەكانی بپارێزێ لە ئازاری بێباوەڕان، نەوەك بەهۆی ئەمەوە ئازاریان بدەن، بۆیە نامەیەكی نووسی بۆیان و، دای بە ژنێ ئەیەویست بچێ بۆ مەكە و، (١٠) دیناریشی پێدابوو، لە نامەكەیدا نووسیبووی بۆیان: نێردراوی خودا ئەیەوێ بێت بۆ مەكە و داگیری بكات ئاگاتان لە خۆتانبێ، دوایی خودا سروشی ناردە خوارەوە، بەو كارەی (حاتیب) كردبووی، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ عەلی كوڕی ئەبوتالیب و چەن كەسێ تری نارد و فەرمووی: بچن بۆ فلان جێگە تووشی ژنی ئەبن ئەچێ بۆ مەكە، نوسراوێكی لایە لێی بسێنن و بەرەڵای بكەن، ئەگەر نەیدانێ بدەن لە گەردنی، ئەوان چوون و لەو جێگەیەدا پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ دیاریكردبوو، بەو ژنە گەیشتن و، ژنەكە ووتی: هیچ

﴿إِن يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاءً﴾ ئەگەر بێباوەڕان ئێوەیان دەستبکەوێ ووبتان ببینن ئەوان ئەبن بە دوژمنی ئێوە و، ئازارتان ئەدەن و دیلتان ئەکەن. کەواتە ناردنی دۆستایەتی بۆلای ئەوان هیچ سودێ ناگەیەنێ.

﴿وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم بِالسُّوءِ وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ﴾ وە ئەو بێباوەڕانە دەستی خۆیان و زمانی خۆیان بە ئازارەوە درێژ ئەکەن بۆلای ئێوە و، ئاواتەخوازن ئێوە لە ئایینی ئیسلامەوە وەرگەڕێن.

﴿لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ خزم و منداڵەکانتان ئەوانەی ئەوتۆیان بەردەوامن لەسەر بێباوەڕی و، لە مەکە بەجێماون لە ڕۆژی دوایی هیچ سودێ بە ئێوە نابەخشن، خودا ئێوە و ئەوان لە یەك جوێ ئەکاتەوە، هەندێکیان لە دەستی هەندێکیان ڕائەکەن، ئێوە بۆلای بەهەشت و، منداڵە بێباوەڕەکانتان بۆلای دۆزەخ و، خودا ئاگادارە بە شتێ ئێوە ئەیکەن و ئاگادارە بەشتی نایکەن .

قَدْ
كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ
إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا
وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ إِلَّا
قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن شَيْءٍ
رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ﴿٤﴾ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا
فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا وَاغْفِرْ لَنَا رَبَّنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٥﴾
لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ
وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ ﴿٦﴾ عَسَى اللَّهُ أَن يَجْعَلَ
بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ الَّذِينَ عَادَيْتُم مِّنْهُم مَّوَدَّةً وَاللَّهُ قَدِيرٌ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ
﴿٧﴾

خودای مەزن داوا لە موسڵمانان ئەکا چاو لە ئیبراهیم و تاقمەکەی ئیبراهیم بکەن لە بارەی دۆستایەتی لەگەڵ بێباوەڕان و، ئەوان بکەن بە چاولێکراوی خۆیان، هەروك ئەوان وازیان هێنا

لە بـاوك و خزمایـەتی خۆیـان کـە بێبـاوەڕبوون، ئێـوەی موسـڵمانیش چـاو لـەوان بکـەن و دۆستایەتی لـەگەڵ خزم و منالّی بێباوەڕی خۆتان مەکـەن و، وازیـان لێ بـهێنن و، لـەو بـارەوە خودا ئەفەرموێ:

﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ﴾ بەڕاستی بۆ ئێوەی موسڵمان هەیە لـە هێزی باوەڕهێنانی ئیبراهیم و کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیـان هێنـابوو لـەگـەڵ ئیبراهیمدا پێشـەوایی چاولێکردنێکی شیرین، ئـەوانیش وەك ئێـوە نیشـتمانی خۆیانیـان بـەجی هێشـت و وازیـان لـە خزمایەتی خۆیان هێنا. کەواتە ئێوەیش بە وێنەی ئەوان دۆسـایەتی بێبـاوەڕان مەکـەن و ئـەوان چۆنبوون، ئێوەیش وابن.

﴿إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءاوا مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ﴾ کاتـێ ئیـبراهیم و ئەو کەسانەی لـەگەڵیابوون بە خزمە بت پەرستەکانی خۆیانیان ووت: بە ڕاستی ئێمە لـە ئێـوە و شتێ ئێوە ئەیپەرستن لـەجگەی خودا بێزارین. باوەڕمان بە ئایینی ئێوە و خوداکانی ئێوە نی‌یە.

﴿وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاء أَبَدًا حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْـدَهُ﴾ وە دوژمنایـەتی و ڕق و خۆشنەویستی نێوان ئێمە و نێوان ئێوە ئاشکرابووە بە بەردەوامی هەتا ئێوە باوەڕ بە خودا ئەهێنن بە تەنها و واز لـە بت پەرستی ئەهێنن.

﴿إِلَّا قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ﴾ بۆ ئێوەی موسڵمان هەیە چاو لـە ئیـبراهیم بکـەن لـە هەموو کارێکیدا مەگەر لـە گفتوگۆی ئیبراهیمـا نـەبێ ووتـی بـە بـاوکی: بەڕاسـتی مـن داوای لێخۆشبوون ئەکـەم بـۆ تـۆ لـە خـودا، لـەو داواکاری‌یـەدا چـاوی لێمەکـەن و، ئێـوە داوای لێخۆشبوون بۆ بت پەرستان مەکەن، ئەو داوای ئیبراهیمەش لەبەر ئـەوەبوو بـەڵێنی دابـوو بـە باوکی بۆی بپاڕێتەوە لای خودا، ویستی بە بێ بەڵێن دەرنەچێ، کـە زانـی بـاوەڕ ناهێنـێ وازی لێهێنا.

لـە پاشانا خودای مەزن ڕوونی ئەکاتـەوە ئیـبراهیم و تاقمەکـەی بـە چ جـۆرێ وازیـان لـە نیشتمانی خۆیان هێنا و، چۆنیان پەنابرد بۆلای خودا و چ شتێکی‌یان ووت:

﴿وَمَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن شَيْءٍ﴾ وە ئیبراهیم ووتی بە باوکی: مـن هیـچ سـوودێ بـە تـۆ نابەخشم و، ناتوانم سزای خودا لـە تـۆ لادەم ئەگـەر بـەردەوامبی لەسـەر بێفـەرمانی خـودا و هاوبەشی بۆ دابنێی، بۆیە بەڵێنم بۆ دای ئومێدەواربووم موسڵمان ببی.

﴿رَّبَّنَـا عَلَيْـكَ تَوَكَّلْنَـا وَإِلَيْـكَ أَنَبْنَـا وَإِلَيْـكَ الْمَصِيرُ﴾ ئیـبراهیم و تاقمــە باوەڕدارەکــانی لـەگەڵی‌دابوون لـە خودا ئەپاڕانەوە و، ئەیان ووت: ئەی پەروەردگاری ئێمە: ئێمە هەر پشت بە تۆ ئەبەستین و هەموو کارێکمان بە تۆ ئەسپێرین و، هەر بـۆلای تـۆ ئەگەڕێینـەوە، هـەر بـۆلای تۆیش ئەگەڕێینەوە لـە پاشەڕۆژدا.

﴿رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا وَاغْفِرْ لَنَا رَبَّنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ ئەی پەروەردگاری ئێمە تۆ بێباوەڕان زاڵ مەکە بەسەر ئێمەدا و، سزامان مەدە بە دەستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان بە تۆ نەهێناوە و، تۆ لە ئێمە خۆش ببە و، ئەی پەروەردگاری ئێمە. بە ڕاستی تۆ زۆر بە دەسەڵات و گەورەی، هەموو شتێ ئەزانی و هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێی. بۆ زۆرتر هاندانی موسڵمانان و چاوکردنیان لە ئیبراهیم خودا بە موسڵمانان ئەفەرموێ:

﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ﴾ بە ڕاستی بۆ ئێوەی موسڵمان هەیە لە کار و پیشەی ئیبراهیم و تاقمەکەیدا چاولێکردنێکی زۆر شیرین بۆ کەسێ بە ئومێدی پاداشتی خودابێ و، بترسێ لە سزای ڕۆژی دوایی.

﴿وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ و هەرکەسێ واز لە فەرمانی خودا بهێنێ و، دۆستایەتی دوژمنانی خودا بکا و، چاو لە پیاوچاکان نەکا، دوایی بە ڕاستی خودا پێویستی بە درووستکراوانی خۆی نی‌یە. خودا خۆی لە خۆیا شایستەی ئەوەیە سوپاسی بکرێ لە هەموو فەرمانەکانیدا.

﴿عَسَى اللَّهُ أَن يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ الَّذِينَ عَادَيْتُم مِّنْهُم مَّوَدَّةً وَاللَّهُ قَدِيرٌ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئێوە بە ئومێدی ئەوەبن خودا درووست بکا لە نێوان ئێوەی موسڵمان و لە نێوان کەسانێکی ئەوتۆ دوژمنایەتی ئێوەیان کردووە خۆشەویستی و دۆسایەتی و، خودا یارمەتی‌یان بدا بۆلای باوەڕهێنان و خودا زۆر بە توانایە دوژمنایەتی نەیەڵێ لە نێوانتانا، خودا لێخۆشبوونی زۆرە بۆ گوناهبارانی پێشوو، زۆر خاوەنی بەزەیی و میهرەبانی‌یە.

ئەسمای کچی ئەبوبەکر کە دایکی بت پەرست بوو، ئەبوبەکر تەڵاقی‌دابوو، ڕۆژێ دایکی ئەسما ویستی بچێ بۆلای ئەسمای کچی و هەندێ دیاریشی بۆ هێنابوو، ئەسما دیاری‌یەکەی وەرنەگرت و ڕێگەیشی پێ نەدا بچێتە ناو خانووەکەی، بۆ ئەو مەبەستە عائیشەی خوشکی بە باوکی خۆی ووت: پرسیار لە پێغەمەر بکا لەو بارەوە، بۆ ڕوون کردنەوەی وەڵامی ئەو پرسیارە ئەم دوو ئایەتانە هاتنە خوارەوە، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمانی‌دا بە وەرگرتنی دیاری‌یەکە و، چوونی دایکی ئەسمایش بۆلای و پێشوازی لێبکا و خودا فەرموی:

لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم
مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ
﴿٨﴾ إِنَّمَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم

مِّن دِيَٰرِكُمۡ وَظَٰهَرُواْ عَلَىٰٓ إِخۡرَاجِكُمۡ أَن تَوَلَّوۡهُمۡۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩﴾

﴿لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ خـودا قەدەغـەی نـەکردووە لـە ئێوە لـە پـەیوندی کردنتان بە کەسانێکی ئەوتۆ جـەنگیان نـەکردووە لەگـەڵ ئێـوە لـەبارەی ئایینـەوە و ئێوەیـان دەرنەکردووە لـە نیشتمانی خۆتانا، ئیتر لـە دانیشتووانی مەکەبن یا دانیشتووی جێگەیە تربن کـە ئێوە چاکەیان لـەگەڵ بکەن و، دادپەروەبن بۆ ئەوان. بەڕاستی خـودا کەسـانێکی خـۆش ئـەوێ دادپەروەربن.

﴿إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ بە ڕاستی خودا قەدەغەی کـردووە لـە ئێوە پەیوەندی کردن بە کەسانێکی ئەوتۆ جەنگیان لـەگەڵ ئێوە کردووە لـە بـارەی ئایینـەوە و، ئێوەیان دەرکردووە لـە نیشتمانی خۆتانا و یارمەتی ئەوانیان دابێ لـەسەر دەرکردنی ئێوە کە ئێوە دۆستایەتی‌یان لـەگەل بکەن و، یارمەتی‌یان بدەن و هەرکەسێ یارمەتی ئەو کەسانە بـدا، دووایـی هەرکەسێ یارمەتی ئەو بێ‌باوەڕانە بدا ستەمیان لـە خۆیان کردووە و بە دۆستایەتی‌یە.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ فَٱمۡتَحِنُوهُنَّۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّۖ فَإِنۡ عَلِمۡتُمُوهُنَّ مُؤۡمِنَٰتٖ فَلَا تَرۡجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلۡكُفَّارِۖ لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّۖ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّۚ وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ وَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقۡتُمۡ وَلۡيَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْۚ ذَٰلِكُمۡ حُكۡمُ ٱللَّهِ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡۖ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿١٠﴾
وَإِن فَاتَكُمۡ شَيۡءٞ مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ إِلَى ٱلۡكُفَّارِ فَعَاقَبۡتُمۡ فَـَٔاتُواْ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتۡ أَزۡوَٰجُهُم مِّثۡلَ مَآ أَنفَقُواْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ﴿١١﴾

لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئاشتەوایی مۆرکرد لەگەڵ قورەیشی‌یەکان، وەك لە ئایەتی (١٠)ی سورەتی (ئەلفەتح)دا باسی کرا، لەو ئاشتەوایی‌یەدا هاتبوو: (هەرکەسی لەلای قورەیشی‌یەکان هات بۆلای موحەمەد، بیگێڕێتەوە بۆلای قورەیشی‌یەکان، هەرکەسێ لای موحەمەدەوە چوو بۆلای قورەیشی‌یەکان ئەیگێڕنەوە بۆلای موحەممەد، دوای مۆرکردنی ئەو ئاشتەوایی‌یە لە نێوان هەردوولادا، ژنێ لە قورەیشی‌یەکان کۆچی کرد بۆلای نێردراوی خودا، مێردە بت پەرستەکەی بە دوایا هات، ووتی محەممەد ژنەکەمم بدەرەوە، چونکە تۆ مەرجت کردووە هەرکەسێ لە لایەن ئێمەوە هات بیگێڕیتەوە بۆلامان. لەو بارەوە بۆ ڕوونکردنەوەی فەرمانەکانی خودا بۆ ئەو ژنانەی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە، مێردەکانیان بت پەرستن، بۆ ئەو ژنانەی لە ئایینی ئیسلام وەرئەگەڕێن، خودای مەزن ئەم دوو ئایەتانەی ناردەخوارەوە و فەرمووی:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ اللَّـهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: هەرکاتێ ژنانی باوەڕدار کۆچیان کرد بۆلای ئێوە لە مەکەوە بۆ مەدینە، دوایی ئێوە ئەو ژنانە تاقی بکەنەوە، بۆ ئەوەی بزانن ئەو ژنانە بە ڕاستی باوەڕیان هێناوە یا بە دەم نەك بە دڵ، خودا زاناترە بە باوەڕهێنانی ئەوان لە ناوەڕۆکدا.

﴿فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَآتُوهُم مَّا أَنفَقُوا﴾ دوایی ئەگەر ئێوەی موسڵمان زانیتان بە ڕاستی بە دڵ باوەڕیان هێناوە، دوایی ئێوە ئەو ژنانە مەگێڕنەوە بۆلای بێباوەڕان، ئەو ژنانە ڕەوانین بۆ بێباوەڕیان و، ئەو بێباوەڕانەیش بۆ ژنانی باوەڕدار ڕەوانین و، قەدەغەن لە یەکتری و، ئێوە ئەو شتەی مێردەکانیان بەخشیویانە بەو ژنانە لە مارەیی و، ئێوە بیان دەنەوە.

﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ وە هیچ گوناهێ لەسەر ئێوەی موسڵمان نی‌یە کە ئێوە ئەو ژنانەی کۆچیان کردووە لە لایەن بێباوەڕانەوە بۆلای باوەڕداران، ئێوە مارەیان بکەن دوای کۆتایی عیدە، کاتێ ئێو مارەیی بدەن بەو ژنانە باوەڕیان هێناوە و مێردەکانیان بێباوەڕن.

﴿وَلَا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ﴾ وە ئێوەی موسڵمان پەیویست مەبن بە نیکاحی ئەو ژنانەی بێباوەڕن و، پەیوەندی ژن و مێردایەتی لە نێوانتانا نەماوە، چونکە ژن و مێرد بێباوەڕبوون و، دوایی پیاوەکە باوەڕی هێنا و، ژنەکە لەسەر بێباوەڕی مایەوە، ئەو ژنە قەدەغە ئەبێ لەسەر ئەو پیاوە، نیکاحەکەیان پوچ ئەبێتەوە. هەروەها ژنەکەیش بەبێ مێردەکەی موسڵمان ببێ و قەدەغە ئەبن لە یەکتری و، ئەگەر ژن و مێرد هەردوولایان باوەڕداربوون، یەکێکیان لە ئایین وەرگەڕا نیکاحەکەیان پوچ ئەبێتەوە.

﴿وَاسْأَلُوا مَا أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْأَلُوا مَا أَنفَقُوا ذَلِكُمْ حُكْمُ اللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ وە ئێوەی موسڵمان داوای ئەو شتە بکەن بەخشیوتانە بە مارەیی بە ژنەکانتان و، ئێوە موسڵمان بوون و، ئەوان باوەڕیان نەهێناو، بێباوەڕانیش داوای ئەو شتە بکەن بەخشیویانە بە ژنەکانیان و، ژنەکانیان موسڵمان بوون و، ئەوان باوەڕیان نەهێناوە، ئەوەی باسکرا فەرمانی خودایە، فەرمان ئەدا لە نێوان ئێوەدا و، نابێ بێفەرمانی خودا بکەن و، خودا بە هەموو شتێ ئەزانێ، هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ.

﴿وَإِن فَاتَكُمْ شَيْءٌ مِّنْ أَزْوَاجِكُمْ إِلَى الْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ﴾ وە ئەگەر ئێوەی باوەڕدار لە کیستان چووبێ شتێ لە مارەیی ژنە بێباوەڕەکانتان، لەو ژنانەی لە ئێوە هەڵهاتبوون و، چووبوون بۆلای بێباوەڕان و، ئەو شتەی نەدابوو بە مێردە باوەڕدارەکەی، دوایی ئێوە تووشی بێباوەڕان بوون و سەرکەوتن بەسەریاندا، دەستکەوتتان لەوان گرت.

﴿فَآتُوا الَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَاجُهُم مِّثْلَ مَا أَنفَقُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنتُم بِهِ مُؤْمِنُونَ﴾ دوایی ئێوەی موسڵمان ببەخشن بە کەسانێکی ئەوتۆ ژنەکانیان چوون بۆلای بێباوەڕان و و وێنەی شتێ لە مارەیی بەخشویانە لەوان لەو دەستکەوتە گرتووتانە لە بێباوەڕان و، ئێوە لە خودایەکی ئەوتۆ بترسن ئێو باوەڕتان پێ هێناوە.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَوَلَّوْا۟ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ قَدْ يَئِسُوا۟ مِنَ ٱلْءَاخِرَةِ كَمَا يَئِسَ ٱلْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْقُبُورِ ﴿١٣﴾

کاتێ مەکە داگیرکرا پیاوان پۆل پۆل ئەهاتنە خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ و، پەیمانیان ئەدا بە پێغەمەر گوێڕایەڵی فەرمانی خودابن و، دوای ئەوانیش ژنان ئەهاتن و پەیمانیان دا بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بە گوێرەی ئەو فەرمانانەی خودا ئەیفەرموێ لەبارەی ژنانەوە کە ئەفەرموێ:

﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا﴾ هەرکاتێ ژنانی بێباوەڕ هاتن بۆلای تۆ پابەندی فەرمانی تۆ بن و، خۆیان بفرۆشن لە ڕێگەی فەرمانی خودادا لەسەر ئەوەی هیچ شتێ نەکەن بە هاوبەش بۆ خودا.

﴿وَلَا يَسْرِقْنَ﴾ و لەسەر ئەوەی دزی نەکەن لە مێردەکانیان و جگەی مێردەکانیان، لەو کاتەدا هیندی دایکی موعاویە و ژنی ئەبوسوفیان ووتی: ئەی نێردراوی خودا: ئەبووسوفیان پیاوێکی ڕژدە و بە ڕاستی من دارایی ئەوم لە ناوداوە، ئایا فەرمانت بە چی‌یە؟ پێغەمەر فەرمووی: ئەو کارە بکە بەو مەرجەی لە پێویستی خۆت و منالەکانت زۆرتر نەبێ.

﴿وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ﴾ وە لەسەر ئەوەی داوێن پیسی نەکەن و، منالەکانی خۆیان نەکوژن، لەو سەردەمەدا هەندێ لە هۆزەکانی عەرەب کچەکانی خۆیانیان زیند بە چاڵ ئەکرد، کاتی وائەبوو لەترسی هەژاری منالی خۆیانیان ئەکوشت کوڕ بوونایە یا کچ.

﴿وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ﴾ وە لەسەر ئەوەی ئەو ژنانە نەیەن بە درۆیکەوە خۆیان هەڵی بەستن و، بڵێن: ئەو منداڵەی ئێمە پەیدابووە لە منداڵدانی ئێمە کە کەوتوونەتە نێوان دەست و پێماندا، لەم مێردەی ئێمە و، نە دۆزراوەتەوە، لە داوێن پیسی پەیدا نەبووە، ئەو فەرموودەی خودایە لەوەوە هاتووە هەندێ لە ژنان منالێکی دۆزراوەیان ئەکرد بە منالی خۆیان و، بە مێرەکانیان ئەووت لە تۆیە، یا داوێن پیسی‌یان ئەکرد و منالیان ببوایە ئەیان ووت لە تۆیە، یا ئەیان ووت: ئێمە پاکین کەچی لە حەیزدابوون.

﴿وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ﴾ وە لەسەر ئەوەی ئەو ژنانە بێ‌فەرمانی تۆ نەکەن و لە هەموو شتێکا خودا فەرمانی پێ ئەدا، یا قەدەغەی ئەکا لە هەمووز فەرمانەکانی‌دا، بە تایبەتی بە وێنەی هەڵدان و گریان بەسەر مردوواندا و، لە ڕووی خۆیان ئەدەن و یەخەی خۆیان دائەدڕن و پەلکە قژ برینی خۆیان بۆ مردووان بەکار ئەهێنن.

﴿فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ دوای ئەو بڕیانەیان تۆ بەڵێن و پەیمانەکانیان لێ وەربگرە و، تۆ داوای لێ‌خۆشبوون بکە بۆ ئەو ژنانە لە خودا. بە ڕاستی خودا لێبوردنی زۆر بۆ کەسانێ باوەڕ ئەهێنن و بی‌فەرمانی خودا ناکەن و، زۆر میهرەبانە بۆ ئەو کەسانە پەشیمان ئەبنەوە.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ قَدْ يَئِسُوا مِنَ الْآخِرَةِ كَمَا يَئِسَ الْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَابِ الْقُبُورِ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ ئێوە باوەڕتان هێناوە: ئێوە دۆستایەتی مەکەن لەگەڵ تاقمێ خودا خەشمی لێ گرتوون، یارمەتی‌یان مەدەن، بە ڕاستی ئەو کەسانە بێ ئومێدن لە پاداشتی ڕۆژی دوایی، بە وێنەی بێ‌ئومێدی بی‌باوەڕان بۆ هاتنەوەی دانیشتووانی گۆڕستان و بە تەمای هاتنەوەیان نەماون.

ئەو فەرموودەی خودایە لەوەوە هاتووە هەندێ لە باوەڕدارانی هەژار، ئامەشۆی جووەکانیان ئەکرد، لەگەڵیان دائەنیشتن لەبەر ئەوەی هەندی بەروبوومی ئەوانیان دەست بکەوێ، وایش ئەبوو هەواڵی نهێنی موسڵمانانی بەوان ئەگەیاند، بۆیە خودای مەزن ئەو دۆستایەتی‌یەی ئەوانی قەدەغەکرد لەگەڵ جووەکان.

# ﴿ سورەتی سەف ﴾

لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان لایان وایە لە مەككـە هاتووەتـە خـوارەوە.
ژمارەی ئایەتەكانی (١٤) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ
(١) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ (٢)
كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ (٣) إِنَّ
اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُم
بُنْيَانٌ مَّرْصُوصٌ (٤) وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ لِمَ
تُؤْذُونَنِي وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ فَلَمَّا
زَاغُوا أَزَاغَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ (٥)
وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا
لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ فَلَمَّا
جَاءَهُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ (٦)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ هەرشتێ لە ناو ئاسمانـەكان و لـە ناو زەویدان دوری دەرئەبڕن بۆ خودا لـە هەرشتێ شایستەی پلەی بەرزی خودا نـەبێ و، خودا زۆر گەورە و بە دەستەڵاتە و بە توانایە، زۆر زانایە هەموو شتێ لـە جێگەی شـیاوی خۆیـا دائەنێ.

بەر لـەوەی دەست بكەین بـە مانـاكردنی مانـای ئایەتـەكانی دوایـی، پێویسـتە بزانـرێ كـە ئادەمیزاد لـە بارەی بیر و باوەڕەوە چوار بەشن.

تەفسیری زمناكۆیی

١- بەشێکیان بە ئاشکرا و بە نهێنی باوەڕیان بە ئایینی پیرۆز نییـە، بـە هـەموو جـۆرێ بـە کردار و بە گوفتار دژایەتی بۆ ئیسلام دەرئەبڕن. بێگومـان فـەرموودەی ﴿یاَ اَیُّـهاَ الْمُؤمِنـوُنْ﴾ ئەوان ناگرێتەوە.

٢- تاقمێ تریان بە ئاشگرا دەری ئەبڕن کـە موسـڵمانن، بـەڵام لـە نـهێنیدا و لـە دڵـەوە بڕوایان بە ئایینی ئیسلام نییە، لە ژێرەوە فێڵ و بوختـان و پیـلان سـاز ئـەدەن لـە دژی ئـایینی ئیسـلام، ئـەو بەشـەیش پێیـان نـاوترێ موسـڵمان ، فـەرموودەی خـودا بـە ئـەی بـاوەڕداران نایانگرێتەوە.

٣- تاقمێ تریان بە نهێنی و بە ئاشکران باوەڕی بێگومانیان هەیە بە ئـایینی ئیسـلام و، هـەر بەڵێن و پەیمانێ بەکاربهێنن بە ڕاستی ئەیکەن. بەڵام هەندێ کارەساتی ناهەموار لە هەندێ کاتا ڕێگەیان پێ ئەگرێ و ناتوانن بەڵێنەکانیان بهێننە دی، ئەو تاقمە خاوەنی بیانون و نابنە جێگـەی سزا.

٤- تاقمێ تر هەن گفتوگۆ ئەکەن و بەڵێن ئەدەن و ئاوات ئـەخوازن کـە خـودا فـەرمانیان پێبدا بە جەنگ کردن و کاری چاك هەتا بیکەن، ئەو تاقمە کۆمەڵێ بوون پێش ئـەوەی خـودا فەرمانیان پێبدا بە پێویست کردنی جەنگ لەگەل بێبـاوەڕان ئـەیان ووت: ئەگـەر بمانزانیبـا چ کارێ خودا لای چاکە ئەو کارەمان ئەکرد هەتا ئەمردین، کەچی کاتێ خودا فەرمانی بە جەنگ کردن دا لـە ڕێگەی خودادا و، ئاواتەکەیان هاتەدی لـە بـەڵێنی خۆیـان پەشـیمان بوونـەوە و، ویستی خۆیانیان پووچ کردەوە، ئیتر لـەبەر سستی خۆیان بوو، یا لـە ترسا یا لـەبەر تەمەڵی. ئـەو تاقمـە بـاوەڕدارن. بـەڵام باوەڕەکـەیان لاوازە و، ویسـتییان سسـتە و، خـودای مـەزن ڕووی فەرموودەی خۆیان ئاراستە ئەکا و ئەفەرموێ:

﴿یَا أَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ کَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾ ئـەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: لەبەر چ شتێکە شتێ ئەڵێن و ئەو شـتە ناکـەن. داوای شـتێ ئەکەن و کە فەرمانتان پێدرا بیکەن بۆ نایکەن؟ گوناهێکی گەورەیە لای خودا کـە ئێـوە شـتێ بڵێن داوای کردنی بکەن و نەیکەن.

﴿إِنَّ اللَّهَ یُحِبُّ الَّذِینَ یُقَاتِلُونَ فِي سَـبِیلِهِ صَفًّـا کَأَنَّـهُم بُنیَـانٌ مَّرْصُـوصٌ﴾ بـە ڕاسـتی خـودا کەسانێکی ئەوتۆ جەنگ بکەن لـە ڕێگەی ئایینی خودا، ڕێز ئـەدەن لـەبـەردەم دوژمنـانی ئـایینداً خۆشی ئەوێن، بە جۆرێ ئەوان ڕێز ئەدەن: بە وێنەی دیواری خانوویە وان خشت و پارچـەکانی پاڵیان دابێ بە یەکەوە. بۆشایی لە نێوانیانا نەبێ و، بە مسی تواوە پڕکرابێتەوە.

خودای مەزن موسڵمانان ئاگادار ئەکا و بیریان ئەخاتەوە کە بێفەرمانی پێغەمەران ئەنجامێکی زۆر خراپی ئەبێ لە کاتی جەنگدا و، بەسەرهاتی موسا و تاقمەکەی بیری موسڵمان ئەخاتـەوە و ئەفەرموێ:

﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِي وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّي رَسُولُ اللهِ إِلَيكُم﴾ وە ئێوە بیری ئەو کاتە بکەنەوە: موسا بە تاقمەکەی خۆی ووت: ئەی تاقمی من: لەبەر چ شتێ ئێوە ئازاری من ئەدەن و بێفەرمانی خودا ئەکەن، بەوەی کە من هارووتم کوشتووە و، ئەڵێن من وورگم دڕاوە و، داوای بینینی خودا ئەکەن و، بە ڕاستی ئێوە ئەزانن من نێردراوی خودام بۆلای ئێوە و، پێویستە نێردراوی خودا ڕێزی لێبگیرێ و لە کاری بێزلێکراوەوە دوور بخرێتەوە. ئازاردانی موسا بە زۆر شتی تر بووە: ئەیان ووت: ئێمە ئارام ناگرین لەسەر یەك خواردەمەنی و، تۆ و خودای خۆت بڕۆن جەنگ بکەن و شارەکانی بگرن، دوایی ئێمە لەو جێگانەدا دائەنیشین و، جووەکان بەوەوە نەوەستان و دووای موسا بە عیسایان ووت کوڕی نەجارە، بە ڕێز مەریەم داوێنپیسی کردووە، وەك لە ئینجیلی (متی) ئەسحاحی (١٣) ئایەتی (٥٥) و لە ئینجیلی مەرقوس ئەسحاحی (٦) ئایەتی (٣) بە زەقی هاتووە، کە جووەکان ئەو بوختانانەیان کردووە بە مەریەمدا.

﴿فَلَمَّا زَاغُوا أَزَاغَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ دوایی کاتێ جووەکان لایاندا لە ڕاستی بەهۆی ئازاردان و بێفەرمانی مووساوە، خودا دڵی ئەوانی لادا لە وەرگرتنی ڕاستی و، بێگومان خودا هیچ کەسێ لە ڕێگەی ڕاستی لانادا و مەگەر خۆی خراپە هەڵبرێژێ بەسەربەستی خۆی و، خودا ڕانومایی تاقمێ ناکا لایاندابێ لە پەرستنی خودا.

﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ﴾ وە ئێوە بیری ئەو کاتە بکەنەوە: عیسای کوڕی مەریەم ووتی: ئەی بەنوئیسرائیلی: بە ڕاستی من نێردراوی خودام بۆلای ئێوە، بڕوام بەو فەرمانانە هەیە لە ناو تەوراتان و، بە فەرمانی نامەکانی ئەو پێغەمەرانە لە پێش منەوە بوون و نێردراوی خودان.

﴿وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ﴾ وە من موژدە ئەدەم بە پێغەمەر و نێردراوێکی خودا لە دوای من دێت بۆلای هەموو ئادەمیزاد ناوەکەی (ئەحمەدە) و لە تەوراتا بەو ناوەو ناونراوە، ئەحمەد یەکێکە لە ناوەکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾.

﴿فَلَمَّا جَاءَهُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ دووایی هەریەکێ لە ئەحمەد و لە موسا چوون بۆلای بەنوئیسرائیلیەکان بەو بەڵگە ئاشکرانەوە، ووتیان: ئەوانە جادویەکی ئاشکران و، باوەڕیان پێناهێنین.

خودای مەزن لەو ئایەتەی پێشوودا زۆر بە زەقی ڕایگەیاندووە کە ئەو تەوراتەی هاتووەتە خوارەوە بۆ سەر موسا و، ئەو ئینجیلەی هاتووە بۆ عیسا موژدەیان داوە بە هاتنی پێغەمەر و ڕاستی پێغەمەر.

قورئان بۆ ڕاستی ئەو موژدەیە بێباکانە ڕووبەڕووی زاناکانی گاوور و جووەکـان وەسـتاوە، ئەوانیش نەیانتوانیوە بە دۆری بخەنەوە، مێژووی ڕابردوویش باسی ئەوەی نەکردووە بە درۆیـان خستبێتەوە، هەرچەندە ئەوپەڕی دوژمـن و دژی قورئـان بـوون، بگـرە زانـا خـاوەن دادەکـانی بەنوئیسرائیلی موسڵمان بوون و ڕاستی قورئانیان ڕاگەیاند، بە وێنەی عبدالله ی کوڕی سەلام و هاوڕێکانی، لـەگەڵ ئەوەیشدا ئەو زانایانە دایان نـابوو دوژمنایـەتی پێغەمـەری خـودا بۆخۆیـان، ئەگەڕان بە شوێن هەڵەیەکدا پێغەمەری پێ بەدرۆبخەنەوە. زانای بەڕێز مامۆستا (موحەمەد جەواد موغنیە) لـە تەفسیرەکەی خۆیـا (الکاشـف) ئـەم پرسـیار و وەڵامانـەی دووایـی هـاتوون.زۆرم پێچاکە نووسینیان:

پرسیار: ئەگەر جووەکان یا گاورەکان بە موسڵمانێ بڵێن : قورئانی ئێـوە بـە زەقـی لـەسـەر ئەوەیە کە تەورات و ئینجیل موژدەیان داوە بە پێغەمەرایەتی موحەمەد ﴿ﷺ﴾، کەچی شـوێنەوار و نیشانەیە لەو تەورات و ئینجیلـەی لـەلای ئێمەن ئەو داوایەی قورئانیان تێدا نییە؟

وەڵام: ئەگەر ئەو پرسیارەیان کرد، ئەو موسـڵمانە بـۆی هەیـە بڵـێ لـە وەڵامـی ئـەواندا: زانایانی جووەکان و گاورەکان خۆیان ئەو وەڵامەیان لایە و ووتوویانە: ( کە تەوراتی سـەرەکی کە هاتووەتە خوارەوە بۆ سەر موسا نەماوە و لـەناوچووە، دوای چەن ساڵێ پیاوێ ووتوویـەتی: من تەوراتم لـەبەرە و، داواکەی خۆی نووسی و ووتی: ئەمە تەوراتە و ئێوە بیکـەن بـە تـەورات بۆخۆتان).

هەروایش و بەو شێوەیە بە ئینجیلی سەرەکی و ڕاستی کە نێردراوە بۆ سەر عیسـا نـەماوە و لـە ناوچووە. زۆر سەیر و سەمەرەیە، ئەو ئینجیلە کە بە بڕیـاری خۆیـان نـەماوە، لـە دووایـدا زۆرتر لـە پەنجا ئینجیلی لێ پەیدابووە. هـەتا لـە سـاڵی (٣٢٥)ی زایینـی سـەرۆکەکانی گـاور کۆبوونەوەبڕیاری پەسەندکردنی چوار ئینجیلیـان دا، لـەگـەڵ ئەوەیشـدا بـە گوێـرەی بڕیـاری هەموو گاورەکان عیسا یەك ئینجیلی بۆ هاتووە. چ شتێ بوو ئەو تاکە ئینجیلـە بکـا بـە چـوار ئینجیل؟ ئەگەر بڕیاری (٣) ئینجیلیان بدایە، ئەو کاتە ئەبێژرا بۆ هەریەکە لـەو سـێ (أقنومانـە) ئینجیلێ دانراوە.

گەورەترین بەڵگە لـەسەر ئەوەی ئەو ئیمجیلانە دانراوی پیاوانی کەنیسەن و ئینجیلی عیسـا نین ئەوەیە: کە ئەو ئینجیلانە باسی هەڵواسین و ناشتنی عیسا ئەکەن لە گۆڕدا و باسـی کۆتـایی ژیانی عیسا ئەکەن لـەسەر زەوی، دوایی ئایا ئـەبێ عیسـا سروشـی بـۆ هاتبێتـە خـوارەوە دوای هەڵواسینی و ناشتنی لـە گۆڕدا و، بێگومان شتی وا نابێ و ناگونجـێ، ئەگـەر لـەوانـە بـێ شـتی وابێ، چۆن ئەبێ و، ئەگونجێ لای ئەقڵ کە بێتە خوارەوە بۆ سەر عیسا سروشێ بنووسرێتەوە لـە ئینجیلێکا هاتبێتە خوارەوە دوای بەرزبوونەوەی عیسا بۆ ئاسمان و کۆتایی پێهاتنی ژیـانی و ببـێ بە چوار ئینجیل؟

پرسیار: لە چ جێکەیەکەوە ئێمەی موسڵمان دەستمان ئەکەوێ کە ئەو بڕیارانە زاناکانی گاوور و جووەکان داویانە کە ئەو ئینجیل و تەوراتەی هاتوونەتە خوارەوە بۆ سەر عیسا و موسانەماون و لەناوچوون؟

وەڵام: لە زۆر ژمارەی نامەکانی خۆیان بە زمانی عەرەبی و جگەی عەرەبی دایان ناوون، بۆ نموونە: یەکێك لەو نامانە بە زمانی عەرەبی دانراوە بە ناوی (قاموس كتاب المقدس) کە (٢٧) زانا بەشداری‌یان کردووە لە دانانی ئەو نامە پیرۆزەدا لە باسی ووشەی (يوشيا)دا، لەو نامەیەدا ئەڵێ: (لەو شتانەیە گومانی تێدانی‌یە، کە بە ڕاستی زۆربەی نامە پیرۆزەکان لەناوبراون، یا لە ناوچوون لە کاتی وەرگەڕانی گاوور و جووەکان و، کاتی چەوسانەوەیان). هەروەها لە باسی ماوەی (أسنار) لەفەرەهەنگی نامەی پیرۆزدا ئەڵێ: (بیروبۆچوونی تر هەیە ئەڵێ: کەسێکی ئەوتۆ شێوەی یاسای داوە بەسەر نامەکانی بەڵێنی کۆندا (أسنأ العهد القديم) ئەو کەسانەن نامەکانیان نووسیوەتەوە). بیروبۆچوونی تر هەیە ئەڵێ: ئەو کەسانەن نامەکانیان نووسوەتەوە کە لە لایەن ڕوحولقودسەوە یارمەتی‌یان دراوە و، لەگەڵ نووسەرەکاندا پێشەواکانی گاوور و جووەکان ئەو نامانەیان وەرگرت وەك یاسا بۆخۆیان بە ڕانوومایی (روح القدس) بۆخۆیان. ئەو بڕیار و بیربۆچوونانە گومانیان تێدا نی‌یە کە نامە پێشووەکان لەناوچوون و، بە ڕاستی کۆمەڵێ ئەو نامانەیان نووسیوەتەوە و شێوەی یاسایانداوە بەسەریاندا لە لایەن خۆیانەوە لەسەر هەر بیروباوەڕێ‌بێ، بە یاریدەی (روح القدس) بە گوێرەی بیروباوەڕکەی تر.

وە لە لای ئێمە یەکسانە بە بیروبۆچوونی هەرکام لەو دوو بیروبۆچوونانە وەرگرین ئەنجامەکە هەر یەکە، ئەویش ئەوەیە: بڕیاری بێگومانیان داوە ئەم نامە تازانە نامە سەرەکی و یەکەم جارەکەی موسا و عیسا نی‌یە و، ئەوانەی ئەوان لە ناوچوون و، لە جێگەی ئەواندا، نووسراوە تازەکانی‌یان نووسیوەتەوە کەسانێکی ئەوتۆن بە گومانی خۆیان پیرۆزن، یا تاقمێ تر پیرۆزی‌یان داوە بەوان و بەلایانەوە وابووە پیرۆزن و، هەموویان (روح القدس) یارمەتی داوون. ڕوحلقودس بەلای ئەوانەوە بریتی‌یە لە (ئوقنومی) سێهەم، بۆیە ناونراوە بە (ڕوح) چونکە ژیان ئەو درووستی کردووە، پیرۆزیشە، چونکە کاری ئەو پاککردنەوەی دڵی باوەڕدارانە بە گومان و بیروبۆچوونی گاوورەکان. ئەوەی باسکرا ڕاوبۆچوونی جگەی زانایانی ئیسلامە.

زانایانی ئیسلام بە دەیان نامەیان هەیە، بەڵگەن لەسەر گۆڕانی تەورات و ئینجیل، وەك نامەی (اظهار الحق) دانراوی (شێخ ڕەحمەتوڵای هیندی) کە سەد بەڵگەی باسکردووە لەسەر گۆڕینی تەورات و ئینجیل، کە خاوەنی تەفسیری (ئەلمەنار) لە باسی ئایەتی (٤٦)ی سوورەتی نیسائدا باسی کردووە، لە نامەی (الرحلة المدرسية) دانراوی شێخ جەوادی ئەلبەلاعنی. لە نامەی (محمد رسول الله في بشارات الأنبياء) دانراوی موحەممەد ئەلغەفار. نامەی (محمد رسول الله

هكذا بشرت الأناجيل) دانراوی زەخاوی میخائیل. نامەی (البشارات والمقارنات) دانراوی شـێخ موحەممەد صادقی تەهرانی. ئەوانە هەموویان پڕن لە بەڵگەی بێگومان لەسە رگۆڕینی تەورات و ئینجیل. لەوانەی ئەم سەردەمە.

وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ
عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُوَ يُدْعَىٰٓ إِلَى ٱلْإِسْلَٰمِ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ
﴿٧﴾ يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ
ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ
عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هَلْ أَدُلُّكُمْ
عَلَىٰ تِجَٰرَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿١٠﴾ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ
فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١﴾
يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ
طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ وَأُخْرَىٰ تُحِبُّونَهَا نَصْرٌ
مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوٓا۟
أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ لِلْحَوَارِيِّۦنَ مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ
قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ
وَكَفَرَت طَّآئِفَةٌ فَأَيَّدْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ عَلَىٰ عَدُوِّهِمْ فَأَصْبَحُوا۟ ظَٰهِرِينَ ﴿١٤﴾

﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُوَ يُدْعَى إِلَى الْإِسْلَامِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ وە چ کەسێ بێ ستەمکارتر لەو کەسەی درۆ و بوختـان هەڵبەسـتێ و بیـدا بەسـەر خوادا، پێغەمەر و قورئان بەدرۆبخاتەوە، بلێ: ئەو شـتەی موحەمـەد هێناویـە درۆ و بوختانـە و، ئایەتەکانی قورئان جادووە و، لەبەر ئەوە ئـەو کەسـە داوای لێ‌ئەکرێ خـۆی بـدا بـە دەسـت فەرمانەکانی خودا و سەرشۆڕی فەرموودەی خودابێ و بێتە ناو بەختیاری هەردوو جیهانــەوە و، خۆی بکا بە جێگەی خەشمی خودا بەسەریا و، خودا ڕانومایی تاقمی ستەمکاران ناکا لـە خۆیـان و بەسەربەستی خۆیان ئەیکەن.

﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِؤُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾ بێباوەڕان ئەیانەوێ ڕووناکی ئایینی خودا بەهۆی فووی دەمیانەوەو، بەو بوختانکردنەیان و تاوانج گرتنیان لە قورئان کە جادووە بیکوژێننەوە، خودا ڕووناکی ئایینی خۆی تـەواو ئـەکا و بـڵاوی ئەکاتـەوە بـە نـاو هەموو بوونەوەراندا و ئەگاتە ئەوپەڕی توانای خۆی و، با وەکـو بێبـاوەڕان پێیـان ناخۆشـبێ و لایان گرانبێ.

﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَـرِهَ الْمُشْـرِكُونَ﴾ خـودا کەسـێکی ئەوتۆیـەنێردراوی خـۆی ڕەوانـە کـردووە بـە قورئانێکـەوە شـارەزاییکەری ئادەمیزادە بۆلای ڕێگەی ڕاست، بە نەتەوەیەك و بە ئایینێکی ڕاست و دادپەروەر، لەبەر ئەوەی سەری بخا بەسەر هەموو ئایینەکانی تردا و، با وەکو بت پەرستان پێیان ناخۆشبێ و لایان گرانبـێ و، خۆیان ماندووبکەن بۆ لـە ناوبردنی و، ڕسوا ئەبن و ئابڕوویان ئەچێ.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَـذَابٍ أَلِيـمٍ تُؤْمِنُـونَ بِاللَّـهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەی کەسـانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: ئایا من شارەزایی ئێوە بکـەم لـەسـەر بازرگانیـیە ئێـوە ڕزگـار بکـا لـە سزایەکی خاوەن ئازار. ئەو بازرگانییە بریتییە لەوەی ئێوە باوەڕ بهێنن بە خودا و بە نـێردراوی خودا و خۆتان ماندووبکەن لـە ڕێگەی سەرکەوتنی ئایینی خودا و، بەهۆی بەخشـینی دارایـی و دانانی لەشی خۆتان لـەو ڕێگەیەدا، ئەو باوەڕهێنان و کۆشش و دارایی بەخشینی خۆتان و دانانی گیانی خۆتان لـە ڕێگەی خودادا چاکترە بۆ ئێوە، ئەگەر ئێوە بە سـوود و بـە بـەختیاری خۆتـان بزانن.

﴿يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَـدْنٍ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ ئەگەر ئێـوە باوەڕبـهێنن و کۆشـش بکـەن لــە ڕێگــەی خـودا، خـودا لـە گوناهەکانی ئێوە خۆش ئەبێ و، ئەتان خاتە ناو چەندین بەهەشت ئەڕوا بـە ژێـر درەختـەکانی و ئەملاولای کۆشکەکانی چەندین ڕووباری ئاوی شیرین و ئەتانخاتە ناو جێگـە و کۆشـکی پـاك و نایاب لـە ناو چەندین بەهەشتی جێگەی دانیشتنی بەردەوام و بەرین. ئەو لێخۆشبوون چونتان بۆ ناو ئەو بەهەشتانە سەرکەوتن و ڕزگاربوونێکی زۆر گەورەیە.

﴿وَأُخْرَى تُحِبُّونَهَا نَصْرٌ مِّنَ اللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيـبٌ وَبَشِّـرِ الْمُؤْمِنِـينَ﴾ وە بـۆ ئێـوە هەیـە چـەندین چاکـەی تـر جگـەی ئەوانـەی پێشـوو، ئێـوە خۆشـتان ئـەوێن و بـە ئومێـدی ئـەوانن، بریتـین لـەسەرکەوتنی ئێوە بەسەر قوڕەیشییەکاندا لـە لایەن خوداوە و، یارمەتییەکی نزیك کە گرتنـی مەکەیە و، تۆ موژدە بدە بە باوەڕداران بەو سەرکەوتنە و بەداگیرکردنی مەککە بەم نزیکە.

تەفسیری زمناکۆیی

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونوا أنصَارَ اللَّهِ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە، ئێوە بـبن بـە یاریدەدەرانی ئایینی خودا و، بەرزبکەنەوە فەرموودەی خودا، لە هەموو کاتێکا نێردراوی خـودا داوای لە ئێوەکرد یارمەتی ئایینی خودا بـدەن. ئـەو فـەرموودەی خودایـە، بـەو بـانگ کردنـە مەبەستی هەموو باوەڕدارانە.

هەندێ لە زانایان ئەڵێن: مەبەست لەو باوەڕدارانە: ئەو کەسانەن پەیمانیاندا بە پێغەمـەر لـە عەقەبەی دووهەمدا کە حەفتاو دوو کەسبوون. یاریدەی ئایینی خودا بدەن.

﴿كَمَا قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ لِلْحَوَارِيِّينَ مَنْ أَنصَارِي إِلَى اللَّهِ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ اللَّهِ﴾ هەروەك عیسای کوڕی مەریەم ووتی بە هـاوڕێ پـاك و هـەڵبژاردەکانی خـۆی: چ کەسـانێکن یارمەتی من بدەن بۆلای ئایینی خودا، حەواری‌یەکان ووتیان ئێمە یاریدەی ئایینی خودا ئەدەین بە فەرمانی تۆ، هاوڕێ نیازپاکەکانی عیسا (١٢) کەسبوون.

﴿فَآمَنَت طَّائِفَةٌ مِّن بَنِي إِسْرَائِيلَ وَكَفَرَت طَّائِفَةٌ﴾ دوایـی تاقمـێ لـە بەنوئیسـرائیلی‌یەکان باوەڕی‌یان بە عیسا هێنا و، تاقمێ تریان باوەڕیان پێ نەهێنا.

﴿فَأَيَّدْنَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَى عَدُوِّهِمْ فَأَصْبَحُوا ظَاهِرِينَ﴾ دوایـی ئێمـە یارمـەتی کەسـانێکی ئەوتۆماندا باوەڕیان هێنابوو سەرمان خستن بەسەر بێباوەڕانی دوژمنی ئـەواندا، دوایـی کۆچـی دووایی عیسا ئەو دووتاقمانا بوو بە جەنگیان خودای مەزن یارمەتی باوەڕدارانی دا، دوایـی زاڵ بوون بەسەر بێباوەڕاندا.

گێڕراوەتەوە لە ئیبنوعەباسەوە: بەنوئیسرائیلی‌یەکان و تاقمەکەی عیسا دوای عیسابوون بـە سێ تاقم: تاقمێکی‌یان ووتیان: عیسا بەندەی خودایە، بەرزی کردووەتەوە بۆ جێگەیە خودا خۆی ویستوویەتی. تاقمـێ تریـان ووتیـان: عیسـا کـوڕی خودایـە و بـەرزی کردووەتـەوە بـۆلای خۆی.تاقمێ تریان ووتیان: عیسا خۆی خودایە.. هەریەکە لەو سێ تاقمانە، چەندین لایـەنگریان بۆخۆیان پەیداکرد. لە ئەنجامدا لە نێـوان دوو تاقمـە بێباوەڕەکـەیان و تاقمـە باوەڕدارەکـەیان جەنگ پەیدابوو و درێژەی کێشا هەتا کاتی ناردنی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، ئەوەبوو ئەو تاقمە باوەڕدارە سەرکەوتن بەسەر ئەو تاقمە بێباوەڕەدا.

بۆ زانین: لە فەرهەنگی نامەی پیرۆزدا: عیسـایان نـاوبردووە بـە (یەسـوعی ناسـیری) یانـێ دانیشتووی شاری (ناسیرە). یەسوع یانێ خودای ڕزگارکـەر. مەسـیح نازنـاوی عیسـایە، یانـێ گـەڕاو بەسـەر زەوی‌دا، لــە مـاوەی سـاڵی (٤٢-٤٣) باوەڕدارەکانیـان نـاوبرد بـە مەسیحی‌یەکان.لەوانەیە یەکەم جار ئەو ناوە جنێودان بووبێ بە باوەڕداران، ماوەی نێوان عیساو موسا مێژونوسان بیربۆچونیان جیاوازە لە نێوان ئـەم سـاڵانەدا هـەندێکیان ئـەڵێن: زۆرتـرە لـە (١٢٠٠) ساڵ و کەمترە لە (١٤٩١). هەندێ تریان ئەڵێن: نێوانیان زۆرترە لە (١٤٩٠) ساڵ و کەمترە لە (١٢١١) ساڵ. لە نووسراوەکانی (یوحنا)دا هاتووە: هەرکەسێ بڕوای بەوە نـەبێ

کە خودا بوە بە لـەشی عیسا و، خوایەتی و مرۆڤایەتی لـە عیسادابوون بە یەك، دوژمنی عیسـایە، بەڵام قورئان ئەفەرموی: دوژمنی عیسا ئەو کەسانەن لـە سنووری خودا لایـانداوە و، عیسـا بـە خودا ئەزانن:

| ناوی حەوارییەکان و قوتابییەکانی عیسا بەوجۆرەی ئینجیلی ( بەرنابا ) لە فەسلی چوارەمدا باسی کردوون بەم جۆرەیە : | ناوی حەوارییەکان و قوتابییەکانی عیسا بەو جۆرەی ئینجیلی ( متی ) باسی کردووە بەم جۆرەیە : |
|---|---|
| ١ . أندراوس. | ١ . سمعان الذي يقال له بطرس. |
| ٢ . بطرس – الصباد – سمعان. | ٢ . أندراوس أخو السمعان. |
| ٣ . برنابا. | ٣ . يعقوب بن زيدى. |
| ٤ . يوحنا بن زيدى. | ٤ . يوحنا أخو يعقوب. |
| ٥ . متي العشار. | ٥.فلیبس. |
| ٦ . يعقوب بن زيدى. | ٦ . برثولماوس. |
| ٧ . تداوس. | ٧ . توما. |
| ٨ . يهوذا. | ٨ . متي العشار. |
| ٩ . برثولماوس. | ٩ . يعقوب بن خلقي. |
| ١٠ . فيلپس. | ١٠ . لبارس الملقب تدارس. |
| ١١ . يعقوب بن خلفي. | ١١ . سمعان القانوني. |
| ١٢ . يهوذا الأسخر بوطي. | ١٢ . يهوذا الأسخر بوطي. |

بەوجۆرە باسی قوتابییەکانی عیسا کراوە لـەو دوو ئینجیلانەدا، ئێمە دەبینین کە بـەرنابا دوو ناوی باس نەکردووە، کە (توما و السمعان القانوني)ین لـە جێگەی ئـەو دوو کەسـانەدا نـاوی بەرنابا و تەداروس دانراوە. بەڵام کەنیسە کە تەماشایان کرد ئینجیلـی بـەرنابا دژی ئـارەزوو و ویستی ئەوانە، ناوی بەرنابایان لـەگەڵ سەمعان لابرد، لـە ناو قوتابییەکانی عیسادا چونکە بـیرو باوەڕی بەرنابا و سەمعان وەك یەك وان. بە هەرجۆرێ بێ حەوارییەکانی ئەو کەسانەن وەڵامی عیسایان دایەوە، بلاوبوونەوە بەناو گووندەکانی جووەکاندا و، بانگیان ئەکردن بـۆلای پـەیامی عیسا، ئەبێ ئەوەیش بزانین وەڵامدانەوەی ئەو قوتابییانە بۆ یارمەتیدانی عیسا بۆ بلاوکردنەوەی ئایینی خودا بە یەك کات و لـە یەك ڕۆژدا نەبووە. بەڵکو ناوبەناو ئەهاتن بۆلای عیسا و بەڵێنیان ئەدا یارمەتی بدەن، خودای مەزن باسی حەوارییەکانی عیسای فەرمووە، لـە سوورەتەکانی ئـالی عیمران و ئەلمائیدە و لـەم سوورەتەدا.

# ﴿ سورەتی ئەلجومعە ﴾

لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (١١) ئایەتن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡمَلِكِ ٱلۡقُدُّوسِ ٱلۡعَزِيزِ
ٱلۡحَكِيمِ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ
عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ
مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٢﴾ وَءَاخَرِينَ مِنۡهُمۡ لَمَّا يَلۡحَقُواْ بِهِمۡۚ
وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٣﴾ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ
ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٤﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان**

﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾ هەرشتێ لە ناو ئاسمانەکان و لە ناو زەوی‌دان پاکی و دووری دەرئەبڕن بۆ خودایە کە پادشا و خاوەنی هەموو بوونەوەرانە. پاکە لە شتی ناشایستە، زۆر گەورە و بەتوانایە، هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ.

﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ﴾ خودایەکی ئەوتۆیە لە ناو تاقمێکی نەخوێندەواردا پێغەمەرێکی ڕەوانەکردووە لە خۆیانا ئایەتەکانی قورئانی خودا ئەخوێنێتەوە بەسەریاندا.

مەبەست لە ووشەی ﴿الْأُمِّيِّينَ﴾ عەرەبەکانی ئەو سەردەمەی پێغەمەر بووە. کە زۆربەی زۆریان نەخوێندەواربوون. مەبەستیش لە ووشەی ﴿رَسُولًا﴾ موحەممەدی کوڕی عەبدوولاّیە کە ئەو موحەمەدەیش نەخوێندەواربووە و نەی ئەزانی بنووسێ و بخوێنێتەوە، لەگەڵ ئەوەیش نەخوێندەوار بووە قورئانی پیرۆزی بە سروش بۆ هاتووەتە و ئەیخوێندەوە بەسەر دانیشتووانداا.

﴿وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ وە ئەو نێردراوەی خودا عەرەبەکان پاك ئەکاتەوە لە چڵکی بت پەرستی و نەزانین و کردەوە خراپەکانیان و، ئایانگۆڕێ بۆلای کردەوەی چاك و پاك، نامەی خودایان فێر ئەکا و ڕزگاریان ئەکا لە تاریکی نەزانین، فێری هەموی یاسای چاك و بیر و باوەڕ و ڕەوشتی چاکیان ئەکا و، بە ڕاستی ئەوان لە پێش ناردنی ئەو پێغەمەرە لە ناو گومڕایەکی زۆر ئاشکرادابوون. فێری نامەی خودایان ئەکات.

خودای مەزن لە سوورەتی سەفدا فەرمووی: ﴿سَبَّحَ﴾ بە کرداری ڕابردوو، لەم سورەتەدا ئەفەرموێ ﴿يُسَبِّحُ﴾ بە کرداری داهاتوو; لەبەر ئەوەی بزانرێ خودا شایستەی پاك و خاوێنیە لە هەموو کاتێکا، لە ڕابردوو و داهاتوودا.

ناوبردنی عەرەبەکان بە تایبەتی، ئەوە ناگەیەنێ جگەی عەرەب فێری یاسا و دەستووری چاکیان ناکا، ئەوەتە بۆ جگەی عەرەبە و ئەفەرموێ:

﴿وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ وە نێردراوی خودا جگەی عەرەبەکانی ئێستا فێری هەموو کەسێ ئەکا بچێتە ناو ئایینی ئیسلامەوە دوای نێردراوی خودایش هەتا ڕۆژی دوایی، ئیتر عەرەب بن یا جگەی عەرەب و، نێردراوی خودامیهرەبانیە بۆ هەموو نەتەوەیە، پەیامەکەی بۆ هەموو ئادەمیزادە، کاتێ جگەی عەرەب تووشی پێغەمەر و هاوڕێکانی پێغەمەر نەبن و، دوای ئەوان بێن و بەوان نەگەیشتبن، خودا زۆر گەورە و بەتوانایە، هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ. بە توانای خۆی ڕێزی ئایینی ئیسلام ئەگرێ و بڵاوی ئەکاتەوە بەسەر هەموو ڕووی زەویدا. بە زانستی خۆی هەڵیبژاردووە پەیامەکەی داناوە بۆ هەموو ئادەمیزاد.

﴿ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴾ ڕەوانەکردنی ئەو نێردراوەی خودا و پەیامەکەی بۆ هەموو نەتەوەیە گەورەیی و چاکەی خودایە، ئەیبەخشێ بە هەرکەسێ ئارەزۆی بکا لە بەندەکانی خۆی، بۆ ئەو مەبەستەی هەڵیبژێرێ و، خودا خاوەنی چاکەی زۆر گەورەیە و سەرچاوەی میهرەبانی زۆرە، موحەممەد ئەو کەسەیە خودا بەخشیویە بە هەموو ئادەمیزاد و کردوویەتی بە دیاری بۆیان.

مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًۢا ۚ بِئْسَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٥﴾ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓا۟ إِن زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَآءُ لِلَّهِ مِن

دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُۥٓ
أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧﴾ قُلْ إِنَّ
ٱلْمَوْتَ ٱلَّذِى تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمْ ۖ ثُمَّ تُرَدُّونَ
إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾

﴿مَثَلُ الَّذِينَ حُمِّلُوا التَّوْرَاةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًا﴾ وێنەی کەسانێکی ئەوتۆ فێری تەورات کراون و، داوایان لێکراوە هەڵی گرن و کار بەو بەڵگانەی بکەن بەڵگەن لەسەر پێغەمەرایەتی موحەممەد، لە پاشانا کاری پێ ناکەن و سوودی لێ وەرناگرن لەو جۆرەی فەرمانیان پێدراوە، بە وێنەی گوێ درێژێکە چەند نامەیە هەڵبگرێ و، بەهۆی قورسایی ئەو نامانەوە ئازاری پێبگا و، سوود لە ناوەڕۆکەکانی وەرناگرێ، یانێ جووەکان سوود لە فەرموودەکانی تەورات و ڕانوومایی قورئان و دەستوورەکانی و، لە فەرموودەی موحەممەد وەرناگرن.

جووەکان ئەڵێن: ئێمە خاوەنی تەوراتین و نامەکەمان پیرۆزە، کەچی باوەڕ بە موحەممەد نایەرن کە بە زەقی ئەو تەوراتەی بۆ موسا نێردراوە فەرمان ئەدا باوەڕ بە موحەممەد بهێنن. بێگومان ئەو تەوراتەی هاتووە بۆ موسا گۆڕراوە یا نەماوە. بۆ نموونە ئەو تەوراتە دەست کاری کراوە کە ئەڵێ بە بوختان کردن بەدەم (حزقیال) پێغەمەرەوە لە ئەسحاحی (٩) لە نامەی حزقیالدا: (چاوتان نەترسێ و، پیر و گەنج و کچ و مناڵ و ژنان هەموویان بکوژن).

﴿بِئْسَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ وێنەی تاقمێکی ئەوتۆ بەدرۆ ئەخەنەوە ئەو ئایەتانەی خودا فەرمانیانداوە بە باوەڕهێنان بە موحەممەد خراپە و بێفەرمانی خودا نەکەن، خودا یاریدە و ڕانومایی تاقمی ستەمکاران لە خۆیان نادا و، بەسەربەستی و خۆشی خۆیان ستەمیان لە خۆیان کردووە.

﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ هَادُوا إِن زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَاءُ لِلَّهِ مِن دُونِ النَّاسِ فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ بوون بە یەهوود و ئایینی جووەکانتان هەیە، ئەگەر ئێوە گومانتان وایە کە بە ڕاستی ئێوە دۆست و خۆشەویستی خودان، لە جگەی ئادەمیزاد، دووایی ئاوات بخوازن و داوای مردن بکەن، لەبەر ئەوەی لە چڵك و چەپەڵی ئەم ڕۆژگارە ڕزگارتان بێ بۆلای بەهەشت، ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن دۆست و خۆشەویستی خودان و گەلی هەڵبژاردەی خودان.

﴿وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُ أَبَدًا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ﴾ وە ئەو جووانە هەرگیز داوای مردن ناکەن بەهۆی شتێکەوە پێشیان خستووە و کردوویانە لە بێباوەڕی و بێفەرمانی خودا و گۆڕینی تەورات و، خودا ئەزانێ بە ستەمکاران.

﴿قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مُلَاقِيكُمْ﴾ تۆ بڵێ بە جووەكان: بە ڕاستی ئەو مردنەی ئەوتۆ ئێوە ڕائەكەن لە دەستی، بە ڕاستی ئەو مردنە تووشی ئێوە ئەبێ و بە سزای كردەوەی خۆتان ئەگەن.

﴿ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ لە پاشانا ئێوە ئەگێڕرێنەوە بۆلای خودایە ئەزانێ بە شتێ نابینرێ و دیار نییە و، بە شتێ لەبەر چاو ئەبینرێن و، دوایی خودا هەواڵ ئەدا بەشتێ ئێوە ئەیكەن لە جیهاندا لە گۆڕینی نامەی خودا و هەموو كردارەكانتان، ئێوە زیندوو ئەكرێنەوە و پاداشتی كرداری خۆتان وەرئەگرن.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ
فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ
تَعۡلَمُونَ ٩ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ
وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ
١٠ وَإِذَا رَأَوۡاْ تِجَٰرَةً أَوۡ لَهۡوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيۡهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمٗاۚ قُلۡ
مَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ مِّنَ ٱللَّهۡوِ وَمِنَ ٱلتِّجَٰرَةِۚ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ١١

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ﴾ ئەی كەسانێكی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: هەركاتێ بانگ كرا بۆ نوێژ لە ڕۆژی جومعەدا، دوایی ئێوە ڕابكەن بۆلای كردنی نوێژی جومعە و، واز لە كڕین و فرۆشتن بهێنن ببێ بەهۆی لە كیس چوونی یادی خودا و نوێژی جومعە.

﴿ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەو ڕاكردنە بۆلای یادی خودا و بیستنی خوتبە و بە جێهێنانی نوێژی هەینی چاكترە بۆ ئێوە بزانن بە چاك و بە خراپ بۆ سوودی خۆتان.

بۆ زانین: مەبەست لە بانگكردن ئەو بانگەی پێش نوێژ لەسەر مینبەردا دانیشتووە، ڕۆژی هەینی ناوبراو بە ڕۆژی جومعە لەبەر كۆبوونەوەی ئادەمیزاد بۆ نوێژ لەو ڕۆژەدا، بەر لە كاتی ئیسلام عەرەبەكان ناویان ئەبرد بە ﴿العروبە﴾. یەكەمین نوێژی پێغەمەر كردبێتی لە كاتێكا بوو، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هات بۆ مەدینە لە گوندی (قوباءدا) نوێژی هەینی كرد، دووایی چوو بۆ مەدینە و، لە خانووی كوڕانی سالیم كوڕی عەوف دابەزی. مەبەست لە ڕاكردن بەجێهێنانی نوێژی هەینییە، نەك ڕاكردن بە ڕۆیشتن و بەپێ.

﴿فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِن فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ دوواییِ کاتێ نوێژی هەینی جێبەجێکراو کۆتایی پێهات، دوواییِ ئێوە بڵاوبنەوە بە ناو زەوی‌دا بۆ پەیداکردنی پێویستی ژیان و گوزەرانی جیهان و، ئێوە داوای ڕۆزی و چاکەی خودا بکەن بە نیازی پاکەوە و، ئێوە یادی خودا بکەن بە زۆری و لە هەموو کاتێکا و، نەك بە تەنها هەر لە ڕۆژی هەینی‌دا و، بە زۆری قورئان بخوێنن. بۆ ئەوەی سەرکەوتن بە دەست بهێنن و لە هەردوو جیهاندا و ڕزگارتان بێ لە سزای خودا لە ڕۆژی دووایی‌دا.

بە ڕێکەوت دانیشتووانی مەدینە تووشی گرانی و برسێتی بووبوون، یەکێ لە بازرگانەکان لە کاروانی بە کوتاڵ و بە خواردەمەنی‌یەوە لە شامەوە هاتەوە، لەو کاتەدا پێغەمەری خودا بە پێوە وەستابوو و خوتبەی نوێژی هەینی ئەخوێندەوە، دانیشتووانی مەدینە بە گوێرەی داب و نەریتی خۆیان، بە تەپڵ لێدانەوە چوونە پێشوازی‌یان. زۆر کەس لەوانەی لە مزگەوتابوون چوونە دەرەوە لە مزگەوت و وازیان لە پێغەمەر هێنا لە ترسی ئەوەی نەوەك بەشیان لەو شتە نەمێنێ ئەو بازرگانە هێناوی‌یەتی، جگە لە (١٢) کەس لە مزگەوت و لە خزمەت پێغەمەردا نەمانەوە.

پێغەمەر ئەو (١٢) کەسە کە نوێژی هەینی‌یان کرد و، نوێژەکەی نەکردەوە، بۆیە هەندی لە زانایان لایان وایە، نوێژی هەینی بە (١٢) کەس درووستە، خودای مەزن لەوبارەوە فەرمووی:

﴿وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا﴾ وە هەرکاتێ باوەڕدارانبزانن بە بازرگانی یا بە گاڵتەیە لە بیستنی دەنگی تەپڵ، ئەچن بۆلای ئەو بازرگان و تەپڵەوە، تۆ بە ڕاوەستاوی لە کاتی خووتبەدا تۆ بەجێ ئەهێڵن لەسەر مینبەر.

﴿قُلْ مَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ مِّنَ اللَّهْوِ وَمِنَ التِّجَارَةِ وَاللَّهُ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾ تۆ بڵێ: شتێ لای خودایە چاکترە لە دەنگی تەپڵ و لە بازرگانی و، خودا چاکترین کەسانێکە ڕۆزی و چاکە ببەخشێ بە ئادەمیزاد.

لە کۆتایی‌دا لە بارەی سوودی نوێژی هەینی و مەرجەکانی ئەمانەی خوارەوە ڕوون ئەکەینەوە.

١- سوودی نوێژی هەینی: نوێژی هەینی بە کۆمەڵ کراوە بە دەستوور بۆ باوەڕداران.بۆ ئەوەی یەك بناسن و چاکە لەگەل یەکتری بکەن. بە ئازار و ناتەواوی یەکتری بزانن و، بۆ ئەوەی جیاوازی کۆمەڵایەتی لە ناویانا نەمێنێ، موسڵمانان هەموویان بە پێوە بووەستن شان بەشانی یەکتری، سەرۆکی دانیشتووان لە تەنیشتی یەکێ لە ئەندامانی گەل بووەستێ، سامانداری لای هەژار، سپی لای ڕەش و سوور و زەرد، بەندە و سەربەست بەبێ شەرم لەلای یەکتری‌یەوە بووەستن، ئەو شتانە بۆمان ڕوون ئەکەنەوە کە ئیسلام داوای برایەتی و یەکسانی و ئاشتی ئەکا بۆ هەموو ئادەمیزاد، پیر و جوان ئەبنە خاوەنی ڕێزی خۆیان، ترس ئەخەنە دڵی دوژمنانی خۆیان.

٢- باسی ڕێز و گەورەیی ڕۆژی هەینی: فەرموودەی پێغەمەر زۆرن لە بارەی گەورەیی ڕۆژی هەینی، ئێمە بۆمان ناگونجێ باسی هەموو ئەو فەرموودانە بکەین. بەلاّم مشتێ نموونەی خەروارێکە: ئەبو هورەیرە ئەڵێ: نێراوی خودا فەرمووی: چاکترین ڕۆژێ خۆر بەسەریا هەڵهاتبێ ڕۆژی هەینییە، ئادەم لە ڕۆژی هەینی خودا درووستی کردووە، هەر لە هەینیدا چووەتە ناو بەهەشت، لە ڕۆژی هەینیدا لە بەهەشت دەرکراوە بۆ سەرزەوی و بۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی، لە هەینیدا کۆتایی بە جیهان دێ، لە ڕۆژی هەینیدا کاتێ هەیە، بەندەی موسڵمان لەو کاتەدا نوێژی هەینی بکات، داوای هەرشتێ لە خودا بکات خودا بەوی ئەبەخشێ.

٣- باسی گوناه لەسەر نەکردنی ڕۆژی هەینی، لەو بارەوە فەرموودەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ زۆرن: ترموزی لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە ئەڵێ: پێغەمەر فەرمووی بەو کەسانە لە نوێژی هەینی دوائەکەون، نیازم وایە فەرمان بدەم بە پیاوێ پێش نوێژی هەینی بکات بۆ نوێژکەران و، دووایی خۆم بڕۆم خانووی ئەو کەسانە دوا ئەکەون بسوتێنم و بیڕوخێنم بەسەریانا.

٤- نوێژی هەینی بە گوێرەی فەرمانی قورئان و فەرموودەی پێغەمەر و بڕیاری گشتی موسڵمانان پێویست کراوە لەسەر هەموو کەسێ سەربەست و ژیر و باڵغ بێ، دانیشتووی ئەو جێگەیەبێ کە نوێژی هەینی تێدا ئەکرێ، ئەگەر بیانووی یاسایی نەبێ، هەرکەسێ نوێژی هەینی نەکا و، بە بێبیانووی یاسایی، ئەبێتە جێگەی هەڕەشەی خودای مەزن. منداڵ و شێت و ژن و بەندە و نەخۆش و خاوەنی بیانون نوێژی هەینییان لەسەر پێویست نەکراوە، کەسێ ئەوەندە دووربێ گوێی لە بانگی نوێژ نەبێ و کۆچەری ڕێبوار نوێژی هەینییان لەسەر نییە، دانیشتووی دێهات لای حەنەفی نوێژی هەینییان لەسەر پێویست نییە، لای حەنەفییەکان پێویستە کاربەدەستان دەستوور بدەن بە کردنی نوێژی هەینی و کاربەدەستان ئامادەبن بۆ نوێژکردن لەگەڵ دانیشتووانا. بەلاّم لەلای شافیعییەکان لە شار و لە گوندەکاندا پێویستە نوێژی هەینی بکرێ، ئیتر کاربەدەستان فەرمان بە کردنی بدەن یا نەیدەن، بەو مەرجانەی بۆی دانراوە.

٥- هەرکەسێ بیانووی هەبێ، وەك نەخۆشی و بەخێوکردنی نەخۆشێ، یا ترسی هەبێ لە خاوەن قەرز و نەیبێ بیداتەوە، یا بترسێ لە کاربەدەستێکی ستەمکار، یا ڕەشەبا و بەفر و باران پەیدابێ لە ڕێگەیدا، لەو کاتانەدا نوێژی هەینی پێویست نییە.

٦- ژمارەی ئەو کەسانەی پێویست بێ ئامادەی نوێژی هەینی بن، هەتا نوێژەکە درووستبێ (٤٠) کەسە، بەو مەرجەی سەربەست و ژیر و باڵغ و دانیشتووی ئەو جێگەیەبن، لە هەموو وەرزەکاندا کۆچ نەکەن لەو جێگەیە، مەرجە لە یەك جێگەدا نوێژی هەینی بکرێ مەگەر لە یەك جێگەدا نوێژکەران جێگەیان نەبێتەوە. بەلای هەندی لە زانایانی شافیعییەکانەوە بە (١٢)

کەس نوێژی هەینی درووستە، وەك لە کاتی ماناکردنی ئایەتی (١٠)ی ئەم سوورەتە باسمان کرد لەلای هەندی لە حەنەفییەکان بە چوار کەس و کاربەدەست، بەلای ئەبویوسفەوە بە (٣)ی کەس و کاربەدەستەوە، لای ئەلحەسەن بە (٢) کەس، هەر نوێژی بە کۆمەڵ بە نوێژی هەینی درووستە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: دوای لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان پێویستە نەچنە دەرەوەی جێگەی دانیشتنی خۆیان هەتا نوێژی هەینی دەکەن مەگەر لە ڕێگەدا بۆی بلوێ نوێژەکەی بکا، ئەوەی ڕاستیبێ پێویستە دوای ڕۆژبوونەوە نابێ بچنە دەرەوە.

٧- ژمارەی ڕکاتی نوێژی هەینی (٢) ڕکاتە و بەس، پێویستە پێش کردنی نوێژی هەینیدوو خوتبە بخوێنرێتەوە لە نێوانیان ئەو کەسەی خوتبەکان ئەخوێنێ دانیشتنی ماوەیەکی کەم، پێویستە لە خوتبەی یەکەمدا ڕستەی (الحمد لله والصلاه علی محمد) سپاردە بەتەقوا ئایەتی لە قورئان بخوێنرێلە خوتبەی دووەمدا هەروەك خوتبەی یەکەم وایە. بەلام پێویستە پاڕانەوە لە خودا بکرێ بۆ موسڵمانان و بۆ سەرکەوتنیان لە هەردوو جیهاندا.

٨- نوێژی هەینی لە مەکە پێویست کراوە، لەبەر ئەوەی ژمارەی نوێژکەرانی پێویست تەواو نەبووە و، موسڵمانان بە نهێنی پەرستنیان ئەکرد. مەرجی کردنی نەگونجاوە. بەلام لە مەدینە ئەو بیانوویەیان نەماوە، بۆیە کردنی نوێژی هەینی جێگەی خۆی گرت و بە ئاشکرایی نوێژی هەینییان کرد. خودا یارمەتیمان بدات.

# ﴿ سورەتی ئەلمونافیقین ﴾

لە مەدینە هاتووتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (١١) ئایەتن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُوا۟ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ
إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ﴿١﴾
ٱتَّخَذُوٓا۟ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟
يَعْمَلُونَ ﴿٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ
فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٣﴾ ۞ وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ
وَإِن يَقُولُوا۟ تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ يَحْسَبُونَ كُلَّ
صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ هُمُ ٱلْعَدُوُّ فَٱحْذَرْهُمْ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٤﴾
وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ لَوَّوْا۟ رُءُوسَهُمْ
وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٥﴾ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ
أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ إِنَّ
ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٦﴾

ئیسلام تووشی ناهەمواریەکی زۆر بووبو لە مەدینە بەهۆی کۆمەڵێ لە دووڕووەکان، بە ڕواڵەت باوەڕیان دەرئەخست، لە دڵیانەوە بێ باوەڕبوون، ئەو کەسانەش بە وێنەی عبداللە ی کوڕی ئوبەی کە لەشێکی گەورەی ڕێك و پێکیان هەبوو، خاوەنی زمانێکی پاراو و لووس بوون، ئەهاتنە ناو کۆڕی باوەڕدارانەوە، سەرنجی پێغەمەریان بۆلای خۆیان ڕائەکێشا، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ گوێی لێ ئەگرتن، خوای گەورە نیاز و مەبەستی ئەوانی ڕوون کردەوە، فەرمووی:

﴿ بسم الله الرحمن الرحیم ﴾

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ﴾ هەر کاتێ دووڕووەکان دێن بۆلای تۆ ئەڵێن: ئێمە شایەتی ئەوە ئەدەین کە تۆ نێردراوی خودای. بە دەم خۆشەویستی تۆو و باوەڕ دەرئەبڕن.

﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ﴾ وە خودا ئەزانێ بە ڕاستی تۆ نێردراوی خودای و، خودا شایەتی ئەدا بە ڕاستی ئەو دووڕووانە درۆ ئەکەن، ئەڵێن: تۆ نێردراوی خودای، ئەوان بە ڕواڵەت ئیسلامەتی دەرئەبڕن، لە دڵیانا بێباوەڕییان پەنهان داوە، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەیزانی ناوەڕۆکی مەبەستی ئەوان چ شتێکە؟ بەڵام فەرمانی پێدرابوو، بە گوێرەی دەرکەوت کار بکا لەگەڵ ئادەمیزاددا.

ئەیفەرموو: (من فەرمانم پێدراوە جەنگ بکەم لەگەڵ بێ باوەڕان هەتا ئەڵێن: (لا إلە الا الله محمد رسول الله) کە ئەوەیان ووت، گیان و دارایی ئەوان ئەپارێزرێت، پرسیار کردن لەوان هەواڵەی خودایە).

﴿اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ ئەو دوو ڕووانە سوێندەکانی خۆیانیان کردووە بە سپێر و قەڵغان بۆ پاراستنی خۆیان لە کوشتن و دیل کردن و، بۆ پاراستنی دارایی خۆیان، دوایی بەو بۆنەوە لایانداوەکەسانێ ویستوویانە موسڵمان بین لە ڕێگەی ئایینی خودا و نەیان هێشتووە موسڵمان بن، بە ڕاستی ئە دووڕووانە شتێ کردوویانە خراپە و بێ فەرمانی خودایە.

ئەو دووڕووانە نەوەك خۆیان لایاندا لە ڕێگەی ئایینی خودا، گومانیان خستە دڵی ئەو کەسان ئەیان ویست موسڵمان بن و لایان ئەدان لە ئایینی خودا، زۆرجاران نیازی خراپی ئەوان دەرئەکەوت لە دژی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾. هەر کاتێ ئەو نیازەیان دەربکەوتایە باوەڕهێنانیان ئەکرد بە سپێر بۆخۆیان، لە ژێرەوە پیلانیان ئەگێڕا.

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴾ ئەو شتانەی ڕابوردن لە کردەوە و ڕەوشتی ئەو دوو ڕوانە بەهۆی ئەوەوە بیروباوەڕەیان هێنابوو، بە باوەڕدار ئەناسران، لە پاشانابێ باوەڕ بونەوە دوای مۆردرا بە سەر دڵیانا باوەری تێ نەڕوا دوای ئەو دووڕدانە پاکی ئاین و ڕاستی باوەڕ نازانن مەبەست لە (امنوا) یانی باوەڕ هێنانی ئەوان ئەوەیە لە ناودانیشتودابەباوەڕدار دەناسرێن . ئەگینا ئەو دوو ڕوانە هەرگیز باوەڕیان نەهێناوە.

﴿وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ وَإِن يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ﴾ وە هەرکاتێ تۆ ئەو دووڕووانەت ئەبینی لەشی قەڵەو و جوان و بەدەنیان تۆی ئەهێنایە سەرسوڕمانەوە، بەلاتەوە چاکبوون و، ئەگەر گفتوگۆ بکەن تۆ گوێ لە گفتوگۆکانیان ئەگری و بەلاتەوە شیرین و خۆشە.

﴿كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ﴾ ئەو دوو ڕووانە بە وێنەی پەیکەرێکی لە دەرەخت درووستکراون، پاڵیاندرابێ بە دیوارێکەوە، چونکە بۆشن لە زانست و زانیاری،

بەڵام ئەخۆن و ئەخۆنەوە، ئەوەندە ترسنۆکن گومان ئەبەن هەموو دەنگی پەیدابێ بە زیان ئەکەوێتە سەر ئەوان و، هەر ڕووداوێ بڵاوبێتەوە وا ئەزانن دژی ئەوانە، سەرەڕای ئەو ترسەیشە نیازیان پیس و خراپە.

﴿هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾ ئەو دووڕووانە دوژمنی سەرسەختی تۆن و، دوایی تۆ خۆت لەوان بپارێزە و هۆشیاری خۆت بە، ئەوان سیخوڕی ئێوەن، نهێنییەکانی ئێوە بڵاوئەکەنەوە. خودا دووریان بخاتەوە لە بەزەیی و لەناویان ببا، چۆن لایانداوە لە ڕاستی و لە باوەڕهێنان.

هەموو ئەو کارە خراپانەی باسیانکرابوو دووڕووانی سەردەمی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ پڕبەپێستی بەکرێگیراوانی ئەم سەردەمەی ئێمەشن، کە پیلان ئەسازێنن لەگەڵ دوژمنانی ئایین و نیشتمان و برابێ ئابڕووی خۆیانا، لە دژی نەتەوەی خۆیان و هاونیشتمانانی خۆیان و، ئەبنە سیخوڕ بۆ گەلی خۆیان، ئەبێ چ تاوانێ لەوە گەورەتربێ کە مرۆڤ خراپە بکا لەگەڵ هاوئایین و نیشتمانی خۆیا.

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ﴾ ئەوانە لایانداوە لە چاکە و، هەرکاتێ بێژرابێ بەو دووڕووانە : ئێوە وەرن بۆلای نێردراوی خودا، داوای لێخۆشبوونی گوناهەکانتان بۆ بکا، ئەو دووڕووانە سەری خۆیان وەرئەچەرخێنن و ڕوو وەرئەگێڕن، گاڵتەیان بەو کارە دێ، واز لەو چوونەی لای تۆ ئەهێنن و،

﴿وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ﴾ وە تۆ ئەو دووڕووانە ئەبینی واز لە داوای لێخۆشبوونی تۆ ئەهێنن و، خۆیان لەوە بە گەورەتر دائەنێن و پەشیمان بنەوە و داوای لێبۆردنیان بۆ بکرێ.

﴿سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ یەکسانە لەسەر ئەو دووڕووانە، تۆ داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەی یا داوای لێخۆشبوونیان بۆ نەکەی، خودا لەوان خۆشنابێ. بە ڕاستی خودا ڕانومایی تاقمێ ناکا لە پەرستنی خودا دەرچووبن.

هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُوا۟ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّوا۟ ۗ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٧﴾ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ۚ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ

ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُلْهِكُمْ
أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ
ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٩﴾ وَأَنفِقُوا۟ مِن مَّا رَزَقْنَٰكُم
مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَآ أَخَّرْتَنِىٓ
إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠﴾ وَلَن
يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَا ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١١﴾

﴿هُمُ الَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُوا عَلَى مَنْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنفَضُّوا﴾ ئەو دووڕووانە کەسانێکی ئەوتۆن ئەڵێن بە ساماندارانی یاریدەدەرانی پێغەمەر: ئێوە دارایی مەبەخشن بە کەسانێ لای نێرراوی خودان لە کۆچ کەرانی مەکە، هەتا بێ ئومێد بن و، هەتا جوێ ببنەوە لە نێرراوی خودا و وازی لێ بهێنن و، بچنەوە بۆلای هۆزەکانی خۆیان.

﴿وَلِلَّهِ خَزَائِنُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ﴾ ئەو دووڕووانە خەیاڵیان خاوە و، هەموو کلیلەکانی گەنجینەکانی ڕۆزی و دارایی ئاسمانەکان و زەوی بە دەستی توانای خودایە، بەشی ئەکا بەسەر ئادەمیزاددا، بەهەرجۆرێ خۆی ئارەزۆی بکا و، بەڵام دووڕووەکان نازانن و بێئاگان لەوەی هەموو شتێ لای خودایە.

کاتێ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ویستی بچێ بۆ جەنگی (بەنولموستەلیق) کە بەشێ بوون لە هۆزی (خوزاعە) لە نزیکی مەککە کە لایان گرانبوو ئیسلام جێگەی خۆی بگرێ لە ناو نیوەدوورگەی عەرەبدا، پێغەمەر ئەیزانێ هانی دوژمنانی پێغەمەر ئەدەن و، ئەیانەوێ پێغەمەر بکوژن، بۆیە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ پێش دەستی کرد و لە ناوکاودا، پەلاماریدان و موسڵمانان ئەملاولایان گرتن و، لە ئەنجامدا (١٠) کەسییان لێکوشتن، ئەوانی تریان بە دیل گرتن و، لەم جەنگەدا عەبدوڵای کوڕی ئوبەی لە ناو هاوڕێکانی پێغەمەردابوو، بە نیازی ئەوەی بەشی بدەن لە دەستکەوت.

لە کۆتایی جەنگدا عومەری کوڕی خەتتاب پیاوێکی بە کرێ گرتبوو یارمەتی بدا و ئیشی بۆ بکا و، پیاوێ لە کۆچکەران بووبوو بە هەرای لەگەڵ پیاوێکی خەزرەجیدا لەسەر ئاوی کانیاوێ. کوچکەرەکە هاواری برد بۆلای کۆچکەرەکان، پیاوەکەی تر بۆلای مەدینەیییەکان، عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کە ئەم هاوارەی بیست دڵی کوڵاو تەکانی خوارد بە کینەوە لەسەر پێغەمەر و کۆچکەران، ووتی بە دانیشتووانی ئەو کۆچکەرانە لە نیشتمانی ئێمەدا زۆربوون و دارایی ئێمەیان برد بۆلای خۆیان، سوێندم بە خوا: ئەگەر چووینەوە بۆ مەدینە، ئێمەی بە دەستەڵات و گەورە، ئەم کۆچکەرە بێ نرخانە لە مەدینە دەر ئەکەین، پێغەمەر﴿ﷺ﴾ ئەوەی

عەبدوڵڵا ووتبووی بیستی‌یەوە، عومەری کوڕی خەتتاب لە خزمەتیا بوو، زۆر تووڕە بوو: ووتی بە پێغەمەر با بیکوژم، چۆن ئەبێ دانیشتووان بڵێن: موحەمەد هاوڕێکانی خۆی ئەکوژێ؟ عەبدوڵای کوڕی عەبدوڵای ئاوناوی کە موسڵمانێکی زۆر ڕاست بوو کە بەڵگەی بێ باوەڕی و دووڕوویی کۆبوویەوە لەسەر باوکی ووتی: ئەی پێغەمەری خودا دەستوورم پێ بدە با باوکم بکوژم. من ئەترسم پیاوێ تر بیکوژێ و من خۆمم پێ نەگیرێ ، موسڵمانێك لە تۆڵەی بێباوەڕێکا بکوژم و بچمە دۆزەخەوە، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ئێمە نای کوژن و بە باشی کاری لەگەڵ ئەکەین هەتا لە ناو ئێمەدابێ. بەو بۆنەوە، خودا فەرمووی:

﴿يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ﴾بێ باوەڕان ئەڵێن: بە ڕاستی ئەگەر ئێمە لە دوای جەنگ گەڕاینەوەبۆلای مەدینە، بە ڕاستی ئێمەی گەورە و بە توانا ئەو کۆچکەر و لاواز و بێ نرخانە لە مەدینە دەرئەکەین.

﴿وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ وە هەر بۆ خودا و نێردراوی خودایە و بۆ باوەڕدارانە گەورەیی دەستەڵات و ، بەڵام دووڕووەکان ئەو گەورەیی و دەستەڵاتانەی ئەوان نازانن و، خودا باوەڕداران سەر ئەخا و، دووڕووان ڕسوا ئەکا و، یارمەتی ئایینی ئیسلام ئەدا.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: دارایی و منداڵەکانتان ئێوە بێئاگا و خەریك ئەکا لە یاد و پەرستنی خودا و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خودا، دوایی ئەو کەسەی ئەو کارە بکا و دارایی و منداڵەکانی بێ ئاگای بکەن لە پەرستنی خودا تووشی زیان ئەبێ لە هەردوو جیهاندا.

﴿وَأَنفِقُوا مِن مَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ﴾ وە ئێوە هەندێ لەو شتەی ئێمە بە ئێوەمان بەخشیوە بیدەن لە ڕێگەی ئایینی خودادا و بیدەن بە هەژاران لە پێش ئەوەی بێت بۆلای یەکێ لە ئێوە نیشانەی مردن.

﴿فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَا أَخَّرْتَنِي إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ الصَّالِحِينَ﴾ دوایی ئەو کەسە بڵێ: ئەی پەروەردگاری من: بۆ تۆ مۆڵەتی منت نەدا بۆلای ماوەیەکی کەم و نزیك، دوایی دارایی خۆمم دابنایە لە ڕێگەی ئایینی تۆدا و، من ببومایە لە پیاوچاکان و ئەوەی لە کیسم چووبوو بەسەرم بگرتایە.

﴿وَلَن يُؤَخِّرَ اللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَاء أَجَلُهَا وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ وە خودا مۆڵەتی هیچ کەسێ نادا، ئەی مرێنێ کاتی کۆتایی تەمەنی هات بۆلای و، خودا ئەزانێ بە شتێ ئێوە ئەیکەن. کەواتە ئێوە ئەو هەلە لە کیسی خۆتان مەدەن و دارایی خۆتان دابنێن لە ڕێگەی ئایینی خودا و هەتا نەمردوون و پەشیمان ببنەوە.

# ﴿ سورەتی تەغابوون ﴾

زۆربەی زۆری زانایان لایان وایە لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە، هەندێ لە زانایان ئەڵێن: لە مەککە هاتووەتە خوارەوە، جگە لە ئایەتی (١٤-١٥-١٦-١٧-١٨) ژمارەی ئایەتەکانی (١٨) ئایەتن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ لَهُ ٱلۡمُلۡكُ وَلَهُ ٱلۡحَمۡدُۖ
وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ (١) هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ فَمِنكُمۡ كَافِرٞ
وَمِنكُم مُّؤۡمِنٞۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ (٢) خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ وَصَوَّرَكُمۡ فَأَحۡسَنَ صُوَرَكُمۡۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ (٣)
يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَيَعۡلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعۡلِنُونَۚ وَٱللَّهُ
عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ (٤) أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَبَؤُاْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبۡلُ
فَذَاقُواْ وَبَالَ أَمۡرِهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ (٥) ذَٰلِكَ بِأَنَّهُۥ كَانَت تَّأۡتِيهِمۡ
رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَقَالُوٓاْ أَبَشَرٞ يَهۡدُونَنَا فَكَفَرُواْ وَتَوَلَّواْۚ وَّٱسۡتَغۡنَى
ٱللَّهُۚ وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٞ (٦)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ هەموو شتێ لە ئاسمانەکان و زەوی‌دان، پاکی و دووری لە شتی ناشایستە دەرئەبڕن بۆ خودا، هەریەکەیان بەو زمانە تایبەتی‌یە خودا بەوانی بەخشیوە، هەر بۆ خودایە پاشایەتی و خاوەنی‌یەتی ئەو شتانەی لەناو ئەواندان و بە گوێرەی ویستی خۆی ئەیانبا بەڕێوە، هەر بۆ خودایە سوپاس و ستایش لەسەر چاکەکانی و، خودا توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە.

ئادەمیزاد لای ئایینی ئیسلام خاوەنی سەربەستی و ویستی خۆیەتی، مرۆڤایەتی بێ سەربەستی نابێ، کەواتە خۆیان لە خۆیانەوە بۆیان هەیە باوەڕهێنان یا بێباوەڕی بۆ خۆیان هەڵبژێرن، ئیتر دایك و باوکییان بێ باوەڕبن یا باوەڕدار بن، هیچ کەسێ زۆری لێ ناکرێ بۆ هەڵبژێرراوی خۆی، ئەگەر بەوجۆرە نەبێ داوالێکردن و پرسیار و پاداشت پوچ و بێ سوود ئەبێ، دوای ئەوەی خودا ئەو سەربەستییەی پێ بەخشیون، بۆ هەڵبژاردنی باوەڕهێنان و بێباوەڕی خۆیان، ئەقڵ و هۆی داونەتێ خۆیان بەرپرسیارن، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوباسانە خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ خودا کەسێکی ئەوتۆیە ئێوەی درووست کردووە بە سرووشتێکی پاك و خاوێن و، بە خاوەنی ئەقڵ و سەربەستی، بە جۆرێ ئێوەە بتوانن بە ویستی خۆتان کارێ بۆ خۆتان هەڵبژێرن، دوایی هەندێ لە ئێوە بە ویست و ئارەزۆی خۆتان باوەڕ ناهێنن و، هەندێ تر لە ئێوە باوەڕئەهێنن بە خۆشی و ئارەزۆی خۆتان، خودا ئاگادارە و ئەزانێ بە شتێ ئێوە بیکەن.

﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾ خودا ئاسمانەکان و زەوی درووستکردووە بە ئەوپەڕی زانست و توانای ڕاست و بێگومانەوە، بە جۆرێ ئەو توانایە ئەبینرێ لە درووستکردنی ئێوەدا، دوایی ئێوە شێوە و ڕەنگتان جیاوازە، هەروەك بیر و باوەڕتان جیاوازە و، خودا ئێوەی درووستکردووە بە شیرینترین ڕەنگ و شێوە، بە جۆرێ لە هەموو بوونەوەرانی تر جوانترن، دوایی یا ئادەمیزاد خۆی وا لێ بکا شایستەی بێ بە خزمەت خودا بکا بە دڵێکی پاك و بیروباوەڕێکی شیرین بە وێنەی جوانی شێوەی خۆی، خۆی ناشیرین نەکا بە جۆرێ شایستەی ئەوەی نەبێ بە خزمەت خودا بگا و، هەر بۆلای خودایە گەڕانەوەی ئێوە.

﴿يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ و مَا تُعْلِنُونَ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ خودا ئەزانێ بە شتێ لە ئاسمانەکان و زەوی‌دان. ئەزانێ بە شتێ ئێوە پەنهانی ئەدەن و بە شتێ ئێوە دەری ئەخەن و، خودا ئەزانێ بە شتێ لە دڵی ئێوەدایە لە نیازی پاك و خراپ.

﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَبْلُ فَذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئایا ئێوەی بێباوەڕانی قوڕەیش بە موحەمەد، هەواڵ و بەسەرهاتی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنابوو بە پێغەمەرەکانی خۆیان لەمەوپێش نەهاتووە بۆلایان، لە تاقمەکانی نوح و هوود و صالح، دوایی سزای کردەوەی خراپی خۆیانیان لە جیهاندا چەشتبوو، بە خنکانیان بە لافاو و، بە بایەکی سەخت و بە بارینی بەردەباران بەسەریانا و، بنەبڕبوون و، بۆیشیان هەیە سزایەکی زۆر ئازاردەر لە پاشەڕۆژدا.

﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَقَالُوا أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا فَكَفَرُوا وَتَوَلَّوا وَّاسْتَغْنَى اللَّهُ وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ ئەو سزا و تۆڵانە تووشی ئەوتاقمانەی پێشووبوو، بە ڕاستی بەهۆی ئەوەوەبوو، پێغەمەرەکانیان بە چەندین بەڵگە و کاری پەکخەرەوە چووبوون بۆلایان، دوایی ووتیان: ئایا چۆن ئەبێ ئادەمیزادێ ڕانومایی ئێمە بکا و ببێ بە پێغەمەرمان، دوایی باوەڕیان پێ‌نەهێنان و، وازیان لە بیرکردنەوەی ئەو کارانە هێنا پێغەمەرەکانیان هێنابوویان بۆلایان و، خودا پێویستی بە باوەڕهێنانی ئەوان پێویستی بە هەموو شتێ نیە خودا پێوستی بە پەرستنیان نی‌یەسوپاس بۆکراوە لە هەموو کارەکانیا.

زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي
لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿٧﴾ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ
وَرَسُولِهِۦ وَٱلنُّورِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلۡنَاۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿٨﴾ يَوۡمَ
يَجۡمَعُكُمۡ لِيَوۡمِ ٱلۡجَمۡعِۖ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلتَّغَابُنِۗ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعۡمَلۡ
صَٰلِحٗا يُكَفِّرۡ عَنۡهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا
ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٩﴾
وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ
ٱلنَّارِ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٠﴾ مَآ أَصَابَ مِن
مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ يَهۡدِ قَلۡبَهُۥۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ
شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿١١﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَۚ فَإِن
تَوَلَّيۡتُمۡ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٢﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ
إِلَّا هُوَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١٣﴾

﴿زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ وَذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ لە دانیشتووانی مەککە باوەڕیان نەهێناوە گومانیان وایە کە زیندوو ناکرێنەوە، دوای مردنیان لە پاشەڕۆژدا، تۆ بڵێ: سوێندم بە پەروەردگاری خۆم، بەڵێ: ئێوە زیندوو ئەکرێنەوە، لە پاشانا هەواڵ ئەدرێ بە ئێوە بە شتێ ئێوە کردووتانە لە جیهاندا و، ئەو زیندووبوونەوەیە زۆر ئاسانە لەسەر خودا.

﴿فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالنُّورِ الَّذِي أَنزَلْنَا وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ دوایی ئێوە باوەڕبهێنن بە خودا و بە نێردراوی خودا و بەو ڕووناکییەی ئەوتۆ ئێمە ناردوومانەتە خوارەوە بۆ سەر موحەمەد کە بریتییە لە قورئان، خودا ئاگادارە بە شتێ ئێوە ئەیکەن، پاداشتی وەرئەگرن.

پرسیار: پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ داوا لە بێ باوەڕان ئەکات بۆ باوەڕهێنان بە زیندووبوونەوە و،

فەرمووی: زیندووبوونەوە هەیە، بە گوێرەی یاسا ئەبێ داوای شایەت هێنانی لێ بکرێ نەك سوێند خواردن، لەبەر چ شتێ سوێندی خوارد؟

وەڵام: خودای مەزن لە بێباوەڕانەوە ئەگێڕێتەوە: داوایان لە پێغەمەر کرد هەواڵیان بداتێ ئایا زیندووبوونەوە هەیە و، ئەیان ووت ئێمە بڕوامان بە زیندووبوونەوە نییە، بڕوایشیان وابوو پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ سوودی ئەوانی ناوێ. بەڵکو ئەیەوێ خۆی بکا بە گەورەیان. کەواتە پێغەمەر داوای لێ‌کراوە، مافی خۆیەتی سوێند بخوا و، بێباوەڕان داوا لێ‌کراون و مافی ئەوانە شایەت بهێنن.

﴿يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ الْجَمْعِ ذَلِكَ يَوْمُ التَّغَابُنِ﴾ وە ئێوە بیری ئەو ڕۆژە بکەنەوە خودا ئێوە کۆئەکاتەوە لە ڕۆژی دووایی‌دا ڕۆژێکە هەموو ئادەمیزادی ڕابردوو و داهاتوو، دانیشتووانی ئاسمانەکان و زەوی کۆ ئەکرێنەوە، ئەو ڕۆژە ڕۆژی لە کیس چوونی ڕۆژێکە ئادەمیزاد هەندێکیان زیان ئەدەن لە هەندێ تریان، لەبەر ئەوەی باوەڕداران لە بەهەشتا ئەچنە جێگەی بێباوەڕان و، بێباوەڕانیش لە دۆزەخدا ئەچنە جێگەی باوەڕداران، ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ هەموو کەسێ دوو جێگەی بۆ دانراوە، یەکێکییان لە بەهەشتا، ئەوی تریان لە دۆزەخدا، زیانی گەورەترە ئەوەی جێگەی خۆی لە کیس بچێ لە بەهەشتا، ڕۆژێکە ستەم لێ‌کراوان قازانج ئەکەن، ستەمکاران تووشی زیان ئەبن.

﴿وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ وَيَعْمَلْ صَالِحًا يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ وە هەرکەسێ باوەڕی بە خودا هێنابێ، کردەوەی چاك بکات، خودا، خراپە و گوناهەکانی دائەپۆشێ، ئەی‌سڕێتەوە لە نامەی کرداریا، ئەیخاتە ناو چەندین بەهەشت ئەڕوا بە ژێر درەختەکانیا و ئەملاولای کۆشکەکانیان چەندین ڕووباری ئاوی شیرین و پاك، لە ناو بەهەشت دایە هەتا هەتایە، سڕینەوەی گوناهەکانیان و چوونیان بۆ ناو ئەو بەهەشتانە سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیە و ڕزگاربوونە.

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ خَالِدِينَ فِيهَا وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە و، ئایەکانی نامەی ئێمەیان بە درۆخستووەتەوە، ئەو کەسانە یار و دانیشتووانی ناو ئاگرن، بەردەوامن لە ناو ئاگردا و، ئاگر خراپترین جێگەی گەڕانەوەیە بۆ ئەوان.

﴿مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ ئادەمیزاد تووشی هیچ ئازارێ نابێ لە نەخۆشی و مردن و هەژاری لە خۆیان و لە منالەکانیانا مەگەر بە دەستوور و فەرمانی خودا و، هەرکەسێ باوەڕی بە خودا هێنابێ، خودا ڕانوومایی دڵی ئەو کەسە ئەکا بۆلای باوەڕهێنان و، یارمەتی ئەدا و، خودا ئەزانێ بە هەموو شتێ لە چرکەی دڵ و دەماری خوێن.

﴿وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَإِنَّمَا عَلَى رَسُولِنَا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ﴾ وە ئێوە پەیڕەوی فەرمانەکانی خودا بکەن و پەیڕەوی گفتوگۆی نێردراوی خودا بکەن بۆ ڕاگەیاندنی فەرموودەکانی خودا، دوایی ئەگەر ئێوە واز لە پەیڕەوی خودا و نێردراوی خودا بهێنن، دوایی بە ڕاستی نێردراوی ئێمە هەر ڕاگەیاندنی فەرموودەی خودای لەسەرە بە ئاشکرایی، پرسیار و پاداشت لەسەر ئێمەیە.

﴿اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ خودا کەسێکی ئەوتۆیە هیچ پەرستراوێ شایستەی پەرستن نییە جگەی ئەو خودایە تاك و تەنهایە و، باوەڕداران هەر پشت بەو خودایە ئەبەستن و، هەموو کارێکی خۆیان هەواڵەی لای ئەو ئەکەن.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنْ أَزْوَٰجِكُمْ وَأَوْلَٰدِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَٱحْذَرُوهُمْ وَإِن تَعْفُواْ وَتَصْفَحُواْ وَتَغْفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ وَٱسْمَعُواْ وَأَطِيعُواْ وَأَنفِقُواْ خَيْرًا لِّأَنفُسِكُمْ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٦﴾ إِن تُقْرِضُواْ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَٰعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَٱللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٧﴾ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٨﴾

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: بە ڕاستی هەندێ لەژنەکانتان و منالەکانتان دوژمنی ئێوەن و، نایەڵن ئێوەی موسڵمان کۆچ بکەن بۆلای نێردراوی خودا لە مەکەوە بۆ مەدینە، دوایی ئێوە خۆتان بپارێزن و ئاگاداری پیلانی ئەوان بن.

هەرچەندە ئەو ئایەتە پەیوەندی هەبوو بە ڕووداوێکی ئەو کاتەوە، بەڵام مەبەستەکە هەموو کەسێ ئەگرێتەوە. هەر ژنێك و هەر منداڵێك یارمەتی مێرد و باوکیان نەدەن بۆ چاکەی هەردوو جیهان، دوژمنی مێرد و باوکیانن، هەروەها هەموو خزمێکیش ئەگەر یارمەتی خزمی خۆی نەدا بۆ سوودی هەردوو جیهان دوژمنی ئەو کەسانەی خۆیەتی، ئەوە لە لایەکەوە و لە لایەکی تریشەوە، هەرکەسێ ژنی هێنا، وەك ئەو کەسە وایە بمرێ و کۆچی دوایی بکا لە جیهاندا، یا بۆلای بەهەشت یا بۆلای دۆزەخ، وەك ئەبینرێ زۆر پیاوان ئەڕۆن بۆلای دۆزەخی جیهان، چونکە ژیانی ئەم سەردەمە لەگەڵ زۆرترین ژن و منداڵدا لە ئازار و سزا و دۆزەخدا ئەژی، ئەوەتا منداڵ و ژن لە مرۆڤ ڕازی نابن، مەگەر ملکەچی ئەوانبێ و پەیڕەوی ئەوان بکا.

﴿وَإِن تَعْفُوا وَتَصْفَحُوا وَتَغْفِرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ وە ئەگەر ئێوە لە بێ ڕەوشتی و ئازاردانی ژن و منداڵەکانتان ببورن و، واز لەوان بهێنن و تۆڵەیان لێ نەکەنەوە، لەوان خۆشبن و خراپەکانیان داپۆشن و، دوایی بە ڕاستی خودا لێخۆشبوونی زۆرە، زر میهرەبانە هەر بەو جۆرەی ئێوە لەوان ئەبوورن، خودایش لە ئێوە ئەبوورێ، ئەو ئایەتە ئەوەمان فێر ئەکا، ژیانی ناو خێزان و بنەماڵە، بە بێ ئارامگرتن و لێبوردن ناچێتە سەر لە زۆر جاراندا، ئەگەر مرۆڤ پرسیاری هەموو کردەوە و گفتوگۆیە بکا لە ژن و لە منداڵ، دژایەتی و دوژمنایەتی و گیروگرفت زۆرتر ئەبێ و، ژیان لە دۆزەخدا ئەباتە سەر. کەواتە پێویستە بە گوێرەی توانا لەگەڵیاندا بژیت.

﴿إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ وَاللَّهُ عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾بە ڕاستی دارایی و منداڵەکانی ئێوە تاقیکردنەوەن بۆ ئێوە، هەتا دەریکەوێ بۆ دانیشتووان، چ کەسێ لە ئێوە ڕاستی مەبەستە بۆ خۆی هەڵبژێرێ و، ڕێزیان بەسەر چ شتێکا ئەدا، چ کەس خودای لەوان خۆشتر ئەوێ، لای خودا هەیە پاداشتێکی زۆر گەورە بۆ ئەو کەسانە ڕێزی پەرستنی خودا و، خۆشەویستی خودای مەبەسترە لە دارایی و منداڵ. بە کورتی منداڵ و دارایی و ژن پلەوپایە و زانیاری ئینسانیان پێ تاقی ئەکرێتەوە، خۆشی و ڕابواردنی جیهان هەرچەندە زۆر گەورە بن بەرانبەر بەو شتانەی لای خودان زۆر زۆر پوچ و بێنرخن، چونکە ئەوانەی جیهان بەردەوام نین.

﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا وَأَنفِقُوا خَيْرًا لِّأَنفُسِكُمْ﴾ دوایی ئێوە بە گوێرەی توانای خۆتان لە خودا بترسن و خۆتان لە بێ فەرمانی خودا بپارێزن لە بەکارهێنانی دارایی خۆتان و لە کاری خراپدا دای مەنێن، ئامۆژگاری خودا ببیسن و، پەیڕەوی فەرموودەکانی خودا بکەن و، دارایی خۆتان ببەخشن لە ڕێگەی ئایینی خودادا، ئەو بەخشینە ئەبێ بە چاکە بۆ ئێوە لە هەردوو جیهاندا.

﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ وە هەرکەسێ خۆی لە ڕژدی و بەرچاو تەنگی خۆی بپارێزێ، لە بەخشینی دارایی و زەکات و لە سوودی هەردوو جیهان، دوایی هەر ئەو کەسانە هەر ئەوان ڕزگاریان ئەبێ لە سزای خودا.

﴿إِن تُقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَاعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ئەگەر ئێوە دارایی خۆتان ببەخشن لە کارەکانی چاکەدا، بەو جۆرەی خودا فەرمانی پێداوە، ئەو بەخشینە لای خودا شیرین بێ، خودا پاداشتی ئەو بەخشینەی دارایی خۆتانە ئەداتەوە بە دوو چەنانە و هەتا حەوت سەد چەنانە ئەڕوا و، خودا لە ئێوە خۆش ئەبێ. یانێ هەرکەسێ دارایی خۆی ببەخشێ لە بەر فەرمانی خودا، وەك ئەوە وایە قەرزی دابێ بە خودا، خودایش قەرزەکەی بە دوو چەنانە ئەداتەوە و، خودا لە سەر شتێکی زۆر کەم پاداشتی زۆر ئەبەخشێ، زۆر ئارامە و سزای ئەو کەسانە نادا بێفەرمانی خودا ئەکەن بە گورجی، خودا بە شتێ ئەزانێ دیار نییە و پەنهانە و، بە شتێ ئەزانێ لەبەرچاون و ئەبینرێن، خودا زۆر بە توانا و گەورەیە، کەس ناتوانێ ڕێگە لە فەرمانەکانی بگرێ، زۆر زانایە بە هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ.

# ﴿ سورەتی تەلاق ﴾

لـە مەدینە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (١٢) ئایەتن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُواْ
ٱلْعِدَّةَ ۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ ۖ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ
وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ وَتِلْكَ حُدُودُ
ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ ۚ لَا تَدْرِى لَعَلَّ
ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ﴿١﴾ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ
بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُواْ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ
وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤْمِنُ
بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ
مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ
بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ ۚ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا ﴿٣﴾ وَٱلَّٰٓـِٔى يَئِسْنَ
مِنَ ٱلْمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمْ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشْهُرٍ
وَٱلَّٰٓـِٔى لَمْ يَحِضْنَ ۚ وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۚ
وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مِنْ أَمْرِهِۦ يُسْرًا ﴿٤﴾ ذَٰلِكَ أَمْرُ ٱللَّهِ أَنزَلَهُۥٓ
إِلَيْكُمْ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعْظِمْ لَهُۥٓ أَجْرًا ﴿٥﴾

﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ﴾ ئەی پێغەمەر: هـەر کاتـێ ئێوە ژنەکانتان تەلاق دا دوایی ئێوە ژنەکانتان تەلاق بدەن لە کاتێکا شیاوی ئەوەبن بە بێ‌ئەوەی تووشی زیان بن عیدەکانیان هەڵبژێرن، یانێ لە کاتێکا تەلاقیان بدەن پاکبن و، لەو پاکی‌یەدا ژن و مێردیان لەگەڵ نەکرابێ، تەلاقدانی ژنان لە کاتی حەیزدا دژی یاسای ئایینی ئیسلامە چونکـە

عیدەیان درێژە ئەکێشێ و، ئێوە عیدەکانیان بژمێرن هەتا لێتان تێك نەچێ، ژنان ئەگــەر خــاوەنی حەیزبن سێ پاکیە لای شافیعیەکان، بــێ حــەیزە لای حەنەفیــەکان، ئەگــەر حــەیزیان پێــدا نەهاتبێ یا منالّبن یا لـە حەیز کەوتبن سێ مانگە، ئەگەر سکیان پربێ بە دانانی سکەکەیەتی. ژنێ مێردەکەی نەچوبێتە لای تەلاقدانی درووستە لـە حەیزدا و عیدەی لـەسەر نیە.

﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِن بُيُوتِهِنَّ﴾ وە ئێوە لـە خودا بترسن و بێفەرمانی خــودای پەروەردگاری خۆتان مەکەن و، ئێوە ئەو ژنانەی تەلاّقدران لـە خانووەکانی خۆیان کــە لــەواندا دانیشتوون دەریان مەکەن، درووست نیە دەرکردنی ژنی تەلاقدرا و لـە جێگەی ژن و مێردی، بۆ مێرد نیە بە زۆر ئەو ژنە دەربکات، ئەو خانووە جێگەی دانیشتنی ئەو ژنەیــە، هــەتا مــاوەی عیدەکەی تەواو ئەبێ، ئەو ژنە لـە ژێر چاودێری مێردەکەیایەتی هەتا کۆتــایی عیدەکــەی بەســەر ئەچێ.

﴿وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾ وە نابــێ ئــەو ژنانــە تــەلاّقدراون خۆیشیان بچنــە دەرەوە، هەتا عیدەکەیان تەواو ئەبێ مەگەر ئەو ژنە کارێکی خراپی بێزلێکراوە بکا، وەك ئەوەی کاری خــراپ بــە مــێرد و خزمــانی مــێرد بلّــێ، یابــەر لــەوەی تــەلاّقدرابێ مێردەکــەی لـەبــەر بێفەرمانیکردنی ژنەکەی تەلاّق دابێ، یا داوێنپیسی بکا، لـەو کاتانــەدا ژن بــۆی هەیــە بڕواتــە دەرەوە، بۆ پەیداکردنی هۆی ژیان و، بۆ دارلێدانی لـەم کاتی دارلێدانە ئەبرێتــە دەرەوە دوایــی ئەهێنرێتەوە بۆ جێگەی خۆی هــەتا کۆتــایی عیدەکــەی، ئەگــەر ژنــی تــەلاّقدراو بچێتــە دەرەوە گوناهبار ئەبێ. بەلاّم ئەگــەر بیــانووی هــەبێ ئــەتوانێ بچێتــە دەرەوە، وەك ترســی ڕووخــان یــا ئاوبردنی خانووەکەی هەبێ و، ئەبرێ بۆ جێگەیە تر، یا بڕوا بۆ فرۆشتنی ڕیسەکەی یا بۆ کڕینی لۆکە، ژنان بۆیان هەیە بە ڕۆژدا بچنە لای ئەو ژنە تەلاّق دراوانە، دوایی هەریەکــەیان بچنــەوە بۆ جێگەی خۆیان.

﴿وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ﴾ ئەوانەی ئاماژەیان بۆ کرا سنووری دیاریکراو و فەرمانی خودان ئەبێ جێبەجێ بکرێن، دوایی هەرکەسێ لـەو سنوورانە دەرچــێ و نەیان گەیەنێ بە جێگەی خۆیان ستەمیان لـە خۆیــان کــردووە و، خــۆی کــردووە بــە جێگــەی خەشمی خودا.

﴿لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا﴾ تۆی ژن تەلاّقدەر نازانی خودا، دوای تــەلاّقدانی ئەو ژنە خودا چ شتێ پەیدا ئەکا، لـەوانەیە دڵی تۆ بگۆڕێ و ئارەزۆ بکەی ئەو ژنــە بگێڕێتــەوە بۆلای خۆت، ئەگەر جوێ بوونەوەکەی بە تەلاّقی سێبەسێ نەبووبێ.

زانایان بە گشتی پێك هاتوون لـەسەر ئەوەی ژنی تەلاّقدراو بە خۆڕایی و سێبەسێ نەبووبێ، مێردەکەی بۆی هەیە بیگێڕینەوە بۆلای ژن و مێردی، پێویستە مێردەکەی بە خێوی بکــا و، لــە

جێگەیە شیاوی ئەو ژنە دای بنێ هەتا عیدەکەی کۆتایی پێ دێ، ژنی تـەلاقدراو بەسـێ تەلاقـە: بەلای مالیکی‌یەکانەوە ئەگەر سکی پڕ نەبێ جگە لـە دانانی لـە جێگەیە هەتا عیدەی ئەڕوا هیـچ شتێ تر پێویست نی‌یە لـەسەر مێردەکەی، بەلای شـافیعی‌یەکان و حەنبەلی‌یـەکان ئەگـەر سـکی پڕبێ بەخێوکردنی پێویستە لـەسەر مێردەکەی، ئەگەر سکی پڕ نەبێ بەخێوکردنی پێویست نی‌یە، بەلای حەنەفی‌یەکانەوە پێویستە بەخێوبکرێ سکی پڕ بێ یا نە. هەرکەسێ پێویست بێ لـەسـەری بەخێوکردنی ژنی تەلاقدراو، پێویستە لـەسەریشـی لــە خانووەکـەی خـۆی دەری نـەکات هـەتا کۆتایی عیدەکەی، بەو مەرجانەی باسکران.

﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَـهُنَّ فَأَمْسِـكُوهُنَّ بِمَعْـرُوفٍ أَوْ فَـارِقُوهُنَّ بِمَعْـرُوفٍ﴾ دوایـی کاتـێ ئـەو ژنـە تەلاقدراوانە نزیکبوونەوە لـە کۆتایی پێ‌هاتنی عیدەکەیان، دوایی ئێوە سەربەستن ئەتوانن یا بیـان گێڕنەوە بۆلای خۆتان بە نیازی پاك و بە گوێرەی یاسا، ئێوە جوێ ببنەوە لـــەو ژنانـە و وازیـان لێ‌بهێنن هەتا عیدەکەیان تەواو ئەبێ، بە گوێرەی یاسا و، هەموو مافێکی خۆیانیان بدەنێ، دوایـی پەیوەندی ژن و مێردیتان ئەپچڕێ.

﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَـدْلٍ مِّنكُـمْ وَأَقِيمُـوا الشَّـهَادَةَ لِلَّـهِ﴾ وە ئێـوەە دووکەسـی خـاوەن دادی موسڵمان لـە خۆتان و سەربەست بکەن بە شایەت لـەسەر گەڕانەوەیان یا جیابوونەوەیان و، لــە کاتی پێویستی‌دا ئێوە شایەتی‌یەکەتان بدەن مەیگۆڕن لـەبەر ڕەزامەندی خــودا، بتانـەوێ ڕاسـتی دەرکەوێ نەك لـەبەر جگەی خودا.

ئـەو شـایەتی گرتنـە لــە کـاتی گەڕانـەوە و تـەلاقدانـدا پێویسـت نیـە و چاکــەبکرێ لای شافیعی‌یەکان و حەنەفی‌یەکان. بەلای هەندێ لـە زانایانی شافیعی‌یەکانەوە پێویستە شایەت گرتن بۆ گەڕانەوە.

﴿ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَـن يَتَّـقِ اللَّـهَ يَجْعَـل لَّـهُ مَخْرَجًـا﴾ ئـەو شتانەی باســکران لــە بـەخێوکردن و دانـانی ژنـان لــە جێگەیــە و، شـایەتی گرتـن و جگـەی ئەوانەیش، ئامۆژگاری‌یان پێ ئەکرێ بۆ کەسی بــاوەڕ بـە خـودا و بـە ڕۆژی دوایـی بـهێنێ و، هەرکەسێ لـە خودا بترسێ و کار بە فەرمانی خودا بکا و، خۆی بپارێزێ لـە بێ‌فەرمانی خودا و، ژنەکەی نەگێڕاوە بۆلای خۆی، لـە پاشانا ئارەزۆی لـە گەڕانەوەی بـوو، خـودا بـۆ ئـەو کەسـە درووست ئەکات دەرچوون و ڕزگـاربوونی لــەو سـەختی‌یە، بـەو جـۆرەی جـارێ تـر مـارەی بکاتەوە، ئەگەر ئەو ژنە سێ تەلاقی نەکەوتبوو، ئەگەر سێ تەلاقی کەوتبوو، ژنەکە شوێ تر بکا و ژن و مێردی لـەگەڵ بکرێ و، تەلاق بدا و عیدەکەی بڕوا، دواجار مێردە پێشووەکەی مارەی بکاتەوە، خودای گەورە هۆی ژیانێ بۆ ئەسازێنێ، وەك ئەفەرموێ:

﴿وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ﴾ وە خـودا ڕۆزی و هـۆی ژیان ئەبەخشێ بەو کەسەی لە لایەکەوە بە تەمای نەبێ و نەیە بە دڵیــا، هەرکەسـێ پشـت بـە خودا ببەستێ و کار و پێویستی خۆی هەواڵەی‌لای خودا بکا، دوایی خودا بەسە بۆ ئەو کەسـە، و پێویستی بە کەسی تر نابێ.

﴿إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا﴾ بە ڕاستی خودا ئــەگا بـە شـتێ بیـەوێ و مەبەستی خۆی لە دەست دەرناچێ، هەر شتێکی بوێ ئەبێ و، ئەوەی خودا نەیــەوێ نابـێ، بـە ڕاستی خودا دایناوە بۆ هەموو شتێ لە سـەختی و لــە ئاسـانی ماوەیـە و کۆتـایی پـێ دێ، ئـەم بوونەوەرانە بە بێ خاوەن و بە بێ سوود درووست نەکراون.

هەندێ لە زانایان ئەڵێن: هۆی هاتنە خوارەوەی ﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ﴾ هەتا ﴿لَا يَحْتَسِبُ﴾ ئـەوەبوو پیاوێ بە ناوی مالیك لە هۆزی ئەشجەع بت پەرسـتان کوڕێکـی ئـەویان دیـل کردبـوو، هاتـە خزمەت پێغەمەر و وتی: کوڕەکەم گیراوە، زۆریش هــەژارم، پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ فـەرمووی: ئـارام بگرە و خودا دەرووبەکی چاکەت بۆ ئەکاتەوە، دوای ماوەیە کوڕەکی خـۆی ڕزگـار کـرد لـە دەستی بت پەرستان و ڕای کرد، لە ڕێگەدا تووشی هەندێ لە ژمارەیە لە مەڕی بـت پەرسـتان بوو، داینەبەری و هاتەوە بۆلای بـاوکی، چـووە خزمـەت پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ ووتـی: ئایـا ڕەوایـە خواردنیان؟، پێغەمەر فەرمووی: بەڵێ، درووستە خواردنیان.

ئوبەی کوڕی کەعب ووتی: ئەی نێردراوی خودا: ژنێ منالێ، یا پیربـێ و، تـەلاقدرابن، یـا سکیان پڕبێ، باسی ژمارە و جۆری عیدەکەیان نەکراوە، خودا فەرمووی:

﴿وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِن نِّسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ﴾ وە ژنانێکی ئەوتۆ بێ ئومێدبوون لـە حەیز پێدهاتن لەبەر پیر و جگەی پـیری لــە ژنـەکانی ئێـوە و، ژنانێکی ئەوتۆ حەیزیان پێدا نەهاتووە لەبەر منالی و، تەلاقدران، ئێوە کەوتنە گومانەوە، دوایــی عیدەکانیان سێ مانگە. بەڵام ئەو ژنەی لەوەوبەر حەیزی پێدا هاتبێ و، حەیزەکەی وەستابێ کە تەلاقدرا پێویستە چاوەڕوان بکرێ هەتا حەیزیکەی ئەگەڕێتـەوە ئـەو کاتـە عیـدە بژمـێرێ، یـا چاوەڕوان بکرێ هەتا ئەگاتە ئەو تەمەنەی بێ‌ئومێد ئەبێ لـە حــەیز، ئـەو کاتـە عیدەکـەی سـێ مانگە لای هەندێ لە زانایان.

ساڵانی بێ ئومێدی لە حەیزدا پێهاتن (٦٠) ساڵە، بەلای هەندێ لـــە زانایـان (٥٥) سـاڵە، هەندێ تریان ئەڵێن: (٦٢) ساڵە. ئەو سنوورانەی باسکران هەموویان بۆ ژنی تەلاقدراون. بەڵام ئەو ژنەی مێردی مردبێ عیدەکەی چوار مانگ و (١٠) ڕۆژە، ئیتر ئەو ژنە حەیزی پێداهاتبێ یـا حەیزی پێدا نەهاتبێ و منالبێ.

﴿وَأُوْلَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ وە ئەو ژنانەی سکیان پڕە کۆتایی عیدەکـەیان ئەوەیە: کە سکەکەیان دابنێن، ئیتر ئەو ژنانە تەلاّقدرابن یا مێردیان مردبێ.

﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مِنْ أَمْـرِهِ يُسْـرًا﴾ وە هـەر کەسێ لـە خـودا بترسـێ و خـۆی لـە بێفەرمانی خودا بپارێزێ، خودا ئاسانی بۆ کارەکانی ئەو کەسە ساختە ئەهێنێ و، یارمـەتی ئـەدا بۆ کردنی کاری چاك.

﴿ذَلِكَ أَمْرُ اللَّهِ أَنزَلَهُ إِلَيْكُمْ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَـيِّئَاتِهِ وَيُعْظِـمْ لَـهُ أَجْـرًا﴾ ئـەو شـتانەی باسکران فەرمانی خودان، خودا ناردوویەتی‌یە خـوارەوە بـۆلای ئێـوە و کاریـان پـێ بکـەن و، هەرکەسێ لە خودا بترسێ، خودا گوناهەکانی دائەپۆشێ و، خودا گەورە و زۆر ئەکا پاداشـتی لە ڕۆژی دوایی‌دا، هەتا حەوت سەد چەنانە بگرە زۆرتریش.

أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُواْ عَلَيْهِنَّ وَإِن كُنَّ أُوْلَٰتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُواْ عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَأْتَمِرُواْ بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ ﴿٦﴾ لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ﴿٧﴾

خودای مەزن لـەسەرەتای ئەم سوورەتەدا فەرمووی: ئێوە ئەو ژنانە ئێوە تەلاقتان دان دەریـان مەکەن، ئێمە ئاماژەمان کردبوو بۆلای بیروبۆچونی زانایان لـەبارەی ئەو ژنانە تەلاّقیان سێ‌بەسـێ کەوتووە و، ئەوانە سێ‌بەسێ تەلاّقیان نەکەوتووە: ئایا جۆری ئەو جێگەیە ژنانی تەلاّقدراو لــەوا دائەنرێ بە چ جۆرێکە و چۆن ئەبێ، خودا ئەفەرموێ:

﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ﴾ ئێوە کە ژنەکانی خۆتانتان تـەلاّقدان، ئێـوە ئـەو ژنانە دابنێن لە هەندێ لـەو جێگەیە خۆتان لـەوا دائەنیشن بە گوێرەی توانـای دارایـی خۆتـان و شایستەی خۆتانە هەتا کۆتایی عیدەکەیان.

﴿وَلَا تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ﴾ وە ئێوە کارێکی وایان لـەگەڵ مەکـەن ئـەو ژنانـە تووشـی زیان ببن، لـە بارەی جێگەکانیان و بەخێوکردنیان؛ لـەبەر ئەوەی ناچاریان بکەن واز لـەو جێگەیە بهێنن و بچنە دەرەوە.

﴿وَإِن كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ وە ئەگەر ئەو ژنە تەلاقدراوانە سکیان بە منالەوە پڕبوو، دوایی ئێوە بەخێویان بکەن، بە بەخشینی پێویستی بۆ سەریان، بە هەموو جۆرێ.

﴿فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ﴾ دوایی ئەگەر ئەو ژنە تەلاقدراوانە بە یەکجاری پەیوەندی ژن و مێردی بە ئێوەوە نەما، بە کۆتایی پێهاتنی عیدەکەی بەهۆی دانانی سکەکەیەوە، منالیان لە ئێوە هەبوو، ئەگەر ئەو ژنانە شیریاندا بە منالەکەی خۆیان، دوایی ئێوە کرێی شیردانەکەیان بدەنێ و، ئێوە و ئەو ژنانە ڕاوێژ بکەن لە نێوان خۆتانا بە گیانی پاکی چاوپۆشیکردن لە یەکتری، ئەگەر پێك نەهاتن، پێویستە ئێوەی خاوەن منال ژنێ ئامادەبکەنبۆ شیردان بەو منالە بە کرێیەکی گونجاوهەرچۆنێ بێ پێویستە ئە منالە بێ ئومێد نەکرێ لە شیرپێدانی و تووشی ئازار نەبێ، ئەگەر دایکی بەخێوی نەکرد پاش ڕاوێژی نێوانیان، وەك خودا ئەفەرموێ:

﴿وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُ أُخْرَى﴾ وە ئەگەر ئێوە و دایکی ئەو منالە لە نێو خۆتانا تێك چوون و ڕێنەکەوتن بۆ شیردان بەو منالە، دوایی ئێوە داوا لە ژنێ تر بکەن شیر بدا بەو منالە، دوایی خاوەن منال منال لەو دایکەی بسێنێتەوە و ئەیەویست ئازاری خاوەنەکەی بدا، ئەگەر ژنێ هەبوو، بەخۆڕایی شیربدا بەو منالە و، دایکەکەی داوای کرێی ئەکرد، ئەو کاتەیش منالەکەی نادرێ بە دایکی، خۆ ئەگەر دایك بە خۆڕایی شیری ئەدا بەو منالە ئەبێ هەر بدرێ بە دایکی خۆی، ئەگەر ئەزانرا ئازاری منالەکە نادا.

﴿لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ﴾ پێویستە خاوەن منالی ساماندارى خاوەن توانا بە دارایی ببەخشێ بەو ژنە شیر ئەدا بەو منالە بە گوێرەی فراوانی سامانی خاوەن منال و، هەر کەسێ کەم دەرامەتی کەوتبوە سەری و دارایی کەم بوو، دوایی با ئەو کەسە کرێ ببەخشێ بەو ژنە لە هەندێ ئەو شتەی خودا بەخشیویە، بەو پیاوە کەم دەرامەتە. یانێ ساماندار بە گوێرەی دارایی خۆی و، هەژار بە گوێرەی دارایی خۆیان کرێ بدەن بەو ژنە شیردەرە بەو منالە.

﴿لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَا آتَاهَا سَيَجْعَلُ اللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا﴾ خودا داوا ناکا لە هیچ کەسێ بۆ بەخێوکردنی ژن و منالی مەگەر بە ئەندازەی شتێ خودا بەخشیویە بەو کەسە، خودا ئامادەی ئەکا بۆ هەژاران ئاسانی و خۆشی گوزەران لە دوای ناخۆشی و تەنگانە و هەژاری.

وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ
عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَٰهَا
عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨﴾ فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ﴿٩﴾

أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
قَدْ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا (١٠) رَّسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٍ
لِّيُخْرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ
وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا
ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا (١١) ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ
سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ
ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا (١٢)

﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِ فَحَاسَبْنَاهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَاهَا عَذَابًا نُكْرًا﴾ وە زۆر کەس لە دانیشتووانی گوندێك وازیان هێنابوو لــە فــەرمانی پــەروەردگاری خۆیـان بـە جۆرێکی خــراپ و، وولآمــی نــێراوی پــەروەردگاریان نەدایــەوە، دوایــی ئێمــە پرسـیارمان لــە دانیشتووانی ئەو گوندەمان کرد، بە پرسیارکردنێکی زۆر سەخت لە پاشەڕۆژدا، سزاماندان بــە سزادانێکی زۆر گران و سەخت لە دوارۆژدا.

﴿فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَاقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا﴾ دوایـی دانیشـتووانی ئـەو گونـدە سـزای کارەکانی خۆیانیان لە بێباوەڕی و گوناهـ چێشت و، ئەنجامی کارەکانیان زیانی هەردوو جیهان بوو بۆیان.

﴿أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا فَاتَّقُوا اللَّهَ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ الَّذِينَ آمَنُوا قَدْ أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا﴾ خودا ئامادەی کردووە بۆ دانیشتووانی ئەو گوندە سزایەکی زۆر سەخت، دوایی ئەی کەسانێکی ئەوتۆ خاوەنی ئەقڵن، باوەڕتان هێناوە، خۆتان بپارێزن لە بێفەرمانی خودا و لە خودا بترسن، بە ڕاستی خودا قورئانی بۆلای ئێوە ناردووەتە خوارەوە، فەرموودەکانی جێبەجێ بکەن.

﴿رَّسُولًا يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِ اللَّهِ مُبَيِّنَاتٍ لِّيُخْرِجَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ﴾ خودا پێغەمەێکی ڕەوانە کردووە بۆلای ئێوە، ئەخوێنێتەوە بەسەر ئێـوەدا ئایەتـەکانی قورئانی خودا، فەرموودەکانی خودایان ڕوون کردووەتــەوە، لـەبـەر ئـەوەی کەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕیان هێناوە و، کردەوە چاکەکانیان کردووە، دەریان بکا لە تاریکییەکانی بێباوەڕی بۆلای ڕووناکی باوەڕ بە خودا.

﴿وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ وَيَعْمَلْ صَالِحًا يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا قَدْ أَحْسَنَ اللَّهُ لَهُ رِزْقًا﴾ وە هەرکەسێ باوەڕ بە خودا بـهێنێ و، کـردەوەی چـاك بکـا، خـودا ئـەو کەسە ئەخاتە ناو چەندین بەهەشت ئەڕوا بە ژێر ئەو بەهەشتانەدا چەندین ڕووباری ئاوی شیرین، بەردەوامن لـە ناو ئەو بەهەشتانەدا هەتاهەتایە، بە ڕاستی خودا ئەبەخشێ بەو کەسە خواردەمەنی پاك و فراوان لـە بەهەشتا.

﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ﴾ خودا کەسێکی ئەوتۆیە حـەوت ئاسمـان و، لـە زەویش وێنەی ئەو حەوت ئاسمانە لـە ژمارەدا، درووستی کردوون.

زانایان لـە مانای ڕستەی ﴿وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ﴾ بیروبۆچوونیان جیاوازە: هـەندێکیان ئـەڵێن: ژمارەی زەوی وەك ئاسمان حەوتن، ئێمەی ئادەمیزاد ماناکەی بە ڕاستی و بە بێ پەردە نازانین و، زانستی ئێمـە ڕێگـەی پـێ نابـا، بـەلام ئێمـە پێویستە بڕوامـان وابـێ، حـەوت زەویـش هـەن شی‌کردنەوەیان ئەسپێرین بە خودا. هەندێ تر لـە زانایان ئەڵێن: ئەم گەردوونە و، ئەم بوونەوەرە گەورەیە حەوت ئاسمانی تێدایە، هەر ئاسمانـێ خـاوەنی زەوی و ئەسـتێرەکانی خۆیـەتی، دووری هەریەکێ لـەو ئاسمانانە، بە ئەندازەی ملیارێ ساڵی تیشکی خۆرە، هەندێ تریان ئەڵێن: ناوبردنی ووشەی (سَبْعَ) یانێ حەوت، ئەوە ناگەیەنێ ئەبێ هەر حەوت بن، یانێ ئەگـەر بێـژرا: مـن دوو ماشینم هەیە خۆت و براکەت سواریان بن، ئەوە ناگەیەنێ زۆرتر یا کەمتری نەبێ، هەندێ تریان ئەڵێن: مەبەست لـە حەوت زەوی: حەوت کیشوەرە، ئەوەی ڕاسـتی بـێ وا چاکـە مانـای ئـەو ڕستەیە هەواڵەی زانستی خودا بکرێ، عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەفەرموێ: ئەگـەر مانـای ئـەو ئایەتەتان بۆ بکەم لـەوانەیە ئێوە بێ‌باوەڕبن، چونکە ئەقڵی ئێوە بەرگەی ناگرێ:

﴿يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا﴾ فەرمووده و سرووشی خـودا ئـەڕوا لـە نێـوان ئاسمانـەکان و زەوی‌دا، خـودا هەڵسـووڕێنەری کاروباری ئەوان و، ئەوانەی لـە نێوان ئەواندان، دەسـتەلاتی بەسـەر هـەموویاندا هەیـە، لـەبـەر ئەوەی ئێوە بزانن خودا توانای هەیە بەسەر هەموو شتێکا و، بە ڕاستی بزانن زانست و زانیـاری خودا هەموو شتێك ئەگرێتەوە، بێ ئاگا نی‌یە لـە هیچ شتێك، گەورە بێ یا بچووك و، بـە نیـازی دڵی بەندەکانی ئەزانێ، کەواتە ئێوە پێویستە بێ فەرمانی خودا نەکەن.

# ﴿ سورەتی تەحریم ﴾

لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە، ژمارەی ئایەتەکانی (١٢) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ
غَفُورٌ رَحِيمٌ (١) قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ وَاللَّهُ مَوْلَاكُمْ
وَهُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ (٢) وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا
فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَنْ بَعْضٍ
فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ مَنْ أَنْبَأَكَ هَٰذَا قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ
(٣) إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا وَإِنْ تَظَاهَرَا عَلَيْهِ
فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ مَوْلَاهُ وَجِبْرِيلُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمَلَائِكَةُ
بَعْدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ (٤) عَسَىٰ رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا
خَيْرًا مِنْكُنَّ مُسْلِمَاتٍ مُؤْمِنَاتٍ قَانِتَاتٍ تَائِبَاتٍ عَابِدَاتٍ سَائِحَاتٍ
ثَيِّبَاتٍ وَأَبْكَارًا (٥)

زانایان بیریان جیاوازە لەبارەی هۆی هاتنەخوارەوەی ئەو ئایەتانەی پێشەوە. بەهەرجۆرێ‌بێ لە مەبەستەکە دەرناچێ.

هەندێ لە زانایان وەك موسلیم و بوخاری باسیان کردووە ئەڵێن: هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو پێنج ئایەتە ئەوەبوو: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ زۆر ئارەزۆی لە خواردنی شیرینی و هەنگوین بووە، هەرکاتێ بچووبایە بۆلای زەینەبەی کچی جەحش، هەندێ هەنگوینی دەرخوارد ئەدا و، ماوەیە لە لای ئەمایەوە، ئەو کارە لە لای هەندی لە ژنانی پێغەمبەر گرانبوو، بۆ ئەو مەبەستە عائیشە و حەفصە پێك هاتن لەسەر ئەوەی کاتێ پێغەمبەر هات بۆلای هەریەکێ لەوان بلێ: ئەی پێغەمبەر: تۆبۆنی (مەغافیرت) لێ دێ، مەغافیر شیلەیەکی شیرینە و بۆنی ناخۆشە و ئەخورێتەوە، دوایی جارێك پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ چووبۆلای زەینەب هەنگوینی خواردەوە، دوایی کە چوو بۆلای هەریەکە لە عائیشە و لە حەفصە ووتیان: تۆ بۆنی مەغافیرت لێ دێ، پێغەمبەر فەرمووی: من مەغافیرم

نەخواردووەتەوە. بەڵام لای زەینەبە هەنگوینم خواردووەتەوە. ووتیان لەوانەیە مێشەکان لەو درەخە لەوەڕابن، پێغەمەر لەبەر ئەوەی ئارەزۆی لە بۆنی خۆشبووە، زۆری پێ ناخۆشبوو بۆنی خراپی لێبێ. فەرمووی: قەدەغەبێ لەسەر من خواردنەوەی هەنگوین.

هەندێ تر لە زانایان ئەڵێن: هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتانە ئەوەبوو: عائیشە و حەفصە پەکتریان خۆشویستووە، بەرێکەوت حەفصە چوو بۆلای باوکی، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ناردی بە شوێن ماریەی قیبتیدا، ئەو ڕۆژە سەرەی چوونی پێغەمەر بوو بۆلای عائیشە، کە حەفصە هاتەوە ماریەی بینی لە هۆدەکەی خۆیا چاوەڕوانی کرد ماریە بێتە دەرەوە، ڕەوشتی ژنانەی جوولا، پێغەمەر فەرمووی بە ماریە، بچۆ دەرەوە، حەفصە بە پێغەمەری ووت: تۆ ئازاری دڵی منتدا لە هۆدەکەی خۆما، پێغەمەر فەرمووی: سوێندم بە خودا من دڵی تۆ خۆش ئەکەم. بەڵام من نهێنییە بە تۆ ئەڵێم و بەلای خۆتەوەبێ و بە کەسی تر مەڵێ، لەبەر دڵی تۆ ماریە لەسەر من قەدەغە بێ، ژنانی پێغەمەر بە تایبەتی عائیشە و حەفصە، هەوێی سارییان بەزۆر لەگەڵ ماریەدا بەکار ئەهێنا، بە تایبەتی تر کاتێ ئیبراهیم لە ماریە پەیدابوو، حەفسە خۆی پێنەگیرا و چوو بۆلای عائیشە و بە نهێنی پێی ووت: موژدەبێ پێغەمەر ماریەی قەدەغەکردووە لەسەر خۆی، دووایی خودا ئەو نهێنییەی ئاشکراکرد و هەواڵی دا بە پێغەمەر، بەو هۆیەوە خودا ئەو پێنج ئایەتانەی ناردە خوارەوە و فەرمووی:

﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ﴾ ئەی پێغەمەری خودا لەبەر چ شتێ تۆ قەدەغە ئەکەی لەسەر خۆت شتێ خودا بۆ تۆی ڕەوا کردووە، تۆ مەبەستت ڕەزامەندی و دڵ خۆشکردنی ژنەکانت بێ و، دڵیان نەیەشێ.

﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ وە خودا لەو هەڵەیەی تۆ خۆش ئەبێ، چونکە درووست نییە قەدەغەکردنی شتێ خودا ڕەوای کردبێ، خودا میهرەبانە بۆ تۆ، چونکە خراپەت لێ ناگرێ و، تۆ ئەپارێزێ لە خراپە. ئەبێ بزانرێ مەبەست قەدەغەکردن و وازهێنانە لەو شتە نەك قەدەغەکردنی یاسایی، لەبەر دڵی ژنەکانی، وێنەی ئەوەی بڵێی: لەبەر دڵی تۆ جگەرە ناکێشم هەتا تۆ ئازارت پێ نەگا. لەبەر ئەوەی پێغەمەر ڕزگاری بێ لە سوێندەکەی خودا فەرمووی:

﴿قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ وَاللَّهُ مَوْلَاكُمْ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ بە ڕاستی خودا دیاریکردووە بۆ ئێوە و، کردوویە بە یاسا بۆتان و، ڕزگارتان ببێ لە دەست سوێندەکانتان بەهۆی بریتی دانەوە، دووایی ئەو شتە قەدەغەتان کردووە لە خۆتان بۆتان ڕەوا ئەبێ و، خودا بەرێوەبەری هەموو کارەکانی ئێوەیە و، خودا ئەزانێ بە شتێ سوودی ئێوەی تێدابێ، هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ، لە ڕەواکردنی شتێ قەدەغە کردنی شتێ تر، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەندەیەکی ئازادکرد لەبەر کەفارەتی سوێندەکەی خۆی.

بۆ زانین: ئەگەر پیاوێ بە ژنەکەی خۆی ووت: تۆ قەدەغەی لەسەر من، یا من تۆم قەدەغەکرد، ئەگەر بەو ڕستانە نیازی تەڵاقی بووبێ ئەبێ بە تەڵاق، ئەگەر نیازی زیهاری بووبێ ئەبێ بە زیهار، ئەگەر قەدەغەبوونی لەشی ژنەکەی مەبەست بووبێ و نەچێتە لای، یا نیازی هیچ شتێکی نەبووبێ، ئەو ڕستەیە بە سوێند ئەژمێررێ و پێویستە لەسەری کەفارەتی بۆ بدا، ئەگەر کەسێ بڵێ: ئەو خواردنە لەسەر من قەدەغە بێ، ئەو گفتوگۆیە بە پوچ دائەنرێ و نە قەدەغەئەبێ و نە کەفارەتیشی پێویستە، هەندێ لە زانایان لایان وایە ئەگەر ئەو شتەی خوارد ئەبێ کەفارەتی بۆ بدا.

﴿وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا﴾ وە ئێوە بیری ئەو کاتە بکەنەوە پێغەمەر گفتوگۆیەکی بە نهێنی کرد لەگەڵ هەندێ لە ژنەکانی، وەك قەدەغەکردنی هەنگوین یا ماریەی قیبتی، ئەو ژنەیشحەفصە بوو، یا قەدەغەی شتێ تر بوو، پێغەمەر فەرمووی: ئەو نهێنی‌یە بە کەس مەڵێ.

﴿فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَن بَعْضٍ﴾ دوایی کاتێ حەفصە هەواڵی ئەو گفتوگۆ نهێنی‌یەی دا بە عائیشە و، خودا پێغەمەری ئاگادارکرد لەسەر بڵاوبوونەوەی ئەو نهێنی‌یە، پێغەمەر هەواڵی دا بە حەفصە لەسەر بڵاوکردنەوەی هەندێ لەو گفتوگۆ نهێنی‌یە، وازی لە گەڕانەوەی هەندێکی هێنا و هەواڵی نەدایە کە قەدەغەکردنی مارییەیە، یا هەرشتێ تر بێ، حەفصە سەری سوڕما و، ترسا و وایزانی عائیشە گێڕاوی‌یەتەوە، پرسیاری لە پێغەمەر کرد و لەو بارەوە فەرمووی:

﴿فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ مَنْ أَنبَأَكَ هَذَا قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ﴾ دوایی کاتێ پێغەمەر هەواڵی ئەو گفتوگۆ نهێنی‌یەی دا بە حەفسە، حەفسە ووتی بە پێغەمەر: چ کەسێ هەواڵی داوە بە تۆ؟، پێغەمەر ووتی: ئەو هەواڵە خودا هەواڵی داوە بە من هەموو نهێنی‌یە ئەزانێ، ئاگای لە هەموو شتێ هەیە.

خودای مەزن ڕووی فەرموودەی خۆی ئەکا بۆلای ئەو دووژنە کە حەفسە و عائیشە بوون: کە ئەو پیلانەیان ساختە هێنا بەرانبەر بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هەتا قەدەغە بکا لەسەرخۆی شتێ خودا ڕەوای کردووە و، فەرمووی:

﴿إِن تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا﴾ ئەگەر ئێوە پەشیمان ببنەوە بۆلای خودا دوایی پەشیمانبوونەوەشتان پێویستە، بە ڕاستی دڵی ئێوە لای‌داوە لە ڕاستی و، بگەڕێنەوە بۆلای فەرموودەی خودا و، بە نیازی پاکەوە.

﴿وَإِن تَظَاهَرَا عَلَيْهِ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ مَوْلَاهُ وَجِبْرِيلُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمَلَائِكَةُ بَعْدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ﴾ وە ئەگەر ئێوە یارمەتی یەکتری بدەن لەسە رئازاردانی پێغەمەر، دووایی خودا یاریدەی پێغەمەر ئەدا و، جبرەئیل و پیاوچاکانی باوەڕدارانیش یارمەتی ئەدەن و، دوای ئەوانیش فریشتەکانیش بەو ژمارە زۆرەوە یارمەتی ئەدەن.

﴿عَسَى رَبُّهُ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ مُسْلِمَاتٍ مُّؤْمِنَاتٍ قَانِتَاتٍ تَائِبَاتٍ عَابِدَاتٍ سَائِحَاتٍ ثَيِّبَاتٍ وَأَبْكَارًا﴾ چ شتێکە فریوی ئێوەی داوە ئازاری پێغەمەر بدەن و بێ‌فەرمانی ئەو بکەن؟ شایستەیە و پێویستە خودا بگۆڕێ بۆ پێغەمەر لە جیاتی ئێوە چەندین ژنێ تر چاکتربن لە ئێوە و جوانتربن ئەگەر پێغەمەر تەلاقی ئێوە بدا، ئەو ژنانەیش: ملکەچبن بۆ فەرموودەکانی خودا، خوداپەرستبن، باوەڕداری ڕاستبن، پەیڕەویکەری فەرمانەکانی حودا و پێغەمەربن، واز لە گوناه بهێنن و پەشیمان ببنەوە، پەرستنیان زۆربێ، ڕۆژووگربن، بێوەژنبن و کچ بن، ئەگەر خودای مەزن بیەوێ.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ﴿٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَعۡتَذِرُواْ ٱلۡيَوۡمَۖ إِنَّمَا تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيُدۡخِلَكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ يَوۡمَ لَا يُخۡزِي ٱللَّهُ ٱلنَّبِيَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥۖ نُورُهُمۡ يَسۡعَىٰ بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَبِأَيۡمَٰنِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا وَٱغۡفِرۡ لَنَآۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٩﴾

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: ئێوە خۆتان و خێزانەکانتان بپارێزن لە ئاگر، سوتەمەنی ئەو ئاگرە ئادەمیزاد و بەردە. یانێ هەرکاتێ باوەڕدار هەستی کرد بە لێپرسراوی لەبەردەم خودا بۆ ئەو شتە ئەیکا و ئەیلێ و، لە سزای خودا ترسا و، پێویستە لەسەریشی کە بزانی بەرپرسیارە لەبەردەم خودادا لە بارەی خێزان و منالەکانیشیدا و، ئەبێ دەستی یارمەتی درێژ بکا بۆ چاك کردن و ڕاست کردنەوەیان و، هەرکاتێ باوك و زۆرشت ئەکا بۆ منالەکەی بۆخۆشی

پاشەڕۆژی لە جیهاندا، چاکتر بۆ باوك ئەوەیە کاری بۆ بکا لەبەر بەختیاری پاشەڕۆژیان و، بەڵام باوکی بێچارە چ شتێ بکا بۆ ئەو نەوە نەزانە کە ئەیانەوێ باوکەکانیان سەرشۆڕی فەرمانەکانی ئەوانبن.

﴿عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ بە سەر ئەو ئاگرەوە دانراون چەندین فریشتە، بەوان سپێردراوە سزادانی دانیشتووانی دۆزەخ، گفتوگۆیان زبر و ڕەقە، کردەوەیان زۆر سەختە و، بێفەرمانی خودا ناکەن لە شتێکا خودا فەرمانیان پێ ئەدا، ئەو شتەی فەرمانیان پێ ئەدرێ ئەیکەن.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَعْتَذِرُوا الْيَوْمَ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان نەهێناوە: ئێوە لەم ڕۆژەدا بیانوو مەیەرنەوە، بە ڕاستی ئێوە پاداشتتان ئەدرێتەوە بە شتێ ئێوە کردووتانە لە جیهاندا، ئەمڕۆ ڕۆژی پرسیار و وولامە، ڕۆژی بیانووهێنانەوە نییە، خۆتان ئەزانن بە چ جۆرێ ئێوە هەوڵی لەناوبردنی باوەڕدارانتان ئەدا و، بە کۆمەڵ ئادەمیزادتان لە ناو ئەدا و زیندەبە چاڵتان ئەکردن.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَى رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: ئێوە بگەڕێنەوە بۆلای خودا و پەشیمان ببنەوە لە گوناهەکانتان بە پەشیمانبوونەوەیەکی پاك، بە جۆرێ بە دڵ و بە دەم پەشیمان بوویێتەوە لەو گوناهانە کردووتانە، نیازی ڕاستیتان وابێ، بۆ لەمەودوایش بێفەرمانی خودا نەکەن؛ لەبەر ئەوەی کە پەروەردەکەری ئێوە گوناهەکانتان داپۆشێ و گوناهەکانتان بسڕێتەوە، ئێوە بخاتە ناو چەن بەهەشتێ بڕوا بەژێریانا چەند ڕووباری ئاوی شیرین و پاك و بێئازار.

﴿يَوْمَ لَا يُخْزِي اللَّهُ النَّبِيَّ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ نُورُهُمْ يَسْعَى بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِمْ﴾ ئێوە ئەخاتە ناو ئەو بەهەشتانەوە لەو ڕۆژەدا، خودا پێغەمەر و ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە لەگەڵیا ڕسوایان ناکا و، ڕێزیان ئەگرێ و ئەیانپارێزێ لە ئاگری دۆزەخ، ڕووناکییەکیان بۆ درووست ئەکا لە پێشیانەوە و، ئەملاولایانەوە ئەڕوا ڕێگەی بەهەشتی پێ ئەدۆزنەوە و ئەچنە ناوی.

﴿يَقُولُونَ رَبَّنَا أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَاغْفِرْ لَنَا إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ باوەڕداران ئەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە تۆ ڕووناکی ئێمە تەواو بکە بۆ ئێمە کاتێ ڕووناکی بێباوەڕان و دووڕووەکان ئەکوژێتەوە و، لە گووناهی ئێمە خۆشببە، بە ڕاستی تۆ توانات بەسەر هەموو شتێکا هەیە.

﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ ئەی پێغەمەر: تۆ بە چەك جەنگ بکە لەگەل بێباوەڕان و دووڕووان و، توندوتیژی بخەرە سەریان کاتێ گفتوگۆی نەرم کاری تێ نەکردن و، جێگە و گەڕانەوەی ئەوان بۆلای دۆزەخە و، دۆزەخ خراپترین جێگەیە بۆ گەڕانەوەی ئەوان.

ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا
لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ ۖ كَانَتَا تَحْتَ
عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَٰلِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا
مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴿١٠﴾
وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ
قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِى مِن فِرْعَوْنَ
وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١١﴾ وَمَرْيَمَ ٱبْنَتَ
عِمْرَٰنَ ٱلَّتِىٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا
وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتْ مِنَ ٱلْقَٰنِتِينَ ﴿١٢﴾

﴿ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَةَ نُوحٍ وَامْرَأَةَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ﴾ خودا وێنەیەکی زۆر سەرسوڕێنەری ڕوون کردووەتەوە بۆ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنابوو، بۆیانی گێڕاوەتەوە چۆنیەتی ژنی نوح کە ناوی (داعیلە) بووە و، چۆنیەتی ژنی لوت کە ناوی (واهیلە) بووە، ئەو دوژنانە ژنی دووبەندەی پیاوچاکبوون لە بەندەکانی ئێمە و پێغەمەر بوون.

﴿فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا﴾ دوایی ئەو دووژنە پەیمانی ژنیەتی خۆیانیان تێکدا، بەهۆی بێباوڕی و دووڕوویيانەوە، گفتوگۆی بێ شەرمانەیان لەگەڵ ئەکردن و، ژنی نووح بە نووحی ئەووت: تۆ شێتی، ژنی لوت ئەگەر لووت میوانی بهاتایە هەواڵی بە پیاوانی تاقمی خۆی هەتا کاری خراپیان لەگەڵ ئەو میوانانە بکردایە، دوایی مێردە پیاوچاکەکانیان هیچ شتی لە سزای خودایان لەوان نەگێڕایەوە، ژنی نوح خنکا بە لافاو، ژنی لووت ڕزگاری نەبوو لەبەردەباران و ڕۆچوونی بە ناو زەویدا.

جیاوازی لە نێوان پیاوان و ژناندایە، بە هیچ جۆرێ، نە لە لایەن سروشتیانەوە و نە لە لایەن بەرپرسیاریان، هەردوولایان تەواوکەری یەکترین، لە پیاواندا پیاوی چاك و خراپ، لە ژنانیشدا ژنی چاك و خراپ هەن.

ئەو دوو ئایەتانە دوورن لە بەراوردکردنی نێوان پیاوان و ژنان، بەڵکو خودای مەزن ئەو وێنەیەی ڕوون کردووەتەوە لە جگەی پیاواندا، ئاماژەکردنە بۆلای هەندێ لە ژنانی پێغەمەر و

دایکی باوەڕداران کە یاریدەی یەکتریان ئەدا و ئازاریان تووشی پێغەمەر کرد، خـودا بـە ئایـەتی (٤)ی ئەم سوورەتە هەڕەشەی لیٚکردن، لـە ئایەتی (١٠) و (١١)ی ئەم سوورەتە خودای مەزن باسی ئەوە ئەفەرموێ ئادەمیزاد ڕەوشتی چاك و کردەوەی پاك نزیکی ئەخاتەوە لـە خودا بـاوەکو هاوڕێی خراپترینی ئادەمیزاد بێ، هەروەها کردەوەی خراپ ئادەمیزاد دوورئەخاتەوە لـە خودا، با وەکو هاوڕێی چاکترینی بەندەی خوابن. خۆشەویستی و خزمایەتی سوودی پێ نابەخشێ بە هیچ جۆرێ.

﴿وَقِيلَ ادْخُلَا النَّارَ مَـعَ الدَّاخِلِينَ﴾ وە ئـەبێژرێ بـەو دووژنـەی نـوح و لـووت لـە ڕۆژی دووایدا: ئێوە بچنە ناو ئاگر لـەگەڵ تەواوی ئەو بێباوەڕانە ئەخرێنە ناو ئاگر، پـەیوەندیتان بـەو پێغەمەرانەوە نەماوە. هەروەها ژنانی پێغەمەریش ئەچنە ناو ئـاگر ئەگـەر پەشـیمان نەبنـەوە لـە کردەوەی خۆیان و لـە ئازاردانی پێغەمەر.

﴿وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ آمَنُوا امْرَأَةَ فِرْعَوْنَ﴾ وە خودا ڕوونی کردووەتەوە بـۆ کەسـانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە چوونییەتی ژنی فیرعەون. لـە دوای باسکردنی ژنەکانی نوح و لوت، کە ئەم ژنە هاوڕێی فیرعەون بووە، کە خراپترینی ئادەمیزادی کاتی خۆی بووە، خراپـی مێردەکـەی زیانی بەو نەبەخشی. ئەو ژنەی فیرعەون ناوی ئاسیەی کچـی موزاحیمـە، بـاوەڕی بـە خـودا و نامەی خودا و پێغەمەری خودا هێنابوو، باوەڕی بە فیرعەون نەبووە، ئـەویش هەڕەشـە کوشـتنی لیٚکرد، ئاسییە کوشتنی هەڵبژارد.

﴿إِذْ قَالَتْ رَبِّ ابْنِ لِي عِندَكَ بَيْتًا فِي الْجَنَّـةِ وَنَجِّنِي مِـن فِرْعَـوْنَ وَعَمَلِـهِ وَنَجِّنِي مِـنَ الْقَـوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ کاتێ سزا ئەدرا ووتی: ئەی پەروەردگاری من: تۆ لــەلای بـەرزترین توانـای خـۆت کۆشکێکم بۆ درووست بکە لـە بەهەشتاو، ڕزگارم بکە لـە فیرعەون و کاری خراپی فیرعەون و لـە تاقمێکی ستەمکاری قیبتییە بێباوەڕکان. لـە تەفسـیری تەبـەریدا هـاتووە. ئـەڵێ فیرعـەون ووتی: بە پیاوەکانی: تەماشا بکەن گەورەترین بەرد پەیدابکەن، ئەگـەر لـەسـەر بـاوەڕی خـۆی مایەوە بیخەن بەسەریدا، ئەگەر گەڕایەوە ئەو کاتە ژنی منە، ئاسیە سەری بەرز کردەوە بـۆلای ئاسمان و ئەو پاڕانەی پێشووی داواکرد لـە خودا، بەر لـەوەی بەردەکە بــهێنن گیـانی کێشـرا و بەردەکەیان فڕێدایە سەر لـەشێکی بێ گیان.

﴿وَمَرْيَمَ ابْنَتَ عِمْرَانَ الَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَاتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِ وَكَانَتْ مِنَ الْقَانِتِينَ﴾وە خودا ڕوونی کردووەتـەوە بـۆ بـاوەڕداران وێنـەی زۆر سەرسـوڕێنەری مەریەمەی کچی عیمران، ئەو کچەی ئەوتۆ شەرمگەی خۆی پاراستبوو لـە کـاری بـێزلێکراو و خراپ، دوایی ئێمە فەرمانماندا بە جبرەئیل فووی کرد بە شەرمگەیا لـە گیانێکی درووسـتکراوی

ئێمە بەهۆی توانای ئێمەوە بەبێ ئەوەی پیاوی نزیك بکەویتەوە بە عیساوە سکی پڕبوو، بڕوای بەو دەستوورەی پەروەردگاری خۆی و بەنامەی ئەو هێنابوو، مەریەم لەو کەسانە بوو کە بەردەوامبوون لەسەر پەرستنی خودا و، ڕێزی دابوو بەسەر ژنانی سەردەمی خۆیا. کەواتە هەموو ژنێ پێویستە ئامۆژگاری وەربگرێ لەو سێ ژنانەی پێشوو، مێردی خراپ تووشی بیباوەڕیان نەکات و، بە فەرمانی مێردی چاك هەڵسن و خەیانەتیان لێنەکەن وێنەی ژنانی نوح و لوت، سامانی مێرد لە خوداپەرستی لایان نەدا بە وێنەی ژنی فیرعەون کە لەبەر ڕەزامەندی خودا وازی لە پاشایەتی و سامانی فیرعەون هێنا و، پێویستە بە وێنەی مەریەمی کچی عیمران داوێن پاکبن.

بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان. سوپاس و ستایشی بێ ئەندازە بۆ پەروەردگاری هەنوو بوونەوەران. درودی فراوان لەسەر پێغەمەر و یار و یاوەرانی بێ هەتا هەتایە.

## ﴿ سورەتی ئەلمولك ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن جگە لە ئایەتی (٣٠) لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٣٠) ئایەتن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿١﴾ ٱلَّذِي خَلَقَ
ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ ﴿٢﴾
ٱلَّذِي خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗاۖ مَّا تَرَىٰ فِي خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن
تَفَٰوُتٖۖ فَٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٖ ﴿٣﴾ ثُمَّ ٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ كَرَّتَيۡنِ
يَنقَلِبۡ إِلَيۡكَ ٱلۡبَصَرُ خَاسِئٗا وَهُوَ حَسِيرٞ ﴿٤﴾ وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ
ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلۡنَٰهَا رُجُومٗا لِّلشَّيَٰطِينِۖ وَأَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابَ
ٱلسَّعِيرِ ﴿٥﴾ وَلِلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ
﴿٦﴾ إِذَآ أُلۡقُواْ فِيهَا سَمِعُواْ لَهَا شَهِيقٗا وَهِيَ تَفُورُ ﴿٧﴾ تَكَادُ تَمَيَّزُ
مِنَ ٱلۡغَيۡظِۖ كُلَّمَآ أُلۡقِيَ فِيهَا فَوۡجٞ سَأَلَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَذِيرٞ ﴿٨﴾
قَالُواْ بَلَىٰ قَدۡ جَآءَنَا نَذِيرٞ فَكَذَّبۡنَا وَقُلۡنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ
إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ كَبِيرٖ ﴿٩﴾ وَقَالُواْ لَوۡ كُنَّا نَسۡمَعُ أَوۡ نَعۡقِلُ مَا كُنَّا فِيٓ أَصۡحَٰبِ
ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾ فَٱعۡتَرَفُواْ بِذَنۢبِهِمۡ فَسُحۡقٗا لِّأَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١١﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان**

﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ کەسێکی ئەوتۆ بە دەستی توانای ئەوە بەڕێوەبردنی هەموو کارێ و هەڵسوڕاندنیان گەورەیە و چاکەی زۆرە و، باڵاتر و دوورە لە

شتێ شایستەی ئەو نەبێ و، خودا توانای بەسەر هـەموو شـتێکا هەیـە و هیـچ شـتێ ڕێگـەی لێ ناگرێ، لـە نیشانەکانی گەورەیی خودایە.

﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَـنُ عَمَلًـا وَهُـوَ الْعَزِيـزُ الْغَفُـورُ﴾ خودایـەکی ئەوتۆیە مردن و زیندەگانی درووست کردووە. لەبەرئەوەی کردەوەکانی ئێوە لـە نێوان مردن و زیندەگـانی‌دا دەربخـات. ئێـوە تـاقی بکاتـەوە چ کەسـێ لـە ئێـوە کـردەوەی چاکـتر ئـەکا و، دانیشتووان بزانن، ئەگینا خودای گەورە هەموو شتێ ئەزانێ و پێویستی بە تاقی‌کردنـەوە نی‌یـە، خودای مەزن لێرەدا مردنی پێش زیندەگانی خستووە لـەبەر ئەوەی ئادەمیزاد لـە پێشـا نـەبووە و دوایی پەیدابووە لـە تۆێکی مردوو، لەبەر ئەوەیش زۆرتر ئاماژەیە بۆ توانای خودا و، خـودا زۆر بە توانا و گەورەیە بۆ تۆڵـەکردنەوە لـەو کەسانەی بێ فەرمانی خودا ئەکەن، لێخۆشبوونی زۆرە بۆ ئەو کەسانە ئەگەڕێنەوە بۆلای فەرمانەکانی خودا و پەشیمان ئەبنەوە لـە گوناهەکانیان.

﴿الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا﴾ خودایەکی ئەوتۆیە حەوت ئاسمانەکانی درووست کردووە بە ڕێك و پێکی هەندێکیان لـەسەرەوەی هەندی تریانن، هەریەکـەیان جێگـە و بازنـە و کێشـی تایبەتی خۆیان هەیە.

﴿مَّا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِن تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِن فُطُورٍ﴾ تۆی ئـادەمیزاد لـە درووستکردنی خودای خاوەن بەخشندەی هیچ جۆرە خواری و ناڕێکی و جیاوازی لـەوا نابینی. بەڵکو خودا هەموویانی بەڕێك و پێکی درووست کردوون. دوایی تۆ چـاوت وەرگـێڕە بـۆلای درووستکراوانی خودا، بە تایبەتی ئاسمانەکان و، باش تەماشا بکە بزانە ئایا هیچ جـۆرە خراپـی و کەم و کوڕی و درز و کونی تێدایە.

﴿ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِأً وَهُوَ حَسِيرٌ﴾ لـە پاشانا تۆ دووجار و زۆرتر لـە دوو جار چاوی خۆت بگێڕە و بۆلایان و بە باشی تەماشـایان بکـەرەوە، چاوەکـانت دێنـەوە بۆلای تۆ بە بێ ئومێدی و بە سەرشۆڕی و، چاوەکـانت ماندووئـەبێت و هیـچ ناتەواوی‌یـە لـە درووستکراوەکانی خوادا نابینێ.

﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُومًا لِّلشَّيَاطِينِ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ السَّعِيرِ﴾ وە بە ڕاستی ئێمە نزیکترین ئاسمان لـە ئێوەوە لـە جگەی ئاسمانـەکانی تـر ڕازاندووماتـەوە بـە چـەن ئەستێرەیە خاوەنی ڕووناکین و، ئێمە ئەو ئەستێرانەمان کردوون بەوەی پارچەیە لـەوان فڕەبدەین بۆلای ئەو دوژمنانەی ئێوە، ئەیانەوێ ئێوە لـە ڕووناکی باوەڕەوە دەرتـان بکـەن بـۆلای تـاریکی بێباوەڕی و، هەروەها ئێمە ئـەو ئەسـتێرانەمان کـردووە بـە جێگـەی گومـان بـۆ شـەیتانەکانی ئـادەمیزاد و جنۆکـە کـە ئـادەمیزاد لـە ڕێگـەی ڕاسـت لائـەدەن و، لایـان وایـە بـەهۆی ئەستێرەگیری‌یەوە هەواڵ بدەن بە شتێ لـەمەوپاش پەیدائەبێ و، ئێمە ئامادەمان کردووە بـۆ ئـەو

شەیتانانە سزای ئاگری گەرمی کلْپەدار. خودا درووستی کردووە لە ئەستێرەکاندا سێ سود بۆ ئادەمیزاد: جوانکردنی ئاسمان، فڕەدانیان بۆلای شەیتانەکان. دۆزینەوەی ڕێگەکانیان. (قەتادە) ئەفەرموێ: خۆماندووکردنە بۆ ماناکردنی ئەو ڕستەیە بە جگەی ئەو سێ سوودانە. (لورد کیلفن) زانای بەرزی سرووشت ناس ئەڵێ: ئەگەر بە ووردی بیر بکەینەوە لە بوونەوەران ناچار ئەبین بڕوا بە بوونی خودا بهێنین، قورئانی پیرۆزیش هەر بەو جۆرە فەرمانمان پێ ئەدا.

﴿وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ وە سزای دۆزەخ دانراوە بۆ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان بە پەروەردگاری خۆیان نەهێناوە و، دۆزەخ خراپترین جێگەیە بۆ گەڕانەوەی بێباوەڕان.

﴿إِذَا أُلْقُوا فِيهَا سَمِعُوا لَهَا شَهِيقًا وَهِيَ تَفُورُ﴾ هەرکاتێ ئەوبێباوەڕانە فڕە ئەدرێنە ناو دۆزەخ، ئەوان دەنگێکی زۆر سەخت و ناساز بۆ دۆزەخ ئەبیسن و، دۆزەخ ئەکوڵێ و هەڵئەچێ، بە وێنەی ئاوی ناو مەنجەڵ.

﴿تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ الْغَيْظِ﴾ ئەو ئاگرە لە سەختی خۆی و بەرزبوونەوە نزیکە پارچەکانی لە یەك جوێ ببنەوە هەندێکیان لە هەندێ تریان، بە جۆرێ ئادمیزاد گومان ئەبا ڕقی لە بێباوڕان هەڵساوە خەریکە ئەندامەکانی جوێ ببنەوە.

﴿كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ﴾ هەموو کاتێ تاقمێ لە بێباوەڕان فڕە بدرێنە ناو ئاگری دۆزەخ، پاسەوانانی دۆزەخ پرسیار لەو تاقمە ئەکەن ئایا پێغەمەرێ نەهاتووە بۆلاتان بتانترسێنێ لە سزای دۆزەخ.

﴿قَالُوا بَلَى قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ﴾ ئەو تاقمە بێباوەڕە ئەڵێن: بەڵێ: بەڕاستی پێغەمەر هاتووە بۆلای ئێمە ئەیترسانین لە سزای دۆزەخ، دوایی ئێمە ئەوانمان بەدرۆخستەوە و، بەوانمان ووت: خودا هیچ شتێکی نەناردووەتە خوارەوە لە بارەی سزای دۆزەخ، ئێوە هیچ شتێ نین مەگەر هەر ئەوەبن لە ناو گومڕایی زۆر گەورەدان.

﴿وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾ وە بێباوەڕان ئەڵێن: ئەگەر ئێمە لە جیهاندا گفتوگۆی پێغەمەرەکانمان ببیستایە، یا خۆمان بە ووردی بیرمان بکردایەتەوە لە گفتوگۆی ئەوان، ئێمە لە دانیشتووان و یارانی دۆزەخ نەئەبووین.

﴿فَاعْتَرَفُوا بِذَنبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾ دوایی بێباوەڕان لە پاشەڕۆژدا، بڕوا بە گوناهەکانی خۆیان ئەهێنن و، دان بە تاوانباریی خۆیان ئەنێن، دوایی دووری لە بەزەیی خودا بۆ دانیشتووانی دۆزەخە.

إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ ﴿١٢﴾ وَأَسِرُّواْ قَوۡلَكُمۡ أَوِ ٱجۡهَرُواْ بِهِۦٓۖ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٣﴾ أَلَا

يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿١٤﴾ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ
ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولٗا فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ
﴿١٥﴾ ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ
تَمُورُ ﴿١٦﴾ أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗاۖ
فَسَتَعۡلَمُونَ كَيۡفَ نَذِيرِ ﴿١٧﴾ وَلَقَدۡ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَكَيۡفَ
كَانَ نَكِيرِ ﴿١٨﴾ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ فَوۡقَهُمۡ صَٰٓفَّٰتٖ وَيَقۡبِضۡنَۚ مَا
يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحۡمَٰنُۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءِۭ بَصِيرٌ ﴿١٩﴾

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِالْغَيْبِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ بە ڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ لە سزای پەروەردگاری خۆیان بترسن بەبێ ئەوەی پەروەردگار ببینن، بەبێ ئەوەی هیچ کەسێ بەوان بزانێ، بۆ ئەو کەسانە هەیە لێخۆشبوون و پاداشتی زۆر گەورە.

﴿وَأَسِرُّوا قَوْلَكُمْ أَوِ اجْهَرُوا بِهِ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ وە ئێوە گفتوگۆی خۆتان بکەن بە نهێنی یا بە ئاشکرا بیکەن، یەکسانە لای خودا، بە ڕاستی خودا بە شتێ ئەزانێ لە دڵی ئێوەدایە بیبێژرێ یا نەبێژرێ، هۆی هاتنەخوارەوەی ئەو ئایەتە ئەوەیە: بت پەرستان گفتوگۆی خراپیان بە پێغەمەر ئەوت، جبرەئیل پێغەمەری ئاگادارکرد لە گفتوگۆ خراپەیان.

﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ ئایا خودا خۆی نازانێ بە کەسێ خۆی درووستیکردووە، بێگومان بە هەموو شتێکی بوونەوەرانی خۆی ئەزانێ، خودا ئەزانێ بەو شتەی لە دڵدایە، ئاگادارە بە چاك و خراپی بوونەوەران.

﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رِّزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ﴾ خودا کەسێکی ئەوتۆیە زەوی ئاسان کردووە بۆ ئێوە بۆ ڕۆیشتن بە سەریدا و بۆ ئێوەی ڕام کردووە، دوایی ئێوە بە هەموو جێگە و ئەملاو لای و ڕێگەکانیا بڕۆن و، بخۆن لەو خواردەمەنی‌یەی خودا لە زەوی‌دا درووستی کردووە و، ئێوە بۆلای خودا ئەڕۆن و کۆ ئەکرێنەوە و زیندوو ئەکرێنەوە بۆ پاداشت و پرسیار و وەڵام.

سود و ئاسان کردنی زەوی، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زۆرتر دەرئەکەوێ، بە تایبەتی لەم سەردەمەی ئێمەدا، زۆرترە لە کاتانی پێشوودا، بۆ گەلانی دوای ئێمە زۆرتر ئەبێ.

دوای ئەوەی خودای مەزن باسی چاکەی خۆی کرد بەسەرمانەوە، دوایی ئەمانترسێنێ لە پاشەڕۆژی بێباوەڕی، پاش ئەوەی خودا زەوی بۆ ئاسان کردین، پێویستە بزانین زەوی وێنەی

ئەسپی سەرکێشە، کاتی وائەبێ ئەکەوێتە جم و جووڵ، ڕۆئەچێ و بومەلەرزەی تێدا پەیدا ئەبێ و قوتمان ئەدا، بۆیە خودا فەرمووی:

﴿أأمِنتُم مَّن فِي السَّمَاء أن يَخْسِفَ بِكُمُ الأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ﴾ ئایا ئێوە ناترسن لە کەسێ توانای لە ئاسماندایە کە زەوی بە ئێوە بباتە خوارەوە و ڕۆبچێ و ئێوە قوت بدا، دوایی کاتێ زەوی بەسەرنشینەکانی‌یەوە بکەونە جووڵە و ژێرا و ژوور ببێ و بێت و بروا.

﴿أَمْ أَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاء أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ﴾ ئایا ئێوە ناترسنلە کەسێ توانای لە ئاسماندایە کە بەهۆی بایەکی سەختەوە ووردە زیخ برژێ بەسەر ئێوەدا، دوایی کاتێ ئێوە سزاتان بینی ئەزانن چۆنە ئەو شتەی من ئێوەی پێ ئەترسان و، ئەو زانینەتان سوود بە ئێوە نابەخشێ.

﴿وَلَقَدْ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ وە بە ڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ لە پێش بتپەرستانی مەکەوە بوون لە گەلانی پێش پێغەمەرەکانی خۆیانیان بەدرۆخستەوە، دووایی ئەبێ چۆن بووبێ سزا و تۆڵەی من بۆ بێ‌باوەڕان؟ بێگومان زۆر سەخت بووە. دوای ئەوەی خودا بەو ئایەتانە هەڕەشەی لە ئادەمیزاد کرد، ڕووئەکاتە ئەوان و، ئەفەرموێ: تەماشای توانای خودا بکەن و پەند وەرگرن و ئەفەرموێ.

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَافَّاتٍ وَيَقْبِضْنَ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا الرَّحْمَنُ إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ بَصِيرٌ﴾ ئایا بت پەرستان نەیان ڕوانیوە بۆلای باڵندەکان لەلای سەرەوەی خۆیان باڵیان ڕائەکێشن لە ئاسماندا لە کاتی ڕۆیشتنیانا و، ئەیگوشنەوە بە تایبەتی بە تەنیشتی خۆیانەوە، ئەو باڵندەیە ڕانەگرتووە لە ئاسماندا مەگەر خودای خاوەن بەخشندە. بەڕاستی خودا هەموو شتێ ئەزانێ و، ئاگای لە هەموو شتێ هەیە و چاودێری‌یان ئەکا و ئەیانپارێزێ. باڵندەیش نەتەوەیەکن بە وێنەی ئادەمیزاد، ئەفڕێ بەهۆی دووباڵەوە. ئادەمیزاد ئەڕوا بەهۆی دوو قاچەوە و، وایش ئەبێ گەشت و گوزار ئەکا بەهۆی ماشین و فڕۆکە و کەشتی‌یەوە. ئەوانە هەموویان درووستکراوی خودان و، کردوونی بەهۆی جێ‌بەجێ کردنی نیاز و مەبەستی ئێوە. بۆیە خودا باسی باڵندەی فەرمووە، چونکە بوونەوەرێکی سەرسوڕێنەرە، هەیانە کێوین، هەیانە ماڵین، هەیانە جوان ئەخوێنن. هەیانەی مل و دەنووك درێژ. نووك و پەڕی جۆراوجۆریان هەیە. ئەوانە هەموویان بەڵگەن لەسەر توانای خودا.

أَمَّنْ هَٰذَا الَّذِي هُوَ جُندٌ لَّكُمْ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ الرَّحْمَٰنِ ۚ إِنِ الْكَافِرُونَ إِلَّا فِي غُرُورٍ ﴿٢٠﴾ أَمَّنْ هَٰذَا الَّذِي يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُ ۚ بَل لَّجُّوا فِي عُتُوٍّ

وَنُفُورٍ ﴿٢١﴾ أَفَمَن يَمْشِي مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِۦٓ أَهْدَىٰٓ أَمَّن يَمْشِي سَوِيًّا
عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢٢﴾ قُلْ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ
وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۖ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ هُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ
فِى ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ
صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلْ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٦﴾
فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيٓـَٔتْ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَقِيلَ هَٰذَا ٱلَّذِى
كُنتُم بِهِۦ تَدَّعُونَ ﴿٢٧﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِىَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِىَ
أَوْ رَحِمَنَا فَمَن يُجِيرُ ٱلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ قُلْ هُوَ
ٱلرَّحْمَٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا ۖ فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ
﴿٢٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍۭ ﴿٣٠﴾

﴿ أَمَّنْ هَذَا الَّذِي هُوَ جُندٌ لَّكُمْ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ الرَّحْمَنِ إِنِ الْكَافِرُونَ إِلَّا فِي غُرُورٍ ﴾ ئایا چ کەسێکی ئەوتۆیە، ئەو کەسە بیێ بە سوپا بۆ ئێوە، یارمەتیتان بدا لە جگەی خودای خاوەن بەخشندە، ئەگەر بیەوێ سزاتان بدا؟ بێگومان هیچ کەسێ نییە، بیباوەڕان لە وەرنەگرتنی فەرموودەی پێغەمەردا هیچ شتێکیان بۆنابێ مەگەر فریوخوردە و بیئاگا و خەڵەتاوبن.

﴿أَمَّنْ هَذَا الَّذِي يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُ بَل لَّجُّوا فِي عُتُوٍّ وَنُفُورٍ﴾ ئایا چ کەسێکی ئەوتۆیە ڕۆزی و هۆی ژیان ببەخشێ بە ئێوە ئەگەر خودا ڕۆزی خۆی بگرێتەوە لە ئێوە. بەڵکو بێباوەڕان درێژییان داوە بە یاخی بوون و، بە دوور لە ڕاستی.

﴿أَفَمَن يَمْشِي مُكِبًّا عَلَى وَجْهِهِ أَهْدَى أَمَّن يَمْشِي سَوِيًّا عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ ئایا دوایی کەسێ بڕوا بە ڕێگەدا و لەسەر ڕوومەتی کەوتبێ بە زەویدا و بۆ زەوی بڕوانێ و ئەملاولای خۆی نەبینێ، ئەو کەسە شارزاترە بۆ دۆزینەوەی ڕێگە یا بڕوا بەڕێوە، وەستابێ بە پێوە و ئەملاولایا و بەردەمی خۆی ببینێ. لەسەر ڕێگەیەکی ڕاست. بێگومان بێباوەڕان ڕێگە دەرناکەن و ناشارەزان و، ڕێگەیان سەختە و ئەکەون، باوەڕداران بە ئاسانی بە مەبەستی خۆیان ئەگەن بەبێ ئازار.

﴿قُلْ هُوَ الَّذِي أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ﴾ تۆ بڵێ: خودا کەسێکی ئەوتۆیە یەکەم جارئێوەی هێناوەتە بوونەوە و، گوێچکە و چاو و دڵی بۆ ئێوە دروست کردووە. بۆ بیستن و بینین و بیرکردنەوە لە ڕێگەی ڕاست ئامۆژگاری وەرگرن و، کەمێ لە ئێوە سوپاسی خودا ئەکەن لەسەر ئەو چاکانە، خودا ئەوانەی دروست کردووە چاکەیان پێ بدۆزرێتەوە و، بە کاریان نەیەرن لە خراپەدا.

بۆ زانین: خودای مەزن لەو فەرموودەیەی خۆیدا گوێچکەی پێش خستووە لەسەر چاو، چاوی پێش خستووە لەسەر دڵ؛ چونکە سوودی گوێچکە زۆرترە لە سوودی چاو، ئەوەتە دایك دەنگی منالی خۆی جوێ ئەکاتەوە لە ناو چەندین دەنگی جیاوازدا، گوێچکەی منال ئەکرێتەوە دوای چەن هەفتەیەکی کەم. دوای لە دایکبوونی. بەلام منال لە چاوی دایکی وون ئەبێ لە ناو کۆمەڵدا. چاوی منال لە مانگی سێهەمی تەمەنیدا ئەکرێتەوە و ئەبینێ و، دڵی مرۆڤ هیچ شتێ نازانێ مەگەر پاش ببیستن و ببینن.

﴿قُلْ هُوَ الَّذِي ذَرَأَكُمْ فِي الْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ تۆ بڵێ بەبێباوەڕان: ئەو خودایە داوا ئەکەم لە ئێوە باوەڕی پێ بهێنن خودایەکی ئەوتۆیە ئێوەی دروست کردووە و، ژمارەی ئێوەی زۆر کردووە و، بلاوی کردوونەتەوە بە ناو زەویدا، هەریەکەتان لە جێگەیە، بۆ ئەوەی سوود لە زەوی وەربگرن و خوداپەرستی بکەن و، ئێوە بۆ لای خودا ئەگەڕێنەوە بۆ پرسیار و پاداشت، میهرەبانی خودایە کە ئادەمیزای بە جۆرێ دروستکردووە، شایستەی زۆربونن، لە جێگەیەکی زەویدا نەبن بە تەنها، ئەگەر لە تەنها جێگەیدا بوونایە، ئەبون بە نیشانەی نەمان لە کاتی پەیدابوونی کارەساتی لەناوبەردا.

﴿وَيَقُولُونَ مَتَى هَذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ وە بێباوەڕان ئەڵێن بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ چ کاتێ ئەو بەڵێنەی تۆ ئەیدەی بە ئێمە زەوی ڕۆئەچێ و، ئێمە کۆ ئەکرێینەوە بۆ پرسیار و پاداشت پەیدا ئەبێ؟ ئەگەر تۆ ڕاست ئەکەی کاتی هاتنەکەیانمان پێ نیشان بدە.

﴿قُلْ إِنَّمَا الْعِلْمُ عِندَ اللَّهِ وَإِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ تۆ بڵێ لە وولامی ئەو بێباوەڕانەدا: بە ڕاستی زانینی ئەو کاتە هەر لە لای خودایە و کەسی تر نایزانێ و، بە ڕاستی من هەر پێغەمەرێکم و، ئێوە ئەترسێنم لە سزای خودا بە ئاشکرایی و، فەرموودەی خودا بە ئێوە ڕائەگەیەنم.

﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيئَتْ وُجُوهُ الَّذِينَ كَفَرُوا وَقِيلَ هَذَا الَّذِي كُنتُم بِهِ تَدَّعُونَ﴾ دوایی کاتێ بێباوەڕان ئەوەی بەڵێنی پێدرابوو لە سزای خودا نزیك بوویەوە لەوان لە ڕۆژی دواییدا، ڕوومەتی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنابوو خەفەتی لێ دەرئەکەوێ و ڕەش هەڵئەگەڕێ و، بەوان ئەبێژرێ ئەمە ئەو شتەی ئەوتۆیە ئێوە داوای هاتنیانتان ئەکرد لە جیهاندا.

﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِيَ اللَّهُ وَمَن مَّعِيَ أَوْ رَحِمَنَا فَمَن يُجِيرُ الْكَافِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ تۆ بەبێ باوەڕان بڵێ: ئایا ئێوە ئەتوانن هەواڵ بدەن بە من، ئەگەر خودامن و ئەو باوەڕدارانەی کە لەگەڵمدان بمانمرێنێ، یا خودا میهرەبانی لەگەڵ ئێمەدا بکا و تەمەنمان درێژ بکا دوایی چ کەسێ لە بێباوەڕان ڕزگار ئەکا لە سزایەکی خاوەن ئازار، بێگومان ڕزگاریان نابێ، ئێمە بمرین یا بمێنین. مردنی من و باوەڕداران سوود بە ئێوە نابەخشێ. ئێوە تووشی سزای کردەوەی خۆتان ئەبن.

﴿قُلْ هُوَ الرَّحْمَنُ آمَنَّا بِهِ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ تۆ بڵێ: خودا ئەو خودایەیە خاوەنی بەخشندەیە بۆ هەموو بوونەوەران، ئێمە باوەڕمان پێ هێناوە و، پشت هەر بەو ئەبەستین و پەنا هەر بۆ ئەو ئەبەین. دوایی کاتێ سزایە پەیدابوو، ئێوە ئەزانن چ کەسێ لە گومڕایی ئاشکرادایە، ئێمەی باوەڕدار یا ئێوەی بێباوەڕ.

﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَاؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَاءٍ مَّعِينٍ﴾ تۆ بڵێ: ئایا ئەتوانن هەواڵ بدەن بە من ئەگەر خودا ئەو ئاوەی ئێوە ببا بە زەویدا و نەیەتە دەرەوە، دوایی چ کەسێ ئاوێکی ئاسان بڕوا بەسەر زەویدا بۆ ئێوەی پەیدا ئەکا و بۆتان ئەهێنێ.

# ﴿ سورەتی ئەلقەلەم ﴾

لە مەکە هاتووەتە خوارەوە. هەندی لە زانایان ئەڵێن جگە لە ئایەتی (١٧) هەتا ئایەتی (٣٣) و جگە لە ئایەتی (٤٨) هەتا ئایەتی (٥٠) لە مەدینە هاتوونەتە خوارەوە، ژمارەی ئایەتەکانی (٥٢) ئایەتن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
نٓ ۚ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ﴿١﴾ مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ ﴿٢﴾
وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ ﴿٣﴾ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾
فَسَتُبْصِرُ وَيُبْصِرُونَ ﴿٥﴾ بِأَييِّكُمُ ٱلْمَفْتُونُ ﴿٦﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ
أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٧﴾ فَلَا تُطِعِ
ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٨﴾ وَدُّوا۟ لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ﴿٩﴾ وَلَا تُطِعْ كُلَّ
حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٍ مَّشَّآءٍۭ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ
أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ عُتُلٍّۭ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ
﴿١٤﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٥﴾
سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلْخُرْطُومِ ﴿١٦﴾

﴿ن﴾ ئەم سورەتە سوورەتی نونە. ئەم پیتە لەو پیتانەیە، ئەبێژرێن لەسەرەتای هەندێ لە سوورەتەکانی قورئانەوە. مانا و مەبەستەکانیان لە سوورەتی ئەلبەقەرە و جگەی ئەلبەقەرە باسیان کراوە.هەندێ لە زانایان ئەڵێن: نوون بە مانا ماسییە. هەندی تریان ئەڵێن: یانێ دەوات ئەوەی مورەکەبی تێ ئەکرێ، هەندێ ئەڵێن: بە مانا مورەکەبە، ئەو شتە نامەی پێ ئەنووسرێ، هەندێ تریان لایان وایە ئاماژە ئەکا بۆ نوونی (الرحمان) کۆمەڵێ لە سۆفییەکان ئەڵێن: ئاماژەیە بۆ دڵ و دەروونی ئادەمیزاد، ئەوانە هەموویان پێویستییان بە بەڵگەیە، بەڵگەیشیان باس نەکردووە.

﴿وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ﴾ وە سوێندم بەو خامەیەی ئەوتۆ شتی پێ ئەنووسرێ و، سوێندم بە شتێ ئادەمیزاد ئەینووسنەوە لە نامەکانی خودا و، لە هەموو شتێ خاوەنی سوودبێ. خودای

مەزن سوێندی خواردووە بە پێنووس، لەبەر ئەوەی سوودی بێ ئەندازەی هەیە بۆ ئادەمیزاد، پێنووس هێمایە بۆ هەموو شتێ لە ئامێری نووسین، بەهەرجۆرێ بن، لەوانەی ئێستا هەن و ئەوانەی لەمەوپاش پەیدا ئەبن، هەندێ لە زانایان ئەڵێن: مەبەست لەو شتەی ئەنووسرێ: ئەو فەرموودانەی خودایە فریشتەکان لە لەوحەلمەحفوزدا ئەینووسن.

﴿مَا أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ﴾ سوێندم بە خامە و بە شتەی ئەنووسرێتەوە: تۆ بەهۆی چاکەی پەروەردگاری خۆتەوە شێتی لە تۆ دوورە، خودا بە پێغەمەرایەتی و بە ئەقڵی تەواو، چاکەی لەگەڵ تۆ کردووە، ئیتر هەرکەسێ گومانی وابێ تۆ شێتی خۆی بە بێگومان شێتە.

﴿وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ﴾ وە بە ڕاستی بۆ تۆ هەیە پاداشتێکی نەبڕاوە و بەردەوام و بێکۆتایی، زۆر ڕونە پاداشت بەراورد ئەکرێ لەگەڵ کردەوەی زۆر بە سوود و، پێغەمەر سوودی بۆ ئادەمیزاد نایەنە ژمارە.

﴿وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ وە بە ڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت و خوویەکی زۆر پەسەند و گەورەی، تۆ هەڵساوی بە جێبەجێ کردنی هەموو فەرمانەکانی ئێمە، بەسە بۆ گەورەیی ڕەوشتی پێغەمەر. خودا سوێند ئەخوا بە گیانی پێغەمەر و ئەفەرموێ: (لعمرك انهم لفي سكرتيهم يعمهون)، بە جگەی گیانی پێغەمەر سوێندی بە گیانی هیچ کەسێکی تر نەخواردووە.بێگومان هەرکەسێ خودا ئەدەبی دابدا، ئەبێ ڕەوشتی زۆر گەورەبێ، پێغەمەر ئەفەرموێ: (أدبني ربي فأحسن تأديبي) سوودی پێغەمەر هەموو جیهانی گرتووەتەوە. بەردەوامە هەتا پاشەڕۆژ.

﴿فَسَتُبْصِرُ وَيُبْصِرُونَ بِأَييِّكُمُ الْمَفْتُونُ﴾ دوایی لەمەودوا تۆ و بێباوەڕان ئەزانن و ئەبینن، چ کەسێ لە تۆ و لەوان گیرۆدەی کاری خراپن بە وێنەی کەسێ شێت بووبێ، تۆ یا بێباوەڕان، تۆ بە ڕاستی ئەقڵ و ڕەوشتت باڵا وگەورەیە.بێباوەڕان لە پێشترین کەسن بۆ نەزانین و شێتی و گومڕایی.

﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ بە ڕاستی پەروەدگاری تۆ زاناترە بە کەسێ لایداوە لە ڕێگەی ڕاست و، زاناترە بە کەسێ ڕێگەی ڕاست وەرئەگرێ. خودا ئەزانێ بە پلەی گەورەیی و شارەزایی تۆ و، بە پلەی گومڕایی بێباوەڕان و، لەبەردەمیاندایە پرسیار و پاداشت.

﴿فَلَا تُطِعِ الْمُكَذِّبِينَ وَدُّوا لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ﴾ دوایی تۆ پەیڕەوی ئەو کەسانە خودا و نامەی خودا و پێغەمەری خودا بە درۆ ئەخەنەوە و، داوا ئەکەن لە تۆ بچیتە سەر ئایینی بێباوەڕان، ئاوات ئەخوازن تۆ سازش بکەی لەگەڵیان. دوایی ئەوان نەرمی بەکاربهێنن لەگەڵ تۆ و تاوانج نەگرنە ئایینی تۆ، ئەو کەسانەی داوای نەرمی لە تۆ ئەکەن خاوەنی ئەم ڕەوشتە خراپانەن خودا لەم ئایەتانەی دووایی‌دا باسیان ئەفەرموێ.

﴿وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ هَمَّازٍ مَّشَّاءٍ بِنَمِيمٍ﴾ وە تۆ پەیڕەوی هەموو ئەو کەسانە مەکە، بە ڕاست و بەدرۆ و بە چاك و بە خراپ سوێندی زۆر ئەخۆن و، باسی ئادەمیزاد ئەکا بە خراپە، بێ نرخ و ناپەسەندە، گفتوگۆی دانیشتووان ئەبا و ئەی هێنێ بە بوختان بۆ تێکدانی نێوانیان.

﴿مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ عُتُلٍّ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ﴾ ڕژدە و چاکە لەگەڵ کەس ناکا و ڕێگە لە کەسانی تر ئەگرێ بۆ چاکەکردن، دڵ ڕەقە و ڕەوشتێکی ووشکی هەیە، دووای ئەوانە هەموو زۆڵەکراوە بە کوڕی جگەی باوکی و باوکی خۆی ناناسێ.

﴿أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ﴾ تۆ پەیڕەوی ئەو کەسە ئەکەی لەبەر ئەوەی بەڕاستی خاوەنی دارایی و کوڕی زۆرە. ئەو کەسەی ئەو شتە ناشیرینانەی هەیە وەلیدی کوڕی موغەیرە و، خراپترینی قورەیشییەکانە و، دارایی و منالی زۆری هەبوو.

﴿إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ آيَاتُنَا قَالَ أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ﴾ هەرکاتێ بخوێنرێتەوە بەسەر ئەوکەسەدا کە دارایی و کوڕی زۆری و هەبوو ئایەتەکانی نامەی ئێمە ئەیووت: ئەو ئایەتانە نووسراوی پڕوپووچی نەتەوە پێشووەکانن.

﴿سَنَسِمُهُ عَلَى الْخُرْطُومِ﴾ ئێمە لەمەودوا داخێ ئەدەین بەسەر لوتیا و بەبێنرخی نیشانەداری ئەکەین و سەرشۆڕی ئەکەین. ئەو فەرموودەی خودایە لەوەوە هاتووە عەرەبەکان بە پیاوێکی گەورەی ناوخۆیان ئەووت: فلان کەس لوت درێژ و سەربەرزە. ئەو پیاوە لە جنگی بەدردا لووتی بریندار بوو. بەو بۆنەوە ڕەنگی تێکچوو و زۆر ناشیرینبوو، خودای مەزن ئەو پیاوە کە خۆی بە گەورە دائەنا بەهۆی دارایی و منالی زۆرە وە سەرشۆڕ و بێنرخی کرد لە هەردوو جیهاندا.

إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا۟
لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ ﴿١٧﴾ وَلَا يَسْتَثْنُونَ ﴿١٨﴾ فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ
وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿١٩﴾ فَأَصْبَحَتْ كَٱلصَّرِيمِ ﴿٢٠﴾ فَتَنَادَوْا۟ مُصْبِحِينَ ﴿٢١﴾ أَنِ
ٱغْدُوا۟ عَلَىٰ حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰرِمِينَ ﴿٢٢﴾ فَٱنطَلَقُوا۟ وَهُمْ يَتَخَٰفَتُونَ ﴿٢٣﴾
أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا ٱلْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ ﴿٢٤﴾ وَغَدَوْا۟ عَلَىٰ حَرْدٍ قَٰدِرِينَ ﴿٢٥﴾ فَلَمَّا
رَأَوْهَا قَالُوٓا۟ إِنَّا لَضَآلُّونَ ﴿٢٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٢٧﴾ قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل
لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ ﴿٢٨﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقْبَلَ

بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَلَاوَمُونَ ﴿٣٠﴾ قَالُوا يَا وَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا طَاغِينَ ﴿٣١﴾ عَسَىٰ
رَبُّنَا أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَا إِنَّا إِلَىٰ رَبِّنَا رَاغِبُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ الْعَذَابُ وَلَعَذَابُ
الْآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾

گێڕاوەتەوە: پیاوچاکێ هەبووە باخ و بۆلاخێکی زۆری هەبووە و، میوە و بەرهەمی زۆری تێدا پەیدا ئەبوو، لە کاتی کۆکردنەوەی بەرهەمی باخەکەی، ئەو پیاوە هەژارانی بانگ ئەکرد هەموو ساڵێ و بەشی ئەدان لە بەرهەمی ئەو باخە، دوایی کاتێ ئەو پیاوە کۆچی دوایی کرد کوڕەکانی بڕیاریاندا ئەو هەژارانە بێبەش بکەن لەو چاکەیە باوکیان ئەیبەخشی بە هەژاران، لەناو خۆیانا پێکهاتن سەرلەبەیانی بە نهێنی بڕۆن و بەرهەمی باخەکەیان کۆبکەنەوە، هەژاران بەوان نەزانن، بۆ جێبەجێکردنی ئەو کارە سوێندیان خوارد لە ناو خۆیانا، بۆ کردنی ئەو کارە نەیان ووت: (إن شاءَ الله) پاش ئەو سوێند خواردنە، شەوێ ئەو کوڕانە لە خەودابوون، خودا ڕووداوێکی ئاسمانی ناردە خوارەوەبۆ سەربەرهەمی باخەکە، هەموو بەرهەمەکە لەناوچوو و نەما، بەیانی کە لە خەو هەڵسان و چوون بۆ سەر باخەکەیان، تەماشایان کرد بەرهەموو و میوەکەی باخەکەیان لەناوچووە، سەریان سوڕما و لۆمەی یەکتریان ئەکرد، بەلام بێسوود بوو، یەکێ لەو کوڕانە بەوانی تری ووت: من ئامۆژگاریم نەکردن و ئەو کارە مەکەن و بەگوێتان نەکردم؟. بێگومان ئەگەر دانیشتووانی مەکەیش واز لە کاری خراپە نەیەرن و، ئەنجام و پاشەڕۆژیان بە وێنەی کوڕانی ئەو پیاوچاکە ئەبێ. دارایی و سامان و بازرگانی و ڕێزیان نامێنێ، بۆیە خودای مەزن بە دانیشتووانی مەکە ڕائەگەیەنێ و ئەفەرموێ:

﴿إِنَّا بَلَوْنَاهُمْ كَمَا بَلَوْنَا أَصْحَابَ الْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ .وَلَا يَسْتَثْنُونَ﴾ بە ڕاستی ئێمە دانیشتووانی مەکەمان تاقی کردووەتەوە، بەو وێنەیە خاوەنی ئەو بەهەشتەمان تاقیکردنەوە، کاتێ خاوەنی ئەو باخە بەرهەمدارە سوێندیان خوارد: بە ڕاستی ئێمە بەرهەمی ئەو باخە ببڕن سەرلەبەیانی و، ئەو هەژارانە باوکمان بەشی ئەدان پێمان نەزانن و ئامادەنەبن و، نەیان ووت: ئەگەر خودا ئارەزوی بکا و بڵێن: (إن شاء الله)

﴿فَطَافَ عَلَيْهَا طَائِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَائِمُونَ فَأَصْبَحَتْ كَالصَّرِيمِ﴾ دوایی سزایەك و ڕووداوێ هاتە خوار لە لایەن پەروەردەکەری تۆوە بۆ سەر ئەو بەهەشتە و، خاوەنی ئەو باخە خەوتبوون، دوایی ئەو باخە وەك باخێکی لێ هات هەموو بەرهەمەکەی بڕابێ، درەختەکانی سوتابێ و ڕەش بووبێتەوە بە وێنەی شەوی تاریك.

﴿فَتَنَادَوا مُصْبِحِينَ أَنِ اغْدُوا عَلَى حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَارِمِينَ﴾ دوایی هەندێکییان بانگی هەندێ تریان کرد: سەرلەبەیانی کە ئێوە بچنە دەرەوە بۆ سەر کێڵگە و باخ و میوەکانتان، ئەگەر ئێوە نیازی بڕینی بەرهەمی باخەکەتان هەیە، هەتا هەژاران پێیان نەزانیوە میوەکەی کۆبکەنەوە.

﴿فَانطَلَقُوا وَهُمْ يَتَخَافَتُونَ أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا الْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ﴾ دووایی چوونە دەرەوە بۆلای باخەکەیان و، ئەوان بە دەنگێکی نزم گفتوگۆیان ئەکرد، کە بۆ ئەوەی ئەو ڕۆژە هیچ هەژارێ نەڕۆنە سەر ئەو باخە.

﴿وَغَدَوْا عَلَى حَرْدٍ قَادِرِينَ فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوا إِنَّا لَضَالُّونَ﴾ وە ئەوان سەرلەبەیان چوونە دەرەوە بۆلای ئەو باخەیان و، نیازیان وابوو هەژاران بێبەش بکەن لەبەرهەمی ئەو باخە و، وایان ئەزانی ئەو باخە و ئەو بەرهەمە بە دەستی توانای ئەوانە، نەیان ئەزانی توانای خودا لەسەرەوەی توانای ئەوانە، دووایی کاتێ چوونە ناو باخەکە و سەسامبوون و، چاویان کەوت باخەکەیان سوتاوە و، بەرهەمەکەی وشکبووە و ووتیان: بە ڕاستی وادیارە ئێمە ڕێگەی باخەکەمان لێ وونبووە، ئەم باخە باخەکەی ئێمە نییە، کاتێ هەستیان کرد باخەکەی خۆیانە ووتیان ئێمە ڕێگەمان وون نەکردووە.

﴿بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ﴾ بەڵکو ئێمە بێبەشین لە چاکە و پاداشتی خودا و، شایستەی خەشم و سزای خوداین. نەك هەژاران. لە ناو ئەو کەسانەدا پیاوێکی ژیریان تێدابوو، فەرمانی پێئەدان بە چاکە و، خراپەی لەوان قەدەغە ئەکرد و، گوێیان بۆ نەئەگردت، کاتێ ئەو شتەی بینی تووشی ئەوان بووە.

﴿قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ قَالُوا سُبْحَانَ رَبِّنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ﴾ پیاوێکی ژیر و لە هەموویان ئاقڵتر لەوان ووتی: ئایا من بە ئێوەم نەووت: بۆ ئێوە پاکی بۆ خودا دەرنابڕن و سوپاسی خودا ناکەن بە کردەوە و بە گفتوگۆ، ببەخشن بە هەژاران هەندێ لە دەرامەتی باخەکەمانا، دوایی فەرمانی پێدان پەشیمان ببنەوە لەو کارە خراپەی خۆیان، ئەوانیش ووتیان: پاك و خاوێنی بۆ پەروەردگاری ئێمەیە. بەڕاستی ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد، بەو نیازە و بەو بڕیارەی دامان هەژاران بێبەش بکەین لە دەرامەتی ئەو باخە.

﴿فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ يَتَلَاوَمُونَ قَالُوا يَا وَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا طَاغِينَ﴾ دووایی هەندێکیان ڕۆیان کرد بۆ لای تریان سەرزەنشتی یەکتریان ئەکرد، خراپەیان لە خۆیان دوور ئەخستەوە و ئەیاندایە پاڵ ئەوانی تریان و ئەیان ووت: ئەی کۆس و نەمان بۆ ئێمەز بە ڕاستی کەسانێکین یاخی و ستەمکارین.

﴿عَسَى رَبُّنَا أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَا إِنَّا إِلَى رَبِّنَا رَاغِبُونَ﴾ ئومێدەوارین بە بۆنەی پیرۆزی پەشیمان بوونەوەمان پەروەردگاری ئێمە لێمان ببورێ و چاکتر لەم باخەمان پێببەخشێ لە بریتی ئەم باخە، بەڕاستی ئێمە بۆلای پەروەردگاری خۆمان پەشیمان ئەبینەوە و داوای لێبوردن و چاکەی لێ ئەکەین.

﴿كَذَلِكَ الْعَذَابُ وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾ وێنەی ئەو سزایەی ئێمە دانیشتووانی مەکە و خاوەنەکانی ئەو باخەمان تاقی کردنەوە لە جیهاندا بۆمان باسکردن و، بە ڕاستی سزای ڕۆژی دووایی گرانترە ئەگەر بزانن. بەڵام دانیشتووانی مەکە نایزانن و بڕوای پێناکەن.

مەبەست لەو وێنەیە ئەوەیە: هەموو کەسێ خودا چاکەی لەگەڵ کرد بە هەرشتێ لە گەورەیی خۆی پێویستە ئامۆژگاری بەو وێنەیەوە وەربگرێ، بە تایبەتی دانیشتووانی مەکە، هەندێکە لەوان وەلیدی کوڕی موغەیرە و، ئەگەر ئامۆژگاری وەرنەگرت تووشی کارەساتێکی بە وێنەی کارەساتی خاوەنی ئەو باخەی باسکران ئەبن، ئەگێڕێتەوە: خودای مەزن دانیشتووانی مەکەی تووشی برسێتی و گرانیی کرد، بە بۆنەی بەدرۆخستنەوەی پێغەمەرەوە، حەوت ساڵ بەردەوامبوو، وایان لێهات ئێسك و مرداربۆیان ئەخوارد، وەلیدی کوڕی موغەیرەی زەنیم، ئەو داراییە خۆی پێوە هەڵئەکێشا لە ناوچوو و نەما.

إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٣٤﴾ أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ لَكُمْ كِتَٰبٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ ﴿٣٧﴾ إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَكُمْ أَيْمَٰنٌ عَلَيْنَا بَٰلِغَةٌ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ ﴿٣٩﴾ سَلْهُمْ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ ﴿٤٠﴾ أَمْ لَهُمْ شُرَكَآءُ فَلْيَأْتُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴿٤١﴾ يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٤٢﴾ خَٰشِعَةً أَبْصَٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ وَقَدْ كَانُوا۟ يُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمْ سَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾

﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتِ النَّعِيمِ﴾ بە ڕاستی هەیە بۆ ئەو کەسانەی لە خودا ئەترسن و خۆیان ئەپارێزن لە بێفەرمانی خودا چەند بەهەشتێ چاکە و خۆشی لەواندا بەردەوامە و، ئازار و خراپەیان تێدا نییە.

بێباوەڕان ئەیان ووت: ئەو بەهەشتانە موسڵمانان ئەیانڵێن: هەن و بەلای ئێمەوە نین، ئەگەر بێشین خودا لەو بەهەشتانە بە ئێمە زۆرتر ئەدا، دڵخۆشتر ئەبین لەوەی هەمانە لە جیهاندا. خودای مەزن بە درۆیان ئەخاتەوە و ئەفەرموێ:

﴿أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ﴾ ئایا دووایی ئێمە چۆن ئەو کەسانەی موسڵمانن و ملکەچی فەرموودەی خودان و باوەڕیان هێناوە بە ئێمە، بە وێنەی ئەو کەسانەی دائەنێن تاوانبارن و بێفەرمانی خودا ئەکەن.

﴿مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ أَمْ لَكُمْ كِتَابٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ﴾ چ شتێ و چ بەڵگەیە بۆ ئێوەیە کە موسڵمانان و تاوانباران وەك یەك دائەنێن، چۆن ئێوە فەرمانی وائەدەن؟ کە چوونیان بۆ بەهەشت یەکسان بن، ئایا ئێوە هیچ نامەیەکتان هەیە بۆتان هاتبێ لە لایەن خوداوە، لەو نامەیەدا ئێوە خوێندبێتانەوە بەڕاستی بۆ ئێوە ئەبێ شتێئارەزۆی بکەن و بۆخۆتانی هەڵبژێرن لە پاشەڕۆژدا. بێگومان خۆتان ئەزانن نامەی واتان بۆ نەهاتووە لە لایەن خوداوە.

﴿أَمْ لَكُمْ أَيْمَانٌ عَلَيْنَا بَالِغَةٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ﴾ ئایا ئێوە هیچ پەیمان و بەڵێنێکی بەهێزتان هەیە بەسەر ئێمەوە، سوێندمان خواردبێ ئێوە لەگەڵ موسڵماناندا بخەینە بەهەشت و، ئەو سوێندە نەگۆڕێ هەتا ڕۆژی دووایی، لەو پەیمانەدا هاتبێ، بە ڕاستی بۆ ئێوە ئەبێ ئەو شتەی ئەوتۆ ئێوە فەرمانی پێئەدەن بۆخۆتان لە چاکە و ڕێزی خودا بۆ ئێوە. بێگومان پەیمانی بەو جۆرەتان بۆ نەدراوە.

﴿سَلْهُم أَيُّهُم بِذَلِكَ زَعِيمٌ﴾ تۆ پرسیار لەو بت پەرستە تاوانبارانە بکە: چ کەسێ لەوان ئەگرێتە ئەستۆی خۆیی و بەرپرسیارە بۆ ئەو شتەی ئەوان فەرمانی پێ ئەدەن، بەهەشت ئەدرێ بەوان لە ڕۆژی دوواییدا؟

﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاء فَلْيَأْتُوا بِشُرَكَائِهِمْ إِن كَانُوا صَادِقِينَ﴾ ئایا ئەو بت پەرستە تاوانبارانە بۆیان هەیە کەسانێکی ترهاوبەشی ئەوانبن لەو بیر و بۆچوونانەی ئەوان و یارمەتییان بدەن، دووایی با ئەوان هاوبەشەکانی خۆیان بهێنن ئەگەر ڕاست ئەکەن لەو داوایەی خۆیانا کە ئەوان ئەچنە بەهەشت.

﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ﴾ یا ئەو بت پەرستانە هاوبەشەکانی خۆیان بهێنن لە ڕۆژێکا ڕوون ئەکرێتەوە هەندێ کاری سەخت و ناهەموار لە ڕۆژی دوواییدا و، بانگی بێباوەڕان ئەکرێ لەو ڕۆژەدا بۆلای سوژدەبردن بۆ خودا، دوایی ئەوان توانای سوژدەبردنیان نابێ لەبەر سەختی ئەو ڕۆژەکە تووشی ئەوان بووە، چۆن توانایان ئەبێ و ئەژنۆیان شکاوە و دڵیان پچڕاوە و ئەقڵیان نەماوە؟

﴿خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ وَقَدْ كَانُوا يُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ وَهُمْ سَالِمُونَ﴾ کاتێ لە ڕۆژی دووایی‌دا بانگیان ئەکرێ بۆلای سوژدەبردن لە پاشەڕۆژدا چاویان بێ‌نرخە و لە ترسا هیچ شتێ نابینێ، بێ‌نرخی و داماوی ئەو تاوانبارانەی داپۆشیوە و، بەڕاستی ئەوان بانگیان کراوە بۆلای سوژدەبردن بۆ خودا لە جیهاندا و، ئەو کاتە ئەوان ئەیان توانی سوژدەبەن و دووربوون لە هەموو گیروگرفتێ و سوژدەیان بۆ خودا نەئەبرد.

فَذَرْنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ
لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٤﴾ وَأُمْلِي لَهُمْ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ ﴿٤٥﴾ أَمْ تَسْـَٔلُهُمْ أَجْرًا فَهُم
مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ ﴿٤٦﴾ أَمْ عِندَهُمُ ٱلْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ ﴿٤٧﴾ فَٱصْبِرْ
لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلْحُوتِ إِذْ نَادَىٰ وَهُوَ مَكْظُومٌ ﴿٤٨﴾ لَّوْلَآ
أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعْمَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ لَنُبِذَ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ مَذْمُومٌ ﴿٤٩﴾ فَٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ
فَجَعَلَهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٥٠﴾ وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَٰرِهِمْ
لَمَّا سَمِعُوا۟ ٱلذِّكْرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجْنُونٌ ﴿٥١﴾ وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٢﴾

﴿فَذَرْنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَذَا الْحَدِيثِ سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ﴾ دوایی تۆ خەفەت مەخۆ و، دڵت تەنگ نەبێ و، تۆ واز لە من و لەو تاقمە بهێنە ئەم قورئانە و، ئەم گفتوگۆیەی ئێمە بەدرۆئەخەنەوە، ئێمە نزیکیان ئەکەینەوە لە سزای خۆمان پلە بە پلە، لە جێگەیەکەوە هەستی پێ‌نەکەن و نەیزانن، دووایی کتوپڕ لەناویان ئەدەین، بەش و خۆشی جیهان و مۆڵەتدانی ئەوان سەری لێ تێکداون.

﴿وَأَمْلِي لَهُمْ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ﴾ وەمن مۆڵەتی بێ‌باوەڕان ئەدەم لە جیهاندا، هەتا گوناهی زۆرتر بکەن، هەتا کاتی سزادانیان دێت، ئەو کاتە سزاکەیان دواناخرێ. بە ڕاستی سزای ئێمە زۆر سەختە و کەس ناتوانێ ڕێگەی لێ بگرێ.

﴿أَمْ تَسْأَلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ﴾ ئایا تۆ داوای کرێ ئەکەی لە بێ‌باوەڕان لەسەر ڕاگەیاندنی فەرمان و سروشی خودا بەوان، دووایی ئەوان، بۆ بەخشینی ئەو دارایی‌یە باریان قورس بێ و نەتوانن بیبیژن لەبەر زۆری ئەو کرێیە و، واز لە باوەڕهێنان بهێنن.

﴿أَمْ عِندَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ﴾ ئایا بێ‌باوەڕان لایان هەیە ئاگاداری لەسەر شتێ لەبەر چاو نی‌یە کە لەوحەل مەحفوزە، دووایی ئەوان بینوسن ئەو شتەی لەودایە ڕزگاریان ئەکا لە سزای

خودا بە گومانی خۆیان و، پێویستیان بە زانستی تۆ نەبێ، بێگومان ئەو شتە لە توانای جگەی خودادا نییە.

﴿فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ الْحُوتِ إِذْ نَادَى وَهُوَ مَكْظُومٌ﴾ دوایی تۆ ئارام بگرە لەسەر ئازاری بت پەرستان لەبەرفەرماندانی پەروەردگاری خۆت کە سزای ئەوانی دواخستووە و، تۆ بە وێنەی یونسی هاوڕێ و یاری نەهەنگەکە مەبە ئارامی نەگرت و چاوەڕوانی کاری خودای نەکرد لەبارەی تاقمەکەی خۆیەوە، ئەو خاوەن حوتە دڵی پڕبووبو لە خەفەت و ڕقی ئەوەی خودا سزای نەناردە سەریان لای تاقمەکەی ڕۆیشت و سواری کەشتییە بوو و کەوتە ناوی دەریاکەوە و، نەهەنگێ قووتی دا، کاتێ پاڕایەوە لە پەروەدگاری خۆی لە ناو سکی ئەو حوتەدا دڵی پڕبووبو لە خەفەت و ڕق لە تاقمەکەی خۆی.

﴿لَوْلَا أَن تَدَارَكَهُ نِعْمَةٌ مِّن رَّبِّهِ لَنُبِذَ بِالْعَرَاءِ وَهُوَ مَذْمُومٌ﴾ ئەگەر چاکە و بەزەیی پەروەدگاری خۆی نەبووایە کە بەسەری گرتەوە، بە ڕاستی خاوەن نەهەنگ فڕە ئەدرا لە دەشتێکی چۆڵی بێخواردەمەنی و بەو بۆنەوە لۆمەی ئەکرا، لە دوای کەوتنە خوارەوەی لە سکی نەهەنگەکە.

﴿فَاجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَجَعَلَهُ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ دوایی پەروەدگاری خۆت هەڵیبژارد و کردی بە پێغەمەر، دوایی کردی بە یەکێ لە پیاوچاکانی بە جۆرێ پاداشتی لە شتێ وازلێهێنانی چاکتربێ لە کردنی.

هەرچەندە لە ئایەتی (٩٨) سوورەتی یونس و لە ئایەتی (٧٨) سورەتی (ئەلئەنبیا)دا و لە ئایەتی (١٤٠)ی سورەتی (سافدا) ئاماژە بۆ بەسەرهاتی یونس کراوە. بە کورتی باسەکەی لێرەدا دووپات ئەکەینەوە: خودا یونسی کرد بە پێغەمەر و، ڕەوانەی کرد بۆلای کۆمەڵێ لە دانیشتووانی (نەینەوا) کە شارێکە لای موسڵی عێراق، ژمارەیان زۆرتر بوون لە سەد هەزار کەس و بت پەرستبوون، یەکەم جار وولامیان نەدایەوە، بەو بۆنەیەوە یونس تووڕەبوو لەوان، دوای ماندووبوونێکی زۆر لەگەڵیان و درێژەدان بە داواکەی، دانیشتووانی نەینەوا، هەر بەردەوامبوون لەسەر بێباوەڕیی خۆیان، یونس تازەکرابوو بە پێغەمەرڕانەهاتبوو لەسەر ئازار. بۆیە کۆڵی دا و وازی لەو کومەڵە هێنا بەو نیازە خودا سزایان نادا، ڕۆیشت هەتا گەیشتە کەناری دەریای سپی. سواری کەشتییە بوو کە پڕبوو لە ئادەمیزاد و کەل و پەلی تر، لەبەر ئەوەی بارەکەی قورس بوو نزیکبوو ئەو کەشتییە بکەوێتە ژێر ئاوەوە، دوایی کەل و پەلەکانیان فڕە دایە نێو ئاوی دەریاوە، هێشا بارەکەی قورسبوو، وایان بە باش زانی هەندێ لە پیاوەکانیش فڕەبدەنە ناو ئاو، پشکیان خست و کەوتە بەر یونس و خستیانە ناو دەریاوە، نەهەنگێکی گەورە قووتیدا، خودا فەرمانی پێدا ئازاری یونس نەدا قورگی نەهەنگ بوو بە گرتوخانەی یونس بۆماوەیە، لە خودا پاڕایەوە و داوای لێبوردنی لێکرد، خودا نزاکەی وەرگرت، دووایی

نەهەنگە یونسی فڕەدایە بیابانێکی چۆڵ، لە پاشانا گەڕایەوە بۆلای ئەو تاقمە لەوان تورەبوبو، دوایی ئەوانیش هەموویان باوەڕیان هێنا.

خودای مەزن هەواڵ ئەدا بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کە بێباوەڕان چاویان بڕیوەتە تۆ، بە چاوی دوژمنایەتی بە تایبەتی کاتێ تۆ قورئان ئەخوێنێ و گوێی لێئەگرن، بە جۆرێ بیکەن بە چاوی پیسییانەوە لە ناوی ببەن، وەك خودای مەزن ئەفەرموێ:

﴿وَإِن يَكَادُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَارِهِمْ لَمَّا سَمِعُوا الذِّكْرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُ لَمَجْنُونٌ وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ﴾ وە بە ڕاستی نزیکە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە تۆ بکەن بەچاوی خۆیانەوە، لە ناوت بدەن کاتێ خوێندنی قورئانیان ئەبیست و، ئەڵێن لەبەر دڵپیسی خۆیان بە ڕاستی موحەممەد شێتە و، بە ڕاستی ئەو قورئانە هیچ نییە مەگەر ئامۆژگاری کردنە بۆ هەموو بوونەوەران، ئەو بێباوەڕانەی شێت کردووە نازانن هیچ شتێ بکەن.

بۆ زانین: ئەو ئایەتە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قورئان سروش و فەرموودەی خودایە، دانراوی موحەممەد نییە، بەو جۆرەی دوژمنانی پێغەمەر ئەیڵێن، ئەگەر دانراوی خودا نەبێ هیچ ئادەمیزادێ جگەی موحەممەد توانای ئەوەی نابێ تاقمێکی کەم کۆببنەوە و ئازاریان بدرێ و کۆڵ نەدەن، لە پاشانا ئەو قورئانە بە ڕاشکاوی دەری ببڕێ کە قورئان ئامۆژگاری‌کەری هەموو بوونەوەرانە بە گشتی، نەك بە تەنها بۆ عەرەب، ناوەڕۆکی ئەو قورئانە دەری ئەخا ئایینی ئیسلام هەموو ڕووی زەوی ئەگرێتەوە، زۆربەیان ڕانومایی ئەکا، ئەو کارە هیچ ئادەمیزادێ ناتوانێ بیڵێ ئەگەر سروش نەبێ، هەروایش بوو ئەو هەواڵەی قورئان هاتەدیی، دوای کۆچکردنی پێغەمەر بەچەن ساڵێ و درێژەی کێشا و هەتا ئێستا و ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو پێش ئەڕوا، ئەوەتە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەموو ڕووی سەر زەوی گرتووەتەوە، زۆربەی دانیشتووانی سەرزەوی باوەڕیان پێ هێناوە، بە تایبەتی پسپۆڕانی هونەر و زانستی فێری قورئان ئەبن و جگەی خۆیان فێر ئەکەن.

زانایان هەموویان ئەڵێن: مەبەست لە ڕستەی ﴿لَيُزْلِقُونَكَ﴾ یانێ بێباوەڕان تۆ تووشی نەمان بکەن بەهۆی چاوی پیسییانەوە، هەروەها زانایان بە گشتی جگەی کەمێکییان، بەلایانەوە وایە: چاوی پیس کاری‌گەرە بۆ ئەوەی هەندێ کەس تووشی ئازار بکا، چوونکە قەدەغە نییە خودای مەزن بە جۆرێکی ئاسایی ئەو کاریگەرییە درووست بکا لە هەندێ چاودا، لەبەر جۆرە سودێ ئێمە نایزانن، بەڵگەیش بە دەستی ئەو زانایانەیشەوە هەیە بەم ئایەتەوە و بە جگەی ئەو ئایەتەش لەمانە:

١ - ئایەتی (٦٨)ی سورەتی یوسف، یەعقوب فەرمووی بە کوڕەکانی خۆی ﴿لاَ تَدْخُلُواْ مِن بَابٍ وَاحِدٍ وَادْخُلُواْ مِنْ أَبْوَابٍ مُّتَفَرِّقَةٍ﴾ مەبەستی یەعقوب ئەوەبوو کوڕەکانی نەبن بە چاووە، چونکە شۆخ و شەنگ بوون.

٢- ئەسمای کچی عەمیس ووتی: ئەی نێردراوی خودا: کوڕەکانی جەعفەر لەوانەیە بین بە چاوەوە ئایا من نوشتەیان بۆ ئەکەم؟ پێغەمەر فەرمووی: بەڵێ بۆیان بکە، ئەگەر شتێ پێش ویستی خودا بکەوتایە، چاوپێشی ئەکەوت. ئەبوهورەیرە و تورمزی گێڕراویانەتەوە لە پێغەمەرەوە: بە چاوەوەبوون ڕاستە. حەسەن ئەڵێ: دەرمانی کەسێ تووشی بە چاوەبوونەوە بووبێ ئەو ئایەتەی (٥٢)ی ئەم سورەتەی بەسەردا بخوێنن.

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ پاڕاوەتەوە لە خودا: حەسەن و حوسەین بپارێزێ لە چاوپیسی، ئیبراهیم بۆ گوڕەکانی و موسا و بۆ هاروونی برای پاڕاونەتەوە خودا لە چاو بیانپارێزێ.

بە کورتی زانایان پێکهاتوون لەسەر ئەوەی چاو کاریگەرە بۆ تووشبوونی ئازار، جگە لە (جەبانی) ئەڵێ: بە چاوەبون ڕاست نی‌یە، بەڵگەیشی نی‌یە، زانایان بەو بەڵگانەی باسکران وەڵامیان داوەتەوە. بۆ ڕونکردنەوەی ئەو مەبەستە تەماشای تەفسیرەکان و نامەی فەرموودەکانی پێغەمەر بکەن.

## ﴿ سورەتی ئەلحاقە ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٥٢) ئایەتن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلْحَآقَّةُ ﴿١﴾ مَا ٱلْحَآقَّةُ ﴿٢﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحَآقَّةُ ﴿٣﴾ كَذَّبَتْ ثَمُودُ
وَعَادٌۢ بِٱلْقَارِعَةِ ﴿٤﴾ فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُوا۟ بِٱلطَّاغِيَةِ ﴿٥﴾ وَأَمَّا
عَادٌ فَأُهْلِكُوا۟ بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ
سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى ٱلْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ
كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴿٧﴾ فَهَلْ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٍ ﴿٨﴾
وَجَآءَ فِرْعَوْنُ وَمَن قَبْلَهُۥ وَٱلْمُؤْتَفِكَٰتُ بِٱلْخَاطِئَةِ ﴿٩﴾ فَعَصَوْا۟ رَسُولَ
رَبِّهِمْ فَأَخَذَهُمْ أَخْذَةً رَّابِيَةً ﴿١٠﴾ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلْمَآءُ حَمَلْنَٰكُمْ فِى ٱلْجَارِيَةِ
﴿١١﴾ لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً وَتَعِيَهَآ أُذُنٌ وَٰعِيَةٌ ﴿١٢﴾ فَإِذَا نُفِخَ فِى ٱلصُّورِ
نَفْخَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴿١٣﴾ وَحُمِلَتِ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَٰحِدَةً ﴿١٤﴾
فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ﴿١٥﴾ وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِىَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ
﴿١٦﴾ وَٱلْمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَا وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ
﴿١٧﴾ يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ﴿١٨﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان**

﴿الْحَاقَّةُ .مَا الْحَاقَّةُ .وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحَاقَّةُ﴾ ئەو کاتەی پەیدابوونی پێویستە، کاتێکی ئەوتۆیە گومان لە هاتنیا نیە. چ شتێکە ئەو کاتە و، چ شتێکە ڕای بگەیەنێ بەتۆ ئەوە چ شتێکە، دوایی تۆ ڕاستی چۆنی‌یەتی ئەو کاتە نازانی. بە ڕاستی ئەو کاتە ئەوەندە سەختە زانینی بوونەوەران بەو ناگا؟ دوای ئەوەی خودای مەزن باسی سەختی ئەو کاتەی ڕوون کردووەتـەوە. باسی هـەندێ لەو تاقمانە ئەکا باوەڕیان بەو ڕۆژ نەبووە و، ئەفەرموێ:

﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ وَعَادٌ بِالْقَارِعَةِ﴾ هۆزی سەمود کە هۆزیّ بوون لـە عـەرەب و، دانیشـتووی ﴿حیجر﴾ بوون لـه باکووری حیجاز، خودا سالّح پێغەمەری بۆناردن و، هۆزی عاد کـه هـۆزیّ بوون لـه عەرەب و دانیشتووی (ئەحقاف) بوون. لـه یەمەن. خودا هـود پێغەمـەری بـۆ نـاردن، هەردوو هۆزەکە بە درۆیان خستەوە هاتنی ئەو کاتە پێویستە هاتنی و دڵی ئادەمیزاد ئەلـەرزێنیّ سەختی‌یەکەی و، باوەڕیان پیّ نەهێنا.

﴿فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُوا بِالطَّاغِيَةِ﴾ دوایی تاقمی سەمود لـەناوبران بەهۆی دەنگێکی زۆر سەختی ناهەمواری لـه سنوور دەرچووە، کە بومەلـەرزەیەبوو هەموو خانو جێگە و کۆشك و پیشەسازی ئەوانی ڕوخاند.

﴿وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَانِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا﴾ وە تاقمی عاد لـەناوبران بە بایەکی زۆر ساردی کاول کەری زۆر سەخت و تیژ و بەتین. خودا ئـەو بایەی دابوو بەسەری‌یانا حەوت شەو و هەشت ڕۆژ بە دوای یەکدا بنـەبڕی کـردن، ئـەو بایـە نەبڕاوەیە هەتا هەموویان لـه ناو چوون.

﴿فَتَرَى الْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَى كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ﴾ دووایـی تۆ ئـەو تاقمـەت ئـەبینی بـە مردوویی فڕەدرابوون بەسەر زەوی‌دا لـه ناو ئەو ڕۆژانەدا، کەوتبوون بە وێنەی بنکی دارخورمـا بە ناوەکەی بۆشبیّ.

﴿فَهَلْ تَرَى لَهُم مِّن بَاقِيَةٍ﴾ ئایا دووایـی تـۆ ئـەبینی لـەو تاقمـە هیـچ کەسـیان مابێتـەوە بـە زیندوویی بێگومان کەسیان نەمابوو، جێگەکانیان چۆڵ و هۆڵ و بیّ ئاوەدانی.

﴿وَجَاء فِرْعَوْنُ وَمَن قَبْلَهُ وَالْمُؤْتَفِكَاتُ بِالْخَاطِئَةِ﴾ وە فیرعەون و تاقمەکەی و، ئەو تاقمانـەی پێش ئەوان و، گوندە ژێراوژوورکراوەکانی تـاقمی لـوت هاتبوونـە سـەر زەوی بـە کـردەوەی خراپی‌یانەوە.

﴿فَعَصَوْا رَسُولَ رَبِّهِمْ فَأَخَذَهُمْ أَخْذَةً رَّابِيَةً﴾ دوایـی ئـەو تاقمانـە بیّفـەرمانی نـێراوی پەروەردگاری خۆیانیان کرد، دوایی پەروەردگار سزای ئەوانی دا بە سزایەکی زۆر سەخت.

﴿إِنَّا لَمَّا طَغَى الْمَاء حَمَلْنَاكُمْ فِي الْجَارِيَةِ لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً وَتَعِيَهَا أُذُنٌ وَاعِيَةٌ﴾ بە ڕاسـتی ئێمە کاتیّ ئاوی لافاو زۆربوو پـەڕەی سـەند باوباپیری ئێوەمـان نایـە نـاو کەشتی نووحـەوە، لـەبەرئەوەی ئێمـە ڕزگـاربوونی بـاوەڕداران و خنکـاندنی بیّبـاوەڕان بکـەین. بەتـەمیّ‌کردن و ئامۆژگاری بۆ ئادەمیزاد و، لـەبەر ئەوەی گوێچکەیەکی هۆشیار ئەو ڕووداوە ببیسیّ و بزانیّ و لـەبیر نەچێتەوە.

﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ نَفْخَةٌ وَاحِدَةٌ ۝ وَحُمِلَتِ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَاحِدَةً﴾ دووایـی کاتیّ فوو کرا بە سوردا، بۆ ئاگادارکردنەوەی ئادەمیزاد بە هاتنی پاشەڕۆژ بـە تەنـها فوویـە و،

زەوی و کێوەکان کەوتنە جووڵە و لە جێگەی خۆیانا بەرزبوونەوە، دوایی زەوی و کێوەکان دایان لە یەکتری و بوون بە پارچەیەکی تەنها.

﴿فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ وَانشَقَّتِ السَّمَاءُ فَهِيَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ﴾ دووایی ئەو ڕۆژە پاشەڕۆژ پەیدائەبێ و ئادەمیزاد زیندوو ئەکرێنەوە و، ئاسمان پەیڕەو و پرۆگرامی تێك ئەچێ بە وێنەی زەوی، دووایی ئاسمان پارچە پارچە ئەبێ و، لاواز ئەبێ، ئەو کاتە بێباوەڕان ئەزانن پاشەڕۆژ گومانی تێدانییە.

زانایان ئەڵێن: سێ جار فوو ئەکرێ بە سووردا: یەکەم جار بۆ ترساندنی ئادەمیزاد. دووەم جار بۆ ئەوەی هەموو گیانداران بمرن، سێیەم جار بۆ ئەوەی هەموو مردووەکان زیندوو ببنەوە و، لە گۆڕەکانیان بێنە دەرەوە.

﴿وَالْمَلَكُ عَلَى أَرْجَائِهَا وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ﴾ وە فریشتەکان دوای ڕووخان و نەمانی زەوی و ئاسمان بڵاوئەبنەوە بەم لاو لای ئەو ئاسمانە ڕووخاوەدا، بە وێنەی خانوویە بڕووخێنێ دانیشتووانی ئەو خانووە بەم لاو لای ئەو خانوو ڕووخاوەدا ئەوەستن و، لەو ڕۆژەی دوواییدا ئاسمانەکان ڕووخان هەشت نەفەر یان هەشت تاقم لە فریشتەکان تەخت و کورسی پەروەردگاری تۆ ئەخەنە سەر سەریان و هەڵی ئەگرن.

ئایا خودای مەزن تەختی هەیە لەسەری دانیشێ بە وێنەی پاشایان؟ زانایان لەو بارەوە بیروبۆچونیان جیاوازە: زانایانی ڕواڵەت ناس ئەڵێن: بەڵێ. خودا گوێچکە و چاو و دەست و پێ و ئەندامی تری هەیە.

ئەبو عامیری قوڕەیشی ئەڵێ: خودا بە وێنەی ئێمەیە لە شێوازدا. بێگومان ئەم بیروڕایانە ناگونجێن بۆ خودا، خوودا دوورە لە شێواز و وێنە، چونکە ئەگەر خودا لەش و ئەندامی هەبێت پێویستی بە جێگە ئەبێت، ئەوەش دوورە لە خوداوە... هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ئێمە نازانین ئەو عەرشە چۆنە و، چۆن هەڵئەگیرێ.

خودا داوای لە ئێمە نەکردووە ئەو شتە بزانین، ئێمە بڕوامان بە فەرموودەی خودا هەیە، بە هەرچۆنێ بێ. بەڵام ئەگەر ئێمە لە مانا و مەبەستی ووشە و زمانی عەرەب بیر بکەینەوە، ئەم ئایەتە و چەن ئایەتی تر بە گوێرەی داڕشتنی فەرموودەکانی خودا، مەبەست لە عەرش دەستەڵاتە و پادشایەتی خودایە. مەبەست لە هەڵگرانی عەرش، چەن بوونەوەرێکی خوودان کە فەرمانبەرداری خودان. لێرەدا ئەم پرسیار و وولامانە دێنە کایەوە.

پرسیار: ئەگەر ئاسمانەکان و زەوی نەمێنن، هیچ شتی نامێنێ خودا دەستەڵاتی ببێ بەسەریا؟

وەلام: ئەو پرسیارە جێگەی خۆی نییە، ئەو کاتە دوای ئاسمان و زەوی بوونەوەری تر هەن، ئەوانەیش بریتین لە هەشت بوونەوەر، کە بەبێ دەستکاری ئەمێنن، خودا هەڵیان ئەسووڕێنێ بە هەرجۆرێ ئارەزووی هەبێ، لە دوای کاول بوونی زەوی و ئاسمانەکان.

﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَى مِنكُمْ خَافِيَةٌ﴾ لەو ڕۆژەی دواییدا ئێوە ڕائەنوێررێن و ڕائەوەستن لەبەر دەم توانای خودادا، بۆ پرسیارو وەلاّم و پاداشت، پەنـهان و شاراوەنابێ لـە ئێوە هیچ کارێ ئێوە بتانەوێ بیشارنەوە.

فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ
كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقْرَءُوا۟ كِتَٰبِيَهْ ﴿١٩﴾ إِنِّى ظَنَنتُ أَنِّى مُلَٰقٍ
حِسَابِيَهْ ﴿٢٠﴾ فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٢١﴾ فِى جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿٢٢﴾
قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ ﴿٢٣﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔا بِمَآ أَسْلَفْتُمْ فِى ٱلْأَيَّامِ
ٱلْخَالِيَةِ ﴿٢٤﴾ وَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُوتَ كِتَٰبِيَهْ
﴿٢٥﴾ وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ ﴿٢٦﴾ يَٰلَيْتَهَا كَانَتِ ٱلْقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ مَآ أَغْنَىٰ
عَنِّى مَالِيَهْ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّى سُلْطَٰنِيَهْ ﴿٢٩﴾ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلْجَحِيمَ
صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِى سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَٱسْلُكُوهُ ﴿٣٢﴾ إِنَّهُۥ
كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣٤﴾
فَلَيْسَ لَهُ ٱلْيَوْمَ هَٰهُنَا حَمِيمٌ ﴿٣٥﴾ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ ﴿٣٦﴾ لَّا يَأْكُلُهُۥٓ
إِلَّا ٱلْخَٰطِـُٔونَ ﴿٣٧﴾

لەو کاتەدا ئادەمیزاد ڕائەبوێرن بەسەر خودادا، ئادەمیزاد ئەکرێن بە دوو بەش: پیاو چاکان. پیاو خراپەکان، قورئان بە درێژی باسیا ئەکاو ئەفەرموێ:

﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَيَقُولُ هَاؤُمُ اقْرَؤُوا كِتَابِيهْ﴾ دوایی هەر کەسێ نامـەی کـرداری بدرێ بە دەستی ڕاستیەوە، دوایی ئەو کەسە بەسەر بەرزییەوە ئەڵێ بەهاوڕێکانی: ئێـوە وەرن و بگرن ئەم نامەیە ئێوە بیخوێننەوە نامەی کرداری من.

﴿إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَاقٍ حِسَابِيهْ﴾ بەڕاستی من بڕوام وابو تووشی پرسیاری خۆم ئەبم لە ڕۆژی دواییدا.

﴿فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ﴾ دوایـی ئـەو کەسـە لـەناو گـوزەران و ژیانێکدایـە خاوەنەکـەی زۆری لێ‌ڕازیـەو پێـی خۆشـحاڵە، لـەناو بەهەشـتێکی بڵنـدو بـەرزو پایەدارایە، میوەی ئەو لەیەکەوە نزیکن، بە ڕاوەستان و دانیشتن و ڕاکێشانەوە دەست پێی ئەگا، بەو کەسە ئەبێژێ.

﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الْأَيَّامِ الْخَالِيَةِ﴾ ئێوە بخۆن لـە میوەی درەختـی ئـەو بـەهەشتەو، بخۆنەوە لـە ئاوی ڕوبارەکانی، خواردن و خواردنەوەیە پەسەندو بێ دەردو مردن و بـێ ئازار، بەهۆی ئەو شتەی پێشتان خستوە بۆخۆتان لـە ڕۆژانی ڕابوردوودا لـە جیهاندا.

﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيَهْ﴾ وەهەرکەسـێ نامـەی کـردار بدرێ بە دەستی چەپییەوە، ئەڵێ: ئەی کاشکایە: ئـەم نامەیـەم نەدرایـەتێ، چونکـە کـردەوەی خراپم کردوە، کردەوە خراپەکانی منی تێدا نوسراوە.

﴿وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ﴾ وەئەی خۆزگایە: نەمزانییایە چ شتێکەو چۆنە پرسیاری من، چونکـە سوودی منی تێدانیەو بەزیانی من تەواو ئەبێ.

﴿يَا لَيْتَهَا كَانَتِ الْقَاضِيَةَ﴾ ئەی خۆزگایە: ئەو مردنەی من لـە جیـهاندا کۆتـایی بـە هـەموو کارێکی من ئەهێناو زیندو نەکرامایەوە.

﴿مَا أَغْنَى عَنِّي مَالِيَهْ هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيَهْ﴾ هیچ سودێکی نەبەخشی بە مـن دارابیەکـەی مـن، نەمایەوەو لـەناو چوە دەستەڵاتی من بەسەر دانیشتوانی جیهاندا، دوایی خـودا فـەرمان ئـەدا بـە فریشتەکانی کە سزایان بێ سپێردراوە.

﴿خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَاسْلُكُوهُ﴾ ئێـوە ئـەو تاوانبارە بگرن و، دووایی پێونی بکەن و دەستی ببەستێ بە ملیەوە، لە پاشا بیخەنە ناو ئاگرێکی گەورەوە، لەبەر ئەوەی خۆی لـە جیهاندا بە گەورە دانـاوە، سـزای گـەورە شایستەی سـزای گەورەیە، لـە پاشانا بیخەنە ناو زەنجیرێ درێژییەکەی حەفتا گـەز بـێ بیـدەن بـە چـواردەوری لـەشی‌یا.

﴿إِنَّهُ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ وَلَا يَحُضُّ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ﴾ لـەبەر ئەوەی بە ڕاسـتی ئـەو تاوانبارە بـڕوای بـە خـودای گـەورە نـەهێناوە و، هـانی دانیشـتووانی نـەداوە لـەسـەر ئـەوەی خواردەمەنی بدرێ بە هەژاران و، خۆیشی خواردەمەنی نەداونەتێ و ئاوڕی لێ نەداونەتەوە.

﴿فَلَيْسَ لَهُ الْيَوْمَ هَاهُنَا حَمِيمٌ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ لَا يَأْكُلُهُ إِلَّا الْخَاطِؤُونَ﴾ دوایی لـێرە بـۆ ئەو تاوانبارە دڵ ڕەقە هیچ دۆستێکی نی‌یـە ئـەمڕۆ بـۆی بپارێتـەوە و، هیـچ خواردەمەنی‌یـەکی نادرێتێ، مەگەر کیم و زۆخ و خوێنـی لـەشـی دۆزەخی‌یـەکان، ئـەو خواردنـە نـاخۆن مەگـەر تاوانباران و گوناهباران.


فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَا تُبۡصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبۡصِرُونَ ﴿٣٩﴾
إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ﴿٤٠﴾ وَمَا هُوَ بِقَوۡلِ شَاعِرٖۚ قَلِيلٗا مَّا تُؤۡمِنُونَ ﴿٤١﴾
وَلَا بِقَوۡلِ كَاهِنٖۚ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٣﴾ وَلَوۡ

تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا
مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِنَّهُۥ لَتَذْكِرَةٌ
لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَسْرَةٌ عَلَى
ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴿٥١﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٥٢﴾

﴿فَلَا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ وَمَا لَا تُبْصِرُونَ إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ﴾ دووایی بە ڕاستی من سوێند ئەخۆم بە شتێ ئێوە ئەیبینن لە ئاسمانەکان و زەوی و شتی تر، بە شتێ ئێوە نایبینن لـە فریشـتە و گیانی زیندەوەران، بە ڕاستی ئەو قورئانە گفتوگۆی نێردراوێکی زۆر گەورە و بەڕێزە، بە سروش لە لایەن خوداوە بۆی هاتووە، ڕای بگەیەنێ بە ئادەمیزاد و جنۆکە.

بۆ زانین: زۆربەی زۆری زانایان ئەڵێن: پیتی (لا) لەم ئایەتە و لە ئایەتی (٧٦)ی ئەلواقیعە و لە ئایەتی (١)ی سورەتی (ئەلبەلەددا) زیادەیە و تێهەڵکێش کراوە بۆ پتەوکردنی مەبەست لەو سوێندە و خراوەتە سەر ڕستەی (أُقْسِمُ). هەندێ لە زانایان ئەڵێن: زیاد نییە و، ئـەو مەبەسـتانە ئەوەندە ئاشکران، پێویستییان بە سوێندخواردن نییە. بەڵام ئـەوەی ڕاسـتی بـێ بـیروبۆچوونی زیادبوونی پیتی (لا) ڕاسترە؛ چونکە لە سورەتی ئەلواقیعەدا، لە دوای ڕسـتەی ﴿فَلَا أُقْسِمُ﴾ ئەفەرموێ:

﴿وَ إِنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ﴾ نموونە بۆ زیادبوونی پیتی (لا) لە قورئاندا زۆرن ﴿لِئَلاَ يَعْلَمُ أَهْلَ الكِتَابِ. ما مَنْكَ أَنْ لا تَسْجُدْ﴾.

﴿وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ قَلِيلًا مَا تُؤْمِنُونَ وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ قَلِيلًا مَا تَذَكَّرُونَ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ﴾ وە ئەو قورئانە گفتوگۆی شاعیر نییە، کەمێ لە ئێوە بـاوەڕ ئـەهێنن، کـە داڕژاندنـی ڕستەکانی قورئان و، هۆندنەوەی شیعر، زۆر جیاوازن لە یەکتری بە گوێرەی هونەری شـیعر و، گفتوگۆی پۆشە وێژ نییە، کەمێ لە ئێوە پەند وەرئەگرن وبیر ئەکەنـەوە، چونکـە قورئـان لـە گفتوگۆی پۆشەوێژ ناچێ بە هیچ جۆرێ، قورئان نێردراوەتە خوارەوە لـە لایـەن پـەروەردگاری هەموو بوونەوەرانەوە.

پرسیار: ئایا تەنها سوێند خواردن ڕوونی ئەکاتەوە: قورئان پەیامێکە خـودا ناردوویـە بـۆلای موحەممەد وشیعر و پۆشە نییە؟

وەڵام: ئەو سوێندە دوای ئەوە هاتووە، خودا داوای لە بێباوەڕان کرد لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئاندا:

ئەگەر ئێوە ئەڵێن: فەرموودەی خودا نییە، وێنەی ئەو قورئانە دابنێن و، نەیان توانی کەواتـە ئەو سوێندە بۆ پتەوکردنی ڕاستی قورئانە و ئەو بەڵگانە، نەك بۆ ڕوون کردنەوەی ڕاستی قورئان بەهۆی سوێندەوە.

﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِـالْيَمِينِ﴾ وە ئەگـەر موحەممـەد بـە درۆ هـەندێ گفتوگۆ لـە لایەن خۆیەوە هەڵبەستێ و بیدا بەسەر ئێمەدا و بڵێ: لـە لایەن خوداوە بۆم هاتووە، بە ڕاستی ئێمـە بـە هـەموو توانـای خۆمـان موحەممـەد ئـەگرین و سـزای ئـەدەین و تۆڵـەی لێ ئەکەینەوە.

﴿ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ﴾ لـــە پاشـان ئێمـە بـە نۆکـەی دڵـی موحەممەد ئەپچڕێنین و، شادەماری ملی ئەبڕین و خوێن نەڕوا بۆ مێشکی و کتوپڕ بمرێ، دووایی هیچ کەس لـە ئێوە بەرگری لـە موحەممەد ناکا و کەس ناگاتە فریای.

بە کورتی موحەممەد دوورە لـەوەی بت پەرستان ئەیدەنە پاڵی کە خۆی بە درۆ شتێ ئـەڵێ و ئەیداتە پاڵ خودا، ئەگەر شتی وا بکا، خودا تۆڵەی لێ ئەسێنێ، زۆر بە سەختی و هیچ کەسێ لـە ئادەمیزاد ڕێگەی پێ ناگرێ و لـەناوی ئەبا.

پرسیار: لـەبەر چ شتێ خودای مەزن بە گورجی سزای کەسێ نادا پێغەمەر بە درۆبخاتەوە، بە وێنەی پێغەمەر ئەگەر درۆبکا؟

وەڵام: بە ڕاستی ئەو هەڕەشەی خودایە بۆ کەسێکە بە درۆ و بە بوختان بڵێ: من پێغەمەرم، بۆ کەسێ پێغەمەران بە درۆ بخاتــەوە، جیـاوازی نێـوان ئـەو دوو کەسـانە زۆر زۆرە، ئـەوە لـە لایەکەوە، لـە لایە ترەوەمەبەست لـەو هەڕەشەیەپاکی و دووری پێغەمەرە لـەوەی درۆ و بوختـان هەڵبەستێ و بڵێ: فەرموودەی خودایە.

﴿وَإِنَّهُ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ وَإِنَّهُ لَحَسْرَةٌ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ وە بە ڕاسـتی قورئان پەند و ئامۆژگاریيەبۆ ئەو کەسانەی لـە خودا ئەترسـن و خۆیـان لـە بێفـەرمانی خـودا ئەپارێزن و، بە ڕاستی ئێمە ئەزانین هەندێ لـە ئێوە قورئان بە درۆ ئەخەنەوە و، بە ڕاستی قورئان خەفەتە بۆ بێباوەڕان، چونکە بێ ئابڕوویی ئەوان ئاشکرا ئەکات.

﴿وَإِنَّهُ لَحَقُّ الْيَقِينِ فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ﴾ وە بە ڕاستی قورئان بێگومان ڕاستە و گومـانی تێدا نییە. دووایی تۆ پەروەردگاری خۆت پاك بکەرەوە و، دووری بخەرەوە لـە شـتێ شایسـتەی ئەو نەبێ، سوپاسی پەروەردگاری گەورەی خۆت بکــە کــە پلـەی تـۆی بـەرز کردووەتـەوە و کردوویتی بە پێغەمەر.

# ﴿ سورەتی ئەلمەعاریج ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن جگە لە ئایەتی (٢٤-٢٥). ژمارەی ئایەتەکانی (٤٤) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

سَأَلَ سَآئِلُۢ بِعَذَابٖ وَاقِعٖ ﴿١﴾ لِّلۡكَٰفِرِينَ لَيۡسَ لَهُۥ دَافِعٞ ﴿٢﴾ مِّنَ
ٱللَّهِ ذِي ٱلۡمَعَارِجِ ﴿٣﴾ تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ فِي
يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥ خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ ﴿٤﴾ فَٱصۡبِرۡ صَبۡرٗا جَمِيلًا ﴿٥﴾
إِنَّهُمۡ يَرَوۡنَهُۥ بَعِيدٗا ﴿٦﴾ وَنَرَىٰهُ قَرِيبٗا ﴿٧﴾ يَوۡمَ تَكُونُ ٱلسَّمَآءُ كَٱلۡمُهۡلِ
﴿٨﴾ وَتَكُونُ ٱلۡجِبَالُ كَٱلۡعِهۡنِ ﴿٩﴾ وَلَا يَسۡـَٔلُ حَمِيمٌ حَمِيمٗا ﴿١٠﴾
يُبَصَّرُونَهُمۡۚ يَوَدُّ ٱلۡمُجۡرِمُ لَوۡ يَفۡتَدِي مِنۡ عَذَابِ يَوۡمِئِذِۭ بِبَنِيهِ ﴿١١﴾
وَصَٰحِبَتِهِۦ وَأَخِيهِ ﴿١٢﴾ وَفَصِيلَتِهِ ٱلَّتِي تُـٔۡوِيهِ ﴿١٣﴾ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ
جَمِيعٗا ثُمَّ يُنجِيهِ ﴿١٤﴾ كَلَّآۖ إِنَّهَا لَظَىٰ ﴿١٥﴾ نَزَّاعَةٗ لِّلشَّوَىٰ ﴿١٦﴾ تَدۡعُواْ
مَنۡ أَدۡبَرَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٧﴾ وَجَمَعَ فَأَوۡعَىٰٓ ﴿١٨﴾

دانیشتووانی مەکە هەندێکیان بە هەندێ تریان ئەوت: بە ڕاستی موحەممەد ئێمە ئەترسێنێ لە سزای خودا، دووایی ئەو سزایە بۆ چ کەسێ ئەبێ؟ بە تایبەتی (نەزری کوڕی حاریس و هەندێکی تری وێنەی ئەو ئەیان ووت: ئەی خودایە: ئەگەر ئەو سزایە ڕاستە، دووایی تۆ بەردببارێنێتە بەسەر ئێمەدا. دوای ئەوە ئەو ئایەتانە لە لایەن خوداوە هاتە خوار:

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**به ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان**

﴿سَأَلَ سَائِلٌ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ لِّلْكَافِرِينَ لَيْسَ لَهُ دَافِعٌ مِّنَ اللَّهِ ذِي الْمَعَارِجِ﴾ پیاوێ لە بێباوەڕان بە وێنەی نەزری کوڕی حاریس داوای هاتنە خوارەوەی سزای ئەکرد بۆ بێباوەڕان، بە ڕاستی ئەو سزایە بێگومان دێتە خوارەوە بۆ ئەوان. دوایی لەبەر چ شتێ بە گاڵتەوە داوای ئەکەن، هیچ کەسێ ڕێگە لەو سزایە ناگرێ لە لایەن خودای خاوەن چەند پلەی باڵا و بەرز بێتە خوارەوە.

﴿تَعْرُجُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ فریشتەکان و جبرەئیل بەرز ئەبنەوە بۆلای جێگەی هاتنە خوارەوەی فەرمانەکانی خودا بۆ وەرگرتنی فەرمانڕەواکانی خودا لە ڕۆژێکا ئەندازەی ماوەی ئەو ڕۆژە پەنجا هەزار ساڵی جیهانە. ئەو ڕۆژە ئەوەندە سەختە ڕۆژێکی بەرانبەرە بە پەنجا هەزار ساڵ لە ساڵانی جیهان، بێباوەڕان وەستاون و چاوەڕوانی پرسیار و پاداشت ئەکەن، ڕۆژێکیان بە پەنجا هەزار ساڵ لێ ئەڕوا.

زانایان بیریان جیاوازە لە بارەی مانا و بە مەبەست لە (پەنجا هەزار ساڵ بەم جۆرانەی دووایی):-

١- باسی پەنجا هەزار ساڵ، یا هەزار ساڵ بۆ دیاریکردنی ماوە نییە، بەڵکو مەبەستە لە پیرۆزی و پاکی پلەی خودا لەگەڵ جێگەی بەندەکانی بەدووری ماوەیەکی زۆر و، هەندێ بوونەوەری هەن وەك فریشتەکان پلەیان لەسەرەوەی پلەی هەندێکیانن و نزیکترین لە خوداوە.

٢- بێباوەڕان لە ڕۆژی دواییدا ئەوەستن بۆ دیاریکردنی دواڕۆژی خۆیان لە تاکە ڕۆژێکدا ئەندازەکەی ئەوەندەی ماوەی پەنجا هەزار ساڵی جیهانە، ئەو کاتە ئادەمیزاد جوێ ئەبنەوە، هەندێکی‌یان بۆ بەهەشت و هەندێ تری‌یان بۆ دۆزەخ. ڕۆژێکی ئەو ڕۆژە لە سەختی‌دا بۆ بێباوەڕان بە ئەندازەی ماوەی پەنجا هەزار ساڵی جیهانە، بۆ باوەڕداران بە ئەندازەی چرکەی کاتژمێرێکە، پێغەمەر ئەفەرموێ: ئەو ڕۆژە سوکترە لە کردنی نوێژی پێویست بۆ باوەڕداران.

٣- مەبەست لە (پەنجا هەزار ساڵ) ئەوەیە: ئەگەر جگەی فریشتەکان بەرزببنەوە لە زەوی‌یەوە بۆلای ژووری ئاسمانەکان بە پەنجا هەزار ساڵ ئەو ماوەیە ئەبڕن. بەڵام فریشتەکان ئەو ماوەیە بە کەمتر ئەبڕن، چونکە فریشتەکان لە ڕووناکی درووستبوون، ماوەی بڕینی ڕووناکی لە چرکەیەکدا (١٨٦٠٠٠) میلە، یا (٣٠٠٠٠٠) کیلۆمەترە لە چرکەیەکدا. کەواتە ئەبێ ڕۆیشتنی فریشتەکان تیژ تر بێ لە ڕۆیشتنی ڕووناکی.

٤- هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ئەو مەبەستە هەواڵەی لای زانستی خودا ئەکرێ; چونکە بەڵگەمان بە دەستنەوە نی‌یە لە فەرموودەی خودا و پێغەمەری خودا بە گوێرەی ڕواڵەت، کەواتە ئێمە ئەوەندەمان لەسەرە باوەڕمان بە فەرموودەی خودا هەبێ، ئێمە داوای زانینی مەبەستی خودامان لێناکرێ.

﴿فَاصْبِرْ صَبْرًا جَمِيلًا إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُ بَعِيدًا وَنَرَاهُ قَرِيبًا﴾ دووایی تۆ ئارام بگرە لەسەر بەدرۆخستنەوەی تۆ لە لایەن بێباوەڕانەوە لە بارەی سزای خودا و دواخستنی سزادانیان، بە ئارامگرتنی چاکی وا دڵەڕاوکێی تێدا نەبێ، بە ڕاستی بێباوەڕان سزای ڕۆژی دووایی بە دوور ئەزانن و، ئێمەی خودای بوونەوەران ئەو سزایە بە نزیك ئەبینین و بەبێ‌گومان پەیدا ئەبێ.

﴿يَوْمَ تَكُونُ السَّمَاء كَالْمُهْلِ وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ﴾ تۆ ئەو سزایە ئەبینی لە ڕۆژێکا ئاسمانەکان ئەتوێنەوە بە وێنەی پاشماوەی ڕۆنی زەیتوون لە بنی قاپێکدا و، کێوەکان وەك خوری شیکراوەیان لێدێ، پارچەپارچە ئەبن، بە وێنەی قەلایەکی ڕووخاویان پێدێ.

﴿وَلَا يَسْأَلُ حَمِيمٌ حَمِيمًا يُبَصَّرُونَهُمْ﴾ وە لەو ڕۆژەدا هیچ دۆستێکی دڵسۆز لە هیچ دۆستێکی خۆشەویستی خۆی ناپرسێ، لە لایەن خوداوە نیشان ئەدرێن بە یەکتری و لە یەکتری ناپرسن و گفتوگۆ لەگەڵ یەکتری ناکەن، چونکە هەریەکەیان خەریکی کاری خۆیانن، چاوەڕوانی پاشەڕۆژی خۆیان ئەکەن.

﴿يَوَدُّ الْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِي مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍ بِبَنِيهِ وَصَاحِبَتِهِ وَأَخِيهِ﴾ کەسێکی ئەوتۆ تاوانباربێت ئاوات ئەخوازێ کە کوڕ و ژن و برای خۆی بکات بە سەرگەردانی خۆی لەو ڕۆژەدا لەبەر سەختی سزای ئەو ڕۆژەی ڕۆژی دوایی.

﴿وَفَصِيلَتِهِ الَّتِي تُؤْوِيهِ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ﴾ وە هەروەها ئەو هۆزەی ئەوتۆ جێگە ئەدەن بەو تاوانبارە و، لە جیهاندا خۆی لەوان نزیك ئەکاتەوە لە پشتا و، هەموو کەسێ لە دانیشتووانی زەوی ئەوانە هەموویان بکا بە دەردۆگێڕ بۆ خۆی لە پاشانا خودا ڕزگاری بکالە سزای ئەو ڕۆژە.

﴿كَلَّا إِنَّهَا لَظَى نَزَّاعَةً لِّلشَّوَى﴾ زۆر ڕاستە ڕزگاری ناکا لەو سزایە بە هیچ شتێ، بە ڕاستی ئەو سزایە ئاگری دۆزەخە و خاوەن کلپەیە، لابەری هەموو ئەندامەکان و جوانی ڕێك پێکی لەشە.

﴿تَدْعُو مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّى وَجَمَعَ فَأَوْعَى﴾ ئەو ئاگرە ڕائەکێشێ بۆلای خۆی کەسێ پشتی کردووەتە ڕاستی و وازی لە پەرستنی خودا هێناوە و، دارایی زۆری کۆکردووەتەوە و، دوایی کردوویەتی‌یە ناو توورەکە و، هەڵی گرتووە و زەکاتی لێ نەداوە و، دەست گیرۆیی خزمان و هەژارانی نەکردووە، کۆکردنەوەی دارایی و کەسێ ڕاستی بەدرۆبخاتەوە، ئاماژە بۆ ئەوە ئەکەن لە خزمەت خودا وەك یەکوان لە ڕۆژی پرسیار و پاداشتی پاشەڕۆژدا.

إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾ إِلَّا ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٢٢﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَآئِمُونَ ﴿٢٣﴾ وَٱلَّذِينَ فِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ ﴿٢٤﴾ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿٢٥﴾ وَٱلَّذِينَ يُصَدِّقُونَ

بِيَوْمِ الدِّينِ ﴿٢٦﴾ وَالَّذِينَ هُم مِّنْ عَذَابِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴿٢٧﴾ إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ ﴿٢٨﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ﴿٢٩﴾ إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٣٠﴾ فَمَنِ ابْتَغَىٰ وَرَاءَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْعَادُونَ ﴿٣١﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ ﴿٣٢﴾ وَالَّذِينَ هُم بِشَهَادَاتِهِمْ قَائِمُونَ ﴿٣٣﴾ وَالَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٣٤﴾ أُولَٰئِكَ فِي جَنَّاتٍ مُّكْرَمُونَ ﴿٣٥﴾

﴿إِنَّ الْإِنسَانَ خُلِقَ هَلُوعًا إِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعًا وَإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعًا﴾ بە ڕاستی ئـادەمیزاد بە بێئارام و چاوچنۆك و ڕژد و دروست کراوە، هەرکاتێ خراپـە تووشی ببێ لـە هـەژاری و نەخۆشی بێئارام و خەفەتبارە، هەرکاتێ چاکەیە لە هەرزانی و خۆشی و سامانی فـراوان توشی بوو، خۆی ئەگرێتەوە لـە چاکەکردن و، فەرمانی خودا جێبەجێ ناکا و، زەکاتەکانی نابەخشێ بە هەژاران، ئەوانە سروشـتی ئـادەمیزادن، زۆر بـەگرانی سـەرئەکەوێ بەسـەریانا و،وازیـان لێ نایەرێ:

﴿إِلَّا الْمُصَلِّينَ الَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ دَائِمُونَ وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ﴾ مەگـەر نوێژکـەرانێکی ئـەوتۆ بـەردەوامبن لەسـەرکردنی نوێژەکانیـان لـە بیریـان ناباتەوە، کەسانێکی ئەوتۆ مافی دیاریکراوی دارایی خۆیان ئەبەخشـن بـە کەسێ داوای مـافی خۆی بکا لـەوان و، بە کەسێ داوای ناکا و گومان ئەبرێ پێویستی بەو مافەی نییە کـەچی لـە ناوەڕۆکا هەژارە.

﴿وَالَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ وَالَّذِينَ هُم مِّنْ عَذَابِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ﴾ وە مەگـەر کەسانێکی ئەوتۆ بڕوای بێگومانیان بەبوونی ڕۆژی پاداشت وەرگرتنـی کـاری چـاکی خۆیانیـان هـەبێ و، کەسانێکی ئەوتۆن ئەوان ئەوان لـە سزای پەروەدگاری خۆیـان ئەترسـن و، بـەردەوامن لەسـەر ڕەزامەندی پەروەردگار.

﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ﴾ بـە ڕاسـتی ئـەزانن سـزای پـەروەردگاری خۆیـان و، بەرگریکردنی مسۆگەر نییە و بێترس و ئاسوودە نین و، وابزانن تووشی سزا نابن.

﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ﴾ وە مەگەر کەسانێکی ئەوتۆ ئەوان شەرمگەی خۆیانیان پاراستووە لە کاری بێزلێکراوە و لـە داوێـن پیسی و ئەو کارە ناکەن مەگەر لـەگەڵ ژن و هاوسەر، یا لـەگەڵ کارەکەرە بەندەکانی خۆیـان،

ئیتر با ژمارەیان زۆرتربێ لە چوار ژن. دووایی چوونە لای ئەوانە بە ڕاستی ئەو کەسانە سەرزەنشت و لۆمە ناکرێن. بەڵام ئەو کەسانەی مل کەچی ئارەزۆی پیسی خۆیانن و لە سنووری خودا دەردەچن و، ئەو کەسانە یاسای خودایان بەزاندووە، وەك خودا ئەفەرموێ:

﴿فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاء ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ﴾ دووایی هەرکەسێ لە سنووری کاری ڕەوا دەرچێ بۆلای کاری نارەوا و، کاری خراپ لەگەڵ جگەی ژن و کارەکەری خۆی بکات، دووایی ئەو کەسانە هەرئەوان سنووری خودایان بەزاندووە و لە فەرمانی خودا دەرچوون.

﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ﴾ وە مەگەر کەسانێکی ئەوتۆ چاودێری ئەو شتانەی دانراوە لە لایان و، ئەو پەیمان و بەڵێنەی داویانە ئەکەن و، ئەیانپارێزن، بە گوێرەی یاسا جێبەجێیان ئەکەن.

﴿وَالَّذِينَ هُم بِشَهَادَاتِهِمْ قَائِمُونَ وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ أُوْلَئِكَ فِي جَنَّاتٍ مُّكْرَمُونَ﴾ وە مەگەر کەسانێکی ئەوتۆ ئەو شایەتییە لە لایانە بە جۆری خۆی و بەبێ لادان لە ڕاستی ئەوان جێبەجێ بکەن و، کەسانێکی ئەوتۆ مەرجی نوێژەکانیان ئەپارێزن و، بە جۆرێ بۆیان دیاریکراوە ئەیان کەن، ئیتر ئەو نوێژانە فەرزبن یا سوونەت. دوویارەکردنەوەی نوێژ لە سەرەتا و لە کۆتایی ئەوانەی ڕابوردن، لەبەر ئەوەیە، نوێژ لە لایەن خودای مەزنەوە پلەیەکی گەورەی دراوەتێ، ئەو کەسانەی ئەو کارانەی پێشوو ئەکەن ئەچنە ناو ئەو بەهەشتانە، ڕێزیان ئەگیرێ بە پاداشت و بە دیاری زۆر نایاب و بە نرخ.

بۆ زانین: لە ئایەتی (٣٠) لەم سورەتەدا باسی ئەوەکرا: کە ڕەوایە چوونە لای ژنانی سەربەست و چوونە لای ژنانی بەندە، پەیوەندی لەگەڵ ژنان، بە جۆری یاسا دیاری کردووە دروستە لای هەموو یاسایە.

بەڵام ئەو ژنانەی لە جەنگدا ئەکرێن بە بەندە پێویستە هەندێ ڕوونکردنەوەی بۆ باس بکەین: بێگومان کاتێ ئایینی پیرۆزی ئیسلام باڵی میهرەبانی و دادپەروەری کێشا بەسەر ڕووی زەویدا، بەندەیی پەیرەوێکی گشتی بوو بۆ دانیشتووانی ڕووی زەوی،بە بەندەکردنی هەموو دیلەکانی جەنگ دەستووری هەموو ڕژێمەکانی ئەو کاتە بوو، بۆ ئیسلام نەئەگونجا یاسای کۆیلایەتی پوچ بکاتەوە لە کاتێکا لەگەڵ دوژمنانی خۆی لە جەنگدا بێ و، بە یەك لایەنە پووچی بکاتەوە. بەڵکو ئیسلام هەموو سەرچاوەکانی بەبەندەکردنی ئادەمیزادی داخست، جگە لە بۆ دیلەکانی جەنگ، دوای خست هەتا کاتێ بگونجێ بۆ ئادەمیزاد،یاسایەکی هەمە لایەنە دابنێین بۆ پوچ کردنەوەی یاساکانی کۆیلایەتی بە دیلەکانی جەنگیشەوە، بۆ بنەبڕکردنی بەندەیی یەکجاری بۆ ئیسلام شایستە نەبوو دیلی بێباوەڕان ئازاد بکا و،دوژمن دیلی موسڵمان بکا بە بەندە.

کاتی وا ئەبێ بە هەزاران لە هەردوولای موسڵمانان و بێباوەڕان سەرباز بە دیل ئەگیرێن، ئەو کاتە ئەگەر موسڵمانان دیلەکانی بێباوەڕان ئازاد بکەن و لە هەمان کاتا بێباوەڕان دیلی موسڵمانان بکەن بە بەندە، موسڵمانان تووشی نەکسەی زۆر ئەبێ. کەواتە چاك وایە موسڵمانانیش دیلی بێباوەڕان ئازاد نەکەن و، بۆ ئەوەی بیانگۆڕنەوە بە موسڵمانانی بە دیل کراوە.

لە کاتی جەنگی باوەڕداران و بێباوەڕاندا، ئەو ژنانەی بێباوەڕان دیل ئەکرێن و ئەکرێن بە بەندە. بێگومان پلەیان ناگاتە پلەی ژنانی ئازادکراو و سەربەست، بۆیە ژمارەی ژنانی سەربەست ئەبێ چوار ژن بن.

بەڵام کارەکەرە کۆیلەکان درووستە زۆرتریش بن لە ژنانی سەربەست. بەڵام ڕێزیان لێ ئەگیرێ و ئەپارێزرێن لەوەی ناموسیان نەڕوشێنرێ و بکرێن بە بەشی موسڵمانان و بۆ یەك کەس بە تەنها و کەسی تر بۆی نی‌یە ناموسیان پێشێل بکا و ئەبێ بە چاوی ڕێزەوە تەماشایان بکرێ.

ئیسلام زۆر ڕێگەی داناوە بۆ سەربەستکردنی بەندەکان و کەمکردنەوەی ژمارەی بەندەکان بەمانەی دووایی:

١- هەرکاتێ ئەو کارەکەرە بەندەیە منداڵێکی لە گەورەکەی لێ پەیدابوو،ئەو ژنە پێی ئەوترێ دایکی مناڵ و بەهۆی ئەو مناڵەوە ئازاد ئەبێ دوای مردنی باوکی ئەو مناڵە و نابێ بە میرات بۆ میراتبەران.

٢- ئازادکردنیان لە لایەن گەورەکانیانەوە بە خۆڕایی لە جیاتی کەفارەتی سوێند و کوشتنی ئادەمیزادێك و، کەفارەتی زیهار و چوونە لای ژنان لە مانگی ڕەمەزاندا بەو جۆرەی بۆیان دیاری‌کراوە لە لایەن یاساوە، بەندە بۆی هەیە خۆی‌ئازاد بکا بەرامبەر بە هەندێ پارە بیدا بە گەورەکەی خۆی. هەروەها ئایینی ئیسلام بەشێکی دیاری‌کردووە بۆ ئەوەی بەکاربهێنرێ بۆ ئازادکردنی بەندەکان.

فَمَالِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ قِبَلَكَ مُهْطِعِينَ
﴿٣٦﴾ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ عِزِينَ ﴿٣٧﴾ أَيَطْمَعُ كُلُّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُمْ
أَن يُدْخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٍ ﴿٣٨﴾ كَلَّآ إِنَّا خَلَقْنَٰهُم مِّمَّا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾
فَلَآ أُقْسِمُ بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ ﴿٤٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ خَيْرًا مِّنْهُمْ
وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٤١﴾ فَذَرْهُمْ يَخُوضُواْ وَيَلْعَبُواْ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى
يُوعَدُونَ ﴿٤٢﴾ يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ سِرَاعًا كَأَنَّهُمْ إِلَىٰ نُصُبٍ يُوفِضُونَ
﴿٤٣﴾ خَٰشِعَةً أَبْصَٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلَّذِى كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿٤٤﴾

﴿فَمَالِ الَّذِينَ كَفَرُوا قِبَلَكَ مُهْطِعِينَ عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ عِزِينَ﴾ دووایـی چ شـتێکە بـۆ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە ڕائەکەن بۆلای تۆ بە کۆمەڵ و، تەماشای تۆ ئەکەن کاتێ تۆ قورئان ئەخوێنی، جێگەی سەرسوڕمانە کۆئەبنەوە لە لای تۆ، لە لای ڕاست و، لە لای چەپەوە کۆمەڵ کۆمەڵ کۆ ئەبنەوە؛ بۆ ئەوەی گاڵتە بە تۆ بکەن و بە زیندووبوونـــەوە، ئـەڵێن: ئەگـەر ئەوە ڕاستبێ موحەمـــەد ئـەیلێ، ئێمـە شایسـتەترین بـۆ چوونـی بەهەشـت چونکـە دارایـی و کۆمەڵمان زۆرترە، خودای مەزن وولامیان ئەداتەوە و ئەفەرموێ:

﴿أَيَطْمَعُ كُلُّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُدْخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٍ﴾ ئایا هەمووو مرۆڤێ لـەو بێباوەڕانە بە ئومێدی ئەوەن کە بچنە ناو بەهەشتێ خاوەنی خۆشی و ڕابواردنـی چاکـە بـە وێنـەی بـاوەڕداران، ئایـا ئەزانن دارایی و بتەکانیان نزیکیان ئەکاتەوە.

﴿كَلَّا إِنَّا خَلَقْنَاهُم مِّمَّا يَعْلَمُونَ﴾ نابێ بە ئومێدی ئەوەبن بچنـــە بەهەشـت، بـە ڕاستی ئێمـە ئـەوانمان درووسـتکردووە لـە شـتێ زۆر بێنرخـە ئـەوان خۆیـان ئـەیزانن، لـە دڵۆپـێ ئـاوی بێزلێکراوەی مردووە، ئێستا کراون بەو دیمەنە جوانە، شایسـتەی چوونـی نـاو بەهەشـت نـین، چونکە بەهەشت بۆ پیاوچاکانە، نەك بۆ تاواناران و بێباوەڕان.

﴿فَلَا أُقْسِمُ بِرَبِّ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ إِنَّا لَقَادِرُونَ عَلَى أَن نُّبَدِّلَ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ﴾ دووابی بە ڕاستی من سوێند ئەخۆم بە پەروەدگاری جێگەی هەڵـــهاتن و ئـاوابوونی خۆر بە ڕاستی ئێمە توانامان هەیە لـەسەر ئەوەی کە ئێمـە ئـەو بێباوەڕانـە بگۆڕیـن بـە چاکـتر لـەوان و، لـە ناویان ببەین و، ئێمە کەس ناتوانێ ڕێگەمان لێ بگرێ بۆ ئەو گۆڕینە و، ئەو کەسـە ببێتە جێگەی ئەوان بێفەرمانی ئێمە نەکەن.

خۆرهەڵات و خۆرئاوا زۆرن بە گوێرەی چاوپێکەوتنی ئێمەی ئادەمیزاد بە گوێرەی سـوڕانی زەوی بە دەوری خۆردا هەر ڕۆژێ خۆرهەڵات و خۆرئاوایە پەیدا ئەبێ.

﴿فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا وَيَلْعَبُوا حَتَّى يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي يُوعَدُونَ﴾ دووایی تۆ واز لـەو بێباوەڕانـە بهێنە گفتوگۆی پڕوپوچی خۆیان و یاری و گاڵـەی خۆیان بکەن لـە جیهاندا، هـەتا ئەگـەن بـە ڕۆژێکی ئەوتۆ بەڵێنیان پێدراوە تووشی بن.

﴿يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ الْأَجْدَاثِ سِرَاعًا كَأَنَّهُمْ إِلَى نُصُبٍ يُوفِضُونَ﴾ ئەو ڕۆژە ئـــەوان پێئەگـەن ڕۆژێکە بە پەلە وولامی فریشتەکان ئەدەنەوە و، لـە گۆڕەکانیان دێنە دەرێ، بە وێنەی ئەوەی لـە جیهاندا لـە خانووەکانی خۆیان ئەهاتنە دەرەوە و ڕایان ئەکرد بۆلای ئەو بتانەی هەڵواسـرابوون و قوربانییان بۆ ئەکردن، ئەو دووڕۆژە زۆر جیاوازن لـە یەکتری.

﴿خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ذَلِكَ الْيَوْمُ الَّذِي كَانُوا يُوعَدُونَ﴾ چاویـان لـە ترسـا سەربەرەوخوارە، بێنرخی ئەو بێباوەڕانەی داپۆشیوە و ئابڕوویان چووە، بـەوان ئـەبێژرێ ئەمـە ئەو ڕۆژەیە بەڵێنی پێدرابوو بەوان لـە جیهاندا و بروایان پێی نـەبوو. ئەوەتـە ئێسـتا بـە چـاوی خۆیان ئەیبینن. کەواتە سزای کرداری خۆتان بچێژن.

# ﴿ سورەتی نوح ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٢٨) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

إِنَّا أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِ أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ
عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١﴾ قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ أَنِ اعْبُدُوا
اللَّهَ وَاتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ﴿٣﴾ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ
إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ أَجَلَ اللَّهِ إِذَا جَاءَ لَا يُؤَخَّرُ ۖ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ
﴿٤﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا ﴿٥﴾ فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَائِي إِلَّا
فِرَارًا ﴿٦﴾ وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوا أَصَابِعَهُمْ
فِي آذَانِهِمْ وَاسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّوا وَاسْتَكْبَرُوا اسْتِكْبَارًا
﴿٧﴾ ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ﴿٨﴾ ثُمَّ إِنِّي أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ
لَهُمْ إِسْرَارًا ﴿٩﴾ فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾
يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل
لَّكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَارًا ﴿١٢﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بە ڕاستی ئێمە نوحمان ڕەوانەکردبوو بۆلای تاقمەکەی خۆی، کە تاقمەکەی خۆی بترسێنی، لە دواڕۆژی بێباوەڕی خۆیان، لە پێش ئەوەی کە بێت بۆلایان سزایەکی زۆر ئازاردەر لەم جیهانەدا و، بە ئازارێکی سەختتر لە دواڕۆژدا.

بۆ زانین: مێژووی بت پەرستی دەستی پێکردووە لە کاتی (ئەنوشی کوڕی شیسی کوڕی ئادەم) و، لە سەردەمی نوحدا بت پەرستی پەرەی سەندووە بە زۆری و، بۆیە خودای مەزن

نوحی هەڵبژارد بۆ خەباتکردن لە دژی بت پەرستی و، نوح بێباوەڕان بترسێنێ بە لەناوچوونیان ئەگەر بەردەوامبن لەسەر بت پەرستی، مێژوو ئـەڵێ: لـە دوای (١٠٥٦) سـاڵ دوای ئـادەم هاتوەتە جیهانەوە، ووشەی نوح، یانێ خۆشی و ئاسایش. کاتێ پـەیدابوونی لافـاو تەمـەنی نـوح (٦٠٠) ساڵ بووە، دوای تۆفان (٣٥٠) ساڵ ماوەتەوە، نەوەی خۆی ئیبراهیمی کوڕی ئـازاری بینیوە زۆرتر لە پەنجا ساڵ لەگەڵیا ژیاوە، دوای ئەوەی نوح ڕزگاری بوو لە تۆفان، دەستی کرد بـە کێڵانـی زەوی و ناشـتنی بـاخ و درەخـت، ئـەوەی باسـکرا زانـای مـەغریبی لـە نامــەی (ئەلئەوائیلەوە) گێڕاویەتەوە، بــە بـیربۆچوونی مـن، ژیـانی ئیـبراهیم لەگـەڵ نوحـدا جێگـەی ڕەخنەیە، ئیتر خودا هەموو شتێ ئەزانێ.

﴿قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي لَكُـمْ نَذِيـرٌ مُّبِـينٌ أَنِ اعْبُـدُوا اللَّـهَ وَاتَّقُـوهُ وَأَطِيعُـونِ﴾ نـووح ووتـی: ئـەی تاقمەکەی من. بە ڕاستی نێردراوی خودام بە ئاشکرایی ئێوە ئەترسێنم کە هەر خودا بپەرستن بـە تەنها و، لە خودا بترسن و واز لـە بت پەرستی بهێنن و، پەیڕەوی من بکـەن و بـە فـەرمانی مـن هەڵسن. ئەگەر ئێوە ئەو سێ شتانە بکەن.

﴿يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُـمْ وَيُؤَخِّرْكُـمْ إِلَـى أَجَـلٍ مُّسَـمًّى﴾ خـودا لــە هــەندێ گونـاهی پێـش باوەڕهێنانتان خۆش ئەبێ، لە پاشەڕۆژدا بەو گوناهانە سـزاتان نـادا و، تەمـەنی ئێـوە دوا ئـەخا بۆلای تەمەنی دیاریکراو بۆتان و سزاتان نادا لـە جیهاندا بە مەرجێ باوەڕتان هێنابێ.

﴿إِنَّ أَجَلَ اللَّهِ إِذَا جَاءَ لَا يُؤَخَّرُ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ بە ڕاستی ئەو ماوەیە خودا دیاری کـردووە بۆ مردنتان و بۆ سزادانتان دواناکەوێ هەرکاتێ هات ئەگەر ئێوە لەو کەسانەبن خاوەنی زانست و بیرکردنەوەبن.

زانای بەرزی زەمەخشری ئەفەرموێ: تاقمی نوح ئەگەر باوەڕیان بهێنابایە هەزار ساڵ ئەژیان لە جیهاندا و سزایان نەئەدرا، ئەگەر بەردەوامبن لـە بێباوەڕی خودای مەزن لـە سەرەتای نۆسەد ساڵی تەمەنیان لـە ناوی ئەبردن، بۆیە بەوان بێژرا: باوەڕ بهێنن خودا ئێوە دوا ئەخا بۆلای کاتـێ کە خودا دیاری کردووە کە هەزار ساڵە، ئەو کاتە کۆتایی پێهات پاش و پێش نابێ.

﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا﴾ دوای ئەوەی تاقمی نوح باوەڕیـان نـەهێنا، نـووح ووتی: ئەی پەروەدگاری من بە ڕاستی من بە شەو و بەڕۆژ داوام کرد لـەم تاقمەی خـۆم بـاوەڕ بهێنن.

﴿فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَائِي إِلَّا فِرَارًا﴾ دوایی ئەو داوایەی من هیچ شتێکی بۆ ئـەوان زۆر نـەکرد و، هیچ سودێکی بەوان نەگەیاند جگە لە وازهێنان لە باوەڕهێنان ڕاکردن لە فـەرمانی مـن و لــە بێفەرمانی پەروەدگار.

﴿وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِـرَ لَـهُمْ جَعَلُـوا أَصَابِعَـهُمْ فِـي آذَانِـهِمْ وَاسْتَغْشَـوْا ثِيَابَـهُمْ وَأَصَـرُّوا وَاسْتَكْبَرُوا اسْتِكْبَارًا﴾ وە بە ڕاستی من هەموو کاتێ داوام لـەو تاقمەی خۆم ئەکرد باوەڕبهێنن و

پەیڕەوی من بکەن; لەبەر ئەوەی تۆ لە گوناهی ئەوان خۆش ببی، ئەوان سەری پەنجەکانی خۆیانیان ئەنایە ناو گوێچکەی خۆیان، هەتا داواکەی من نەبیسن و بەبەرگ و سەرخەری خۆیان، خۆیانیان دائەپۆشی هەتا من نەبینن و، بەردەوام ئەبوون لەسەر بێباوەڕی و یاخی ئەبوون و، داوای گەورەیی‌یان ئەکرد لە ئاستی دواکەوتنی بن و باوەڕهێنان.

﴿ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ثُمَّ إِنِّي أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا﴾ لە پاشانا بە ڕاستی من بە ئاشکرایی و بە دەنگی بەرز داوام ئەکرد ئەو تاقمەی خۆم باوەڕ بە تۆ بهێنن و بە تەنها تۆ بپەرستن و، لە پاشانا من داواکاری خۆمم بۆ ئەوان دووپات ئەکردەوە و بەوانم ڕائەگەیاند و، بە پەنهانی زۆر بە تاك و بە کۆمەڵ داوای باوەڕهێنانم لەو تاقمەی خۆم ئەکرد.

﴿فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا﴾ دوایی من بەوانم ئەووت: داوای لێبوردن بکەن لە پەروەدگاری خۆتان، بە ڕاستی پەروەدگار لێخۆشبوونی زۆر زۆرە بۆ کەسێ داوای لێخۆشبوونی لێ بکا.

ئەو فەرموودانەی خودا بۆ ئێمەی ڕوون کردووەتەوە: داواکاری نوح بە سێ جار بووە، یەکەم جار بە نهێنی، دووهەم جار بە ئاشکرایی، سێیەم جار بە ڕاگەیاندنی ئاشکرا و نهێنی. چۆن ئەبێ داوای لێخۆشبوونی لێ نەکەن.

﴿يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ﴾ پەروەدگار ئەڕێژێ بەسەر ئێوە و بەسەر دەغڵ و دانی ئێوەدا باران بەخوڕی و بە زۆری و، یارمەتی ئێوەی داوە بە دارایی و بە کوڕی زۆر.

﴿وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَارًا﴾ وە خودا درووستی کردووە بۆ ئێوە و بۆ سوودی ئێوە چەند باخ و بێستان و، چەند ڕووباری ئاوی شیرین و، لە بەروبوومی باخەکان ئەخۆن و بە ئاوی ئەو ڕووبارانە باخ و زەوی خۆتان و ئاژەڵەکانتانیان پێپاراو ئەکەنەوە، ئیتر بۆ سوپاسی خودا ناکەن و داوای لێبوردنی لێ ناکەن؟

پرسیار: لەو سێ ئایەتانەی پێشەوە بۆ ئێمە وا دەرئەکەوێ، باوەڕهێنان و لە خودا ترسان ئەبێتە هۆی خۆشی و هەرزانی لەم جیهانە و، کەچی ئەوەی ئێمە ئەیبینین، بێباوەڕان و ستەمکاران خاوەنی سامان و هەرزانی و خۆشین لەم ڕۆژەدا.

وەڵام: ١- ئەو ئایەتانە هاتوونەتە خوارەوە بە تایبەتی بۆ تاقمی نوح، ئەوە ناگەیەنێ بکرێ بە بەڵگە و سەربکێشێ بۆلای جگەی ئەوان، خودای مەزن بۆ هەموو نەتەوەیە، فەرمانێکی تایبەتی خۆی دیاریکردووە کە پێغەمەر خۆیان بە جۆرە شتێ بترسێنێ و، بە جۆرە کارێ سزایان بدا.

٢- بەختیاری و خۆشی لەو ئایەتانەدا بەستراوە بە بەختیاری هەردوو جیهانەوە، بە مەرجێ باوەڕ بەخودا بهێنن. نەك هەر بە تەنها بەختیاری جیهان.

مَا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾
وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴿١٤﴾ أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ
طِبَاقًا ﴿١٥﴾ وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا ﴿١٦﴾
وَاللَّهُ أَنْبَتَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ نَبَاتًا ﴿١٧﴾ ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ
إِخْرَاجًا ﴿١٨﴾ وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ بِسَاطًا ﴿١٩﴾ لِتَسْلُكُوا مِنْهَا
سُبُلًا فِجَاجًا ﴿٢٠﴾

﴿مَا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا﴾ چ شتێکە ئێوەی والێکردووە لە گەورەیی خودا نەترسن و، خۆتان ئەزانن خودا ئێوەی دروست کردووە بە چەند جۆرێ جیاواز، لە خاکەوە بۆلای دلۆپێ ئاوی بێزلێکراوە، بۆلای خوێن پارە، دووایی بۆلای گۆشت پارە، دواتر بۆلای مرۆڤێکی خاوەن گیان. دووایی لە دایك بوون و بوون بە ئادەمیزادێکی خاوەن ئەقڵ و هەست، بۆلای لەشێکی جوانی ڕێك و پێك. دووایی خودا سەرنجیان ڕائەکێشێ بۆلای توانای خۆی، ئەفەرموێ:

﴿أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا﴾ ئایا ئێوە نەتان زانیوە و، نەتان ڕوانیوە چۆن خودا ئاسمانی دروست کردووە، هەندێکیان لە سەرەوەی هەندێ تریانن و، وێنەی یەکن لە ڕێك و پێکیدا، مانگی دروست کردووە لە ناو هەموویانا و لە ناو ئاسمانێ نزیکە لە زەوی‌یەوە بەوەی ڕووناکی ببەخشێ بە ڕووی زەوی‌دا و، خۆری دروست کردووە بە وێنەی چرایەك و سەرچاوەی ڕووناکی‌یە.

ئەوەی شایانی باسێ ئەو ئایەتە ئاماژەیە بۆ ئەوە تاقمی نوح بڕوایان وابووە ئاسمان حەوتن، بۆ باشتر ڕوون بوونەوەی مانای ئەو ئایەتە تەماشای مانای ئایەتی (١٢) سورەتی تەڵاق بکە.

﴿وَاللَّهُ أَنبَتَكُم مِّنَ الْأَرْضِ نَبَاتًا ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا﴾ وە خودا ئێوەی پەیداکردووە لە زەوی، دووایی ئێوە بوون بە بوونەوەرێکی جوان و سەرسوڕێنەر، لە پاشانا دوای مردنتان ئێوە ئەگێڕێتەوە بۆ ناو زەوی و، ئێوە لە گۆڕەکانتان ئەهێنێتە دەرەوە بە دەرهێنان و، زیندووتان ئەکاتەوە بۆ پرسیار و پاداشت لە پاشەڕۆژدا.

﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ بِسَاطًا لِتَسْلُكُوا مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا﴾ وە خودا زەوی دروستکردووە بە ژێرەخەر بۆ ئێوە، لەبەر ئەوەی ئێوە بڕۆن بەسەر چەن ڕێگەیەکی فراواندا لە زەوی‌دا، بتان گەیەنن بە جێگەی نیاز و مەبەستی خۆتان.

قَالَ نُوحٌ رَّبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِي وَاتَّبَعُوا مَن لَّمْ يَزِدْهُ
مَالُهُ وَوَلَدُهُ إِلَّا خَسَارًا ﴿٢١﴾ وَمَكَرُوا مَكْرًا كُبَّارًا ﴿٢٢﴾ وَقَالُوا
لَا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ
وَنَسْرًا ﴿٢٣﴾ وَقَدْ أَضَلُّوا كَثِيرًا وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا ضَلَالًا ﴿٢٤﴾
مِّمَّا خَطِيئَاتِهِمْ أُغْرِقُوا فَأُدْخِلُوا نَارًا فَلَمْ يَجِدُوا لَهُم مِّن دُونِ
اللَّهِ أَنصَارًا ﴿٢٥﴾ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ
دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا
كَفَّارًا ﴿٢٧﴾ رَّبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِيَ
مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا تَبَارًا ﴿٢٨﴾

﴿قَالَ نُوحٌ رَّبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِي وَاتَّبَعُوا مَن لَّمْ يَزِدْهُ مَالُهُ وَوَلَدُهُ إِلَّا خَسَارًا﴾ نووح ووتـی: ئـەی پەروەدگاری من: بە ڕاستی ئەو تاقمەی لای من بێ فـەرمانی منیـان کـردووە بـاوەڕ نایـەرن و، دوای کەسێ ئەکەون لـە سەرۆکەکانی خۆیان، زۆر ناکا بـۆ ئـەو کەسـە دارایـی و منالـەکانی مەگەر تووشی زیان و سزای دواڕۆژی بکەن.

﴿وَمَكَرُوا مَكْرًا كُبَّارًا﴾ وە ئەو سەرۆکانەی تاقمەی من بە نهێنی پلانـی زۆر گـەورە سـاختە ئەهێنن و، بە فرِوفێڵی زۆر گەورە دانیشتووان هان ئەدەن لـەسەر ئازاردانی من و، لـەسەر ئەوەی باوەڕ بە تۆ نەهێنن و بێ فەرمانی من نەکەن.

﴿وَقَالُوا لَا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا﴾ وە سەرۆکەکانیان ئەیان ووت بە ژێر دەستەکان و ئەم تاقمەی من: ئێوە واز لە پەرستنی خوداکانی خۆتان مەهێنن و واز لـە پەرستنی (وەدد و، سواع و، یەغوس و، یەعوق و، نەسر) مەهێنن. نوح بە زۆری دابەزیوەتە سەر ئەو پێنج بتانە، چونکە ئەو بتانە گەورەترینی خوداکانیان بوون. زانایان ئەڵێن: ئەو پێنج بتانە مابوونەوە و ئەپەرستران هەتا کاتی ناردنی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾. (وەدەد) کە لـە وێنەی پیاوێکدا بوو، پەرستراوی هۆزی (کەلبی و مەتولجەندەل) بوو، (سواع) کە لـە وێنەی ژنێ بووە، پەرستراوی (هوزەیلبو)، (یەغوس) لـەسەر وێنەی شێرێ بووە، پەرستراوی هۆزی (غەتیف) بووە لـە دوای هـۆزی (مـوراد). (یـەعوق) لـەسـەر وێنـەی ئەسـپێ بـووە، پەرسـتراوی هـۆزی (هەمدان) بووە، (نەسر) لـەسەر وێنەی هەڵۆیە بووە پەرستراوی هۆزی حـەمیر بـووە. هـەروەها

عەرەبەکان چەند بتی تریان هـەبووە، هەریەکـەیان بتـی تاقمـێ بـووە، وەك (لات) بتـی هـۆزی (سەقیف) بووە، (عوزا) بتی هۆزی سەلیم و جەسم بووە، (مەنات) بتی هـۆزی خوزاعـە بـووە، (ئیساف. ناپلە. هوبەل) بتی دانیشتووانی مەککە بوون.

﴿وَقَدْ أَضَلُّوا كَثِيرًا وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا ضَلَالًا﴾ وە بە ڕاستی ئەو سەرۆکانە و ئەو بتانـە زۆر کەسیان لاداوە لـە خودا پەرستی و، ئەو بتانـە هیـچ شتێ زۆر ناکـەن بـۆ ستەمکاران مەگـەر لادانیان لـە ڕێگەی ڕاست و، بێباوەڕان زۆرتر ئەکەن لـە باوەڕداران.

﴿مِمَّا خَطِيئَاتِهِمْ أُغْرِقُوا فَأُدْخِلُوا نَارًا فَلَـمْ يَجِـدُوا لَـهُم مِّـن دُونِ اللَّـهِ أَنصَـارًا﴾ لـەبـەر ئـەو گوناهانە ئەو تاقمە خنکێنران بە ئـاوی لافـاو، دوای خنکاندنیـان ئەخرێنـە نـاو ئـاوی دۆزەخ، دووایی ئەو تاقمە لـە جگەی خودا یاریدەدەرێ بۆ ئەوان نابێ ڕزگاریان بکا لـە سـزای هـەردوو جیهان.

﴿وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا﴾ وە نوح ووتی: ئـەی پـەروەدگاری من: تۆ بەجێ مەیەڵە لـەسەر زەوی هیچ کەسێ لـە بێباوەڕان بەردەوامبێ و دانیشێ لـە خـانووی خۆیا بە زیندوویی.

﴿إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا﴾ لـەبەر ئەوەی بە ڕاستی ئەگەر تـۆ بەجێ بهێڵی ئەوان هەرکەسێ، بەندەکانی تۆ لـە ڕێگەی ڕاستی پەرستن لا ئەدەن و، ئەوان هیـچ منالّێکیان نابێ مەگەر کەسێ بەردەوامبێ لـەسەر بێفەرمانی و کاری نـاڕەوا، کەسـانی تـری وا باوەڕ بە تۆ نەیەرن.

﴿رَّبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا تَبَارًا﴾ ئەی پەروەدگاری من: تۆ لـە من و لـە باوك و لـە دایکم و لـە کەسێ چوبێتە ناو ئەو کەشتی‌یە و ئەو مزگەوتەی منەوە بە باوەڕهێنانەوە بە تۆ، لـە پیاوانی باوەڕدار و لـە ژنانی بـاوەڕدار خۆشببە و، تۆ هیچ شتێ زۆر مەکە بۆ ستەمکاران مەگەر لـەناوبردنیان و زیان بۆیان، خودا پاڕانەوەکەی لـە نوح وەرگرت و هەموویانی لـەناوبردن و هەموو بێباوەڕان خنکان. لـە فەرهەنگی (الكتـاب المقدس)دا هاتووە: کە هەڵکەندی شوێنەواری دەری خستووە تۆفان پەیدا بـووە و ڕێگـەی پـێ براوە. کۆنترین باسێ نووسرابێ لـە بارەی لافاوەوە لـە نێوان ساڵانی (١٨٩٤-١٥٩٥)ی بەر لـە زایینە. لافاوی نوح ئەوە ناگەیەنێ لافاوی تر نەبووبێ. هەروەك پەیدابوونی لافاوی تریـش ئـەوە ناگەیەنێ لافاوی نوح پەیدا نەبووبێ. لـە زۆر کاتا لـە زۆر جێگـەدا لافـاوی تـر پـەیدابووە. بـۆ ئەوەی بزانرێ لافاوی نوح هەموو ڕووی زەوی داپۆشیبێ یا لـــە جێگـەی تایبـەتیدا بووبـێ لـە ڕووی زەوی بەڵگەی ئاشکرا لـە نامەی خودادا دەست ناکەوێ.

## ﴿ سورەتی ئەلجین ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٢٨) ئایەتن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَقَالُوٓا۟ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا
عَجَبًا ﴿١﴾ يَهْدِيٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا ﴿٢﴾
وَأَنَّهُۥ تَعَٰلَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا ٱتَّخَذَ صَٰحِبَةً وَلَا وَلَدًا ﴿٣﴾ وَأَنَّهُۥ كَانَ
يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى ٱللَّهِ شَطَطًا ﴿٤﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن تَقُولَ ٱلْإِنسُ
وَٱلْجِنُّ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴿٥﴾ وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ
مِّنَ ٱلْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ﴿٦﴾ وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا۟ كَمَا ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَبْعَثَ
ٱللَّهُ أَحَدًا ﴿٧﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا﴾ تۆ بلێ بە دانیشتووانی مەککە: سروش نێردراوە بۆلای من کە بە ڕاستی تاقمێ لە جنۆکەکان لە سێ کەسەوە هەتا (١٠) کەس گوێیان گرتووە لە خوێندنی قورئان و بەباشی بیستییان، دووایی ووتیان: ئێمە بە ڕاستی قورئانێکی زۆر سەرسوڕێنەرمان بیستووە لە بارەی دانان و ئاوداری و جۆری ڕێکخستنی و، بەجگەی خودا شتی وا پەیدا نابێ.

جنۆکە بوونەوەرێکن، خودا لە ئاگر دروستی کردوون، بە چاوی ئادەمیزاد نابینرێن و هەستیان پێ ناکرێ بە وێنەی ئادەمیزاد، پێغەمەریان بۆ نێردراوە، هەیانە باوەڕیان هێناوە، هەیانە بێباوەڕن، خودا فەرمانی داوە بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بانگیان بکا بۆلای ئایینی ئیسلام و قورئانیان بەسەردا بخوێنێتەوە.

بوونی جنۆکەکان گومانی تێدانییە. کەواتە ئادەمیزاد نابێ گومانیان هەبێ لە بوونیان، بە گوێرەی فەرموودەی خودا، بە ئایەتی (١٣)ی سوورەتی (سەبأ)، ئایەتی (٣٩)ی سوورەتی (نەمل)، ئایەتی (٣٠) سورەتی (ئەلئەحقاف) ئایەتەکانی ئەم سوورەتەی (ئەلجین).

بە گوێرەی زانستی تازەیش بونی جنۆکە ڕوون کراوەتەوە. بەڵگەیش لەسەر نەبوونیان نی‌یە. ئەوە لە لایەکەوە، لە لایەکەوە زانستی تازە نەیتوانیوە، ژمارەی بوونەوەرانی دیاری و نادیاری بژمێرێ و، هیچ زانایە هەتا ئێستا، نە خۆی و نە ئەقڵی خۆی بە جۆرێکی بێگومان بناسێ، ئیتر چۆن ئەبێ جگەی خۆی بناسێ. بەڵام سروش دەری‌خستووە جنۆکە و فریشتە هەن. کەواتە پێویستە باوەڕمان بە بوونیان هەبێ.

زانایان بیریان جیاوازە لە بارەی جنۆکەوە: ئایا پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ جنۆکەی بینیوە و قورئانی بەسەردا خوێندوونەتەوە یا نە؟. عەبدوڵای کوڕی مەسعود ئەڵێ: پێغەمبەر نە جنۆکەی بینیوە، نە قورئانی بەسەردا خوێندوونەتەوە. بەڵام پێغەمبەر لەگەڵ چەند کەسێ لە هاوڕێکانی چوونە بازاڕی عوکازەوە، ئەو چوونەیان هاوکات بوو لەگەڵ کاتێکا جنۆکەکان قەدەغەکرابوون لەوەی هەواڵی ئاسمان بزانن، ئەگەر بەرزبوونایەتەوە، گڕی ئاگریان بۆ فڕە ئەدرا و ئەسووتان، بەو بۆنەوە بزانن بۆ ئەو کارە قەدەغە کراوە و،لەبەر چ شتێکە؟ دەستیان کرد بە گەڕان بە ڕووی زەوی‌دا، لە گەڕانەوەیان ئەو جنۆکانە تووشیان بوو بە پێغەمبەرەوە لە شیوی نەخلە، پێغەمبەر و هاوڕێکانی نوێژی بەیانی‌یان ئەکرد، گوێیان لێبوو پێغەمبەر قورئانی ئەخوێند، جنۆکەکان وتیان: ئەمە ڕێگەی لە ئێمە گرتووە بۆ بیستنی هەواڵی ئاسمان و، دوای گەڕانەوەیان بۆلای تاقمی جنۆکەکانی خۆیان ئەو ڕووداوەیان بۆ گێڕانەوە.

﴿يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا﴾ ئەو قورئانە ڕێنومایی و شارەزایی ئادەمیزاد و جنۆکە ئەکات بۆلای ڕاستی و بۆلای بیروباوەڕی ئایینی پاك و ڕاست، دووایی ئێمە باوەڕمان بەو قورئانە هێناوە و، بۆمان ڕوون بووەتەوە لە لایەن خوداوە هاتووە، ئێمە بەهۆی ئەو قورئانەوە شارەزای ئایینی ڕاست بووین بە نیازی پاکی بێگەردەوە، لەمەودوا ئێمە هاوبەش دانانێین بۆ پەروەردگاری خۆمان لەپەرستندا هیچ کەسێ، چونکە خودا توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە، ژن و مناڵی نی‌یە.

﴿وَأَنَّهُ تَعَالَى جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا﴾ وە باوەڕمان هێناوە کە بە ڕاستی گەورەیی پەروەدگاری ئێمە بەرز و بڵندە خودا پلەی باڵایە، پەروەدگاری زۆر گەورەیە، داینەناوە بۆخۆی ژن و منداڵ و، دوورە لەوەوە و، ژن و منالی هەبێ، خاوەنی هەموو بوونەوەرانە.

﴿وَأَنَّهُ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى اللَّهِ شَطَطًا﴾ وە باوەڕمان هێناوە بەوەی کە بە ڕاستی نەزان و، یاخیەکەی ئێمە کە شەیتانە گفتوگۆیەکی دوور لە ڕاستی و لە سنوور دەرچوو ئەڵێ، ئەیدا بەسەر خودادا، کە ئەڵێ خودا ژن و منالی هەیە.

﴿وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن تَقُولَ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا﴾ وە ئێمە باوەڕمان هێنابو بەوەی کە گومانمان وابوو ئادەمیزاد و جنۆکە درۆ نالێن و، نایدەنە پاڵ خودا، ئەو فەرموودەی خودایە

لەوەوە هاتووە پێشەوا ئایینی‌یەکان و، پەیڕەواکانی خۆیانیان فێر ئەکرد، بە چەندین کاری پڕوپوچ سەریان لێ‌تێك ئەدان و، لەوانە کە خودا خێزان و منالّی هەیە و، نادان و نەزانەکانیش بڕوایان پێ ئەکردن، گومانیان وابوو کە هیچ کەسێ کاری بەو جۆرە ناکا و بیداتە پالّ خودا، کاتێ ئێمە قورئانمان بیست بڕوای بێگومانمان پەیداکرد کە پێشەواکانمان بوختانیان داوەتە پالّ خودا، باسی خودایان کردووە بە کارێکی ناشایستەی وا، لە گەورەیی خوداوە دوورە، ئەوەی شایانی باسێ جنۆکەکان، بە یەك جار گوێیان لە خوێندنی قورئان بووە تەمێیان وەرگرتووە و باوەڕیان هێناوە بە بێگومانی بۆیان دەرکەوتووە ئایینی خودا ڕاستە، کەچی ئێمەی ئادەمیزاد چەن جار گوێمان لە قورئانە و، باوەڕی پێ ناکەین و بێ‌فەرمانی خودا ئەکەین.

﴿وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ الْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾ وە باوەڕمان هەیە بە ڕاستی چەن پیاوێ لە ئادەمیزاد پەنا ئەبەن بۆلای چەن پیاوێ لە جنۆکە بۆ ئەوەی بیانپارێزن لە خراپەی جیهان، دوایی ئەو جنۆکانە بەو پەنا بردنانە یاخی بوون و گوناهو بێ باوەڕی زۆر ئەکەن بۆ ئەو ئادەمیزادانە. ئەو فەرموودەی خودایە لەوەوە هاتووە، بەر لە ڕەوانەکردنی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، عەرەبەکان کاتێ شەویان بەسەر هاتێ لە جێگەیەکی چۆلّدا، بە دەنگی بەرز هاواریان ئەکرد، ئەی گەورەی جنۆکەی ئەم شیو و دۆلّە: من پەنا ئەگرم بە هۆی تۆوە من بپارێزێ لە خراپەی پیاوخراپانی تاقمی خۆت لەم شیوەدا، باوەڕیان وابوو کە گەورەی جنۆکەکان ئەیانپارێزێ.

بۆ ئەوەی ئێمە باشتر لە دەست بڕینی هەندێ لە ئادەمیزادی درۆزن و فێلّ زان بگەین کە ئادەمیزادە نەزان و ساویلکەکان ئەخەلّەتێنن، مانای ئەو ئایەتە بەم جۆرە ئەکەن: (بە ڕاستی هەندی لە ئادەمیزادی بێ‌ئەقلّ پەنا ئەبەن بۆلای هەندێ لە پیاوانی دەستبڕ و فێلّ زان کە لە خراپەی جنۆکە بیانپارێزن و، یا هەوالّی شتێکی‌یان بۆ ڕوون بکەنەوە لەمەودوا پەیدا ئەبێ و تووشی ئەوان ئەبێ، یا شتێکی دووریان بۆ نزیك بکاتەوە، یا شتێکی نزیکی‌یان لێ دوور بخاتەوە، بۆ ئەو مەبەستە ئەوەندە داوای کرێی زۆر ئەکەن لەو بێ ئەقلانە ماندوویان ئەکەن و بۆیان هەلّناسوڕێ). کەواتە مەبەست لە جنۆکە و پیاوانی دەستبڕە ئەلّێن: ئێمە پەیوەندیمان بە جنۆکەوە هەیە و، ئامادەیان ئەکەین بۆ هەر شتێ ئارەزۆمان بێ و بە کاریان دێنین.

﴿وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا كَمَا ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَبْعَثَ اللَّهُ أَحَدًا﴾ وە بە ڕاستی ئێمە باوەڕمان بەوە هێناوە، کە بە ڕاستی بێ‌باوەڕانی ئادەمیزاد گومانیان وایە، هەر بەو جۆرەی ئێوەی بێ‌باوەڕی جنۆکە گومان ئەبەن کە خودا هیچ کەسێ زیندوو ناکاتەوە لە ڕۆژی دوواییدا. یانێ باوەڕدارانی جنۆکە بە بێ‌باوەڕانی تاقمی خۆیان ئەلّێن: ئێوە وێنەی ئادەمیزادن باوەڕتان بە زیندووبوونەوە و پرسیار نی‌یە.

وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا
شَدِيدًا وَشُهُبًا ﴿٨﴾ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن
يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾ وَأَنَّا لَا نَدْرِىٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ
بِمَن فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ﴿١٠﴾ وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ
وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا ﴿١١﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن نُّعْجِزَ
ٱللَّهَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَن نُّعْجِزَهُۥ هَرَبًا ﴿١٢﴾ وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا ٱلْهُدَىٰٓ
ءَامَنَّا بِهِۦ فَمَن يُؤْمِنۢ بِرَبِّهِۦ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا ﴿١٣﴾
وَأَنَّا مِنَّا ٱلْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا ٱلْقَٰسِطُونَ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ
تَحَرَّوْا۟ رَشَدًا ﴿١٤﴾ وَأَمَّا ٱلْقَٰسِطُونَ فَكَانُوا۟ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴿١٥﴾
وَأَلَّوِ ٱسْتَقَٰمُوا۟ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَٰهُم مَّآءً غَدَقًا ﴿١٦﴾ لِّنَفْتِنَهُمْ
فِيهِ وَمَن يُعْرِضْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِۦ يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا ﴿١٧﴾

﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاء فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا﴾ و ئێمە باوەڕمان هێناوە کە ئێمە داوامان ئەکرد بگەینە ئاسمان و گوێ بگرین لە دەنگ و باس و هەواڵی ئاسمان و ئەمانتوانی بگەینە لای ئاسمان، دووایی ئێمە ئاسمانمان دەست کەوت پڕکراوە لە پاسەوانی زۆر بە هێز و بە توانا و، پڕە لە ئەستێرەی گڕداری سووتێنەر، ئاگریان فڕێ ئەدا و، نەیان ئەهێشت ئێمە بڕۆین بۆلای ئاسمان.

﴿وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَّصَدًا﴾ وە ئێمە باوەڕمان هێناوە کە بە ڕاستی ئێمە دائەنیشتین لە چەن جێگەیەکی ئاسمان بۆ گوێگرتن و ، ئەو کاتە بێ پاسەوانبوو، دوایی هەرکەسێ ئێستا بڕوا بۆ ئەوەی گوێ بگرێ، دەستی ئەکەوێ بۆخۆی ئەستێرەیەکی ڕووناکی گڕداری ئامادەکراو، ئەیان گێڕنەوە و نایەڵێ بگەنە جێگەی دانیشتنی لەوەوبەری و، بەر لە ڕەوانەکردنی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بۆمان دەرکەوت ئەو بەرگرتنەی ئێمە هۆی پەیدابوونی شتێکە زۆر گرنگە، بۆیە گەڕاین بە زەویدا، بۆ دۆزینەوەی ئەو شتە، تووشی پێغەمەر یووین نوێژی ئەکرد و قورئانی ئەخوێند، وەك لەمەوبەر باسکرا، قورئان ڕوونی ئەکاتەوە شتی نادیاری نازانن. ئەفەرموێ:

﴿وَأَنَّا لَا نَدْرِي أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي الْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا﴾ وە ئێمە باوەڕمان هێناوە کە بە ڕاستی ئێمە نازانین ئایا خراپە و سزا مەبەست ئەکرێ بە کەسانێ لە زەوی‌دان بەهۆی پاسەوانی‌کردنی ئاسمان یا پەروەدگاری ئەوان ئەیەوێ چاکە و میهرەبانی خۆی بدا بەوان. بێگومان مەبەست لە ڕەوانەکردنی پێغەمەر لە ناچوونی دانیشتووانی سەر زەوی نی‌یە، ئەگەر باوەڕ نەهێنن و، بەختیاری هەردوو جیهانە بۆیان ئەگەر باوەڕ بهێنن.

بۆ زانین: ئەم ئایەتە و ئایەتی پێشەوە، بۆمان ڕوون ئەکەنەوە کە جنۆکەکان بەر لە ناردنی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەرز ئەبوونەوە بۆلای ئاسمان، گوێیان لە دەنگێ یا لە گفتوگۆیەك ئەگرت، دوای هاتنی پێغەمەر قەدەغەکران لە بەرزبوونەوە، ئەوەیش ئەوە ناگەیەنێ جنۆکەکان شتی نادیاری ئەزانن و، ئاگاداری نادیاری ئاسمان بوون، چونکە ناگونجێ جگەی خودا شتی نادیاری بزانێ، ئەگەر جگەی خودا نادیاری بزانێ، ئەبوایە پێغەمەر گەورەترینی بوونەوەرانە شتی نادیاری بزانیبایە، ئەوەتە پێغەمەر خودا پێی فەرمووە: (تۆ بڵێ‌ی ئەگەر من شتی نادیاریم بزانیبایە، بە ڕاستی من چاکەی زۆرم بۆخۆم پەیدائەکرد و، تووشی خراپە نەئەبووم) ئیتر بوونەوەرانی بێ ئەقڵ لە جنۆکە و لە ئادەمیزاد چۆن ئەڵێن: ئێمە نادیاری ئەزانین و، ئەزانین لەمەودوا چ شتێ پەیدا ئەبێ، جنۆکەکانیش خۆیان ئەڵێن: ئێمە نادیاری نازانین.

﴿وَأَنَّا مِنَّا الصَّالِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَلِكَ كُنَّا طَرَائِقَ قِدَدًا﴾ وە بە ڕاستی ئێمە باوەڕمان هێناوە، کە بە ڕاستی ئێمەی جنۆکە، هەندێ لە ئێمە باوەڕدار و پیاوچاکە و، هەندێ لە ئێمە جگەی پیاوچاکانن لە پلەوپایەدا، ئێمە خاوەنی چەن بیروباوەڕی جیاوازین و، چەن ئایینی جیاوازمان هەیە، هەروەك ئادەمیزاد هەربەبێ جیاوازی.

﴿وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن نُّعْجِزَ اللَّهَ فِي الْأَرْضِ وَلَن نُّعْجِزَهُ هَرَبًا﴾ وە بە ڕاستی ئێمە باوەڕمان هێناوە: کە ئێمە ئەزانین بڕوامان وایە کە ئێمە توانای ئەوەمان نی‌یە ڕێگە لە خودا بگرین لە زەوی‌دا و لە دەست توانای خودا دەرچین و، ناتوانین ڕابکەین بۆلای ئاسمان.

﴿وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا الْهُدَى آمَنَّا بِهِ فَمَن يُؤْمِن بِرَبِّهِ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا﴾ وە ئێمە باوەڕمان هێناوە، کە بە ڕاستی لەو کاتەوە ئێمە خوێندنی قورئانمان بیستووە، باوەڕمان بە ڕاستی قورئان هێناوە کە فەرموودەی خودایە، دووایی هەرکەسێ باوەڕ بە پەروەدگاری خۆی بهێنێ، دوای ئەوە ئەو کەسە لە کەمبوونەوەی پاداشتی کرداری خۆی و لە ستەم کردن ناترسێ و، داوای ئەوەی لێ ناکرێ داوای شتێکی لێبکرێ نەتوانێ هەڵیبگرێ و، خودا خاوەنی بەزەیی‌یە.

﴿وَأَنَّا مِنَّا الْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا الْقَاسِطُونَ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُولَئِكَ تَحَرَّوْا رَشَدًا﴾ وە ئێمە باوەڕمان هێناوە کە بە ڕاستی هەندی لە ئێمەی جنۆکە موسڵمان بووین دوای هاتنی پێغەمەر و، هەندی لە ئێمە لاماندەوە لە ڕێگەی ڕاست، دوایی هەرکەسانێ موسڵمانبوون، دوایی ئەو کەسانە نیازی ڕێگەی ڕاستی‌یان کردووە و، بۆ خۆیانیان هەڵبژاردووە و، تووشی بەختیاری بوون.

جیاوازی ناوەرۆکی ئایەتی (١١)ی ئەم سوورەتە و، ئەم ئایەتە تەنها هەر ئەوە نییە: ئادەمیزادی پاکیان لە پیش ئیسلام ناو ئەبرد بە پیاوچاك، دووایی ناویان بردووە بە موسلمان.

﴿وأما القاسطون فكانوا لجهنم حطبا﴾ وە ئەوانە لە ریگەی راست لایانداوە، دووایی ئەبن بە سووتەمەنی بۆ خۆشکردنی ئاگری دۆزەخ.

﴿وألو استقاموا على الطريقة لأسقيناهم ماء غدقا لنفتنهم فيه﴾ وە بە راستی ئەگەر جنۆکە و ئادمیزاد لە سەر دەستوور و ریگەی راستی دادپەروەری ئیسلام راوەستن، لەو دەستوورە لانەدەن، بە راستی ئیمە دەرخواردی ئەوانی ئەدەین ئاویکی زۆری سوود بەخش و، لە هەرزانی و ئاسایش و بیترسیدا ئەژین، لەبەر ئەوەی ئیمە لەو خۆشی و هەرزانی و بیترسییەدا، ئەوان تاقی بکەینەوە، ئایا پەرە ئەدەن بە خودا پەرستی بۆ ئەوەی لە هەردوو جیهاندا تووشی بەختیاری بن، یا لائەدەن لە ئایینی پاك هەتا تووشی سزای خودا بن و، خودا تۆلەیان لی ئەکاتەوە..
خودای مەزن بە تایبەتی ناوی ئاوی لیرە بردووە، لەبەر ئەوەی ئاو هۆی ژیانی جیهانە و سەرچاوەی خۆشی و هەرزانییە.

﴿ومن يعرض عن ذكر ربه يسلكه عذابا صعدا﴾ وە هەرکەسی واز لە پەرستن و خۆشی پەروەدگاری خۆی بهینی، خودا ئەیخاتە ناو سزایەکی زۆر سەخت.

وَأَنَّ
ٱلْمَسَـٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾ وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ
يَدْعُوهُ كَادُوا۟ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا ﴿١٩﴾ قُلْ إِنَّمَآ أَدْعُوا۟ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ
بِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٠﴾ قُلْ إِنِّى لَآ أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا رَشَدًا ﴿٢١﴾ قُلْ إِنِّى
لَن يُجِيرَنِى مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا ﴿٢٢﴾ إِلَّا بَلَـٰغًا
مِّنَ ٱللَّهِ وَرِسَـٰلَـٰتِهِۦ ۚ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ
خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴿٢٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْا۟ مَا يُوعَدُونَ فَسَيَعْلَمُونَ
مَنْ أَضْعَفُ نَاصِرًا وَأَقَلُّ عَدَدًا ﴿٢٤﴾ قُلْ إِنْ أَدْرِىٓ أَقَرِيبٌ
مَّا تُوعَدُونَ أَمْ يَجْعَلُ لَهُۥ رَبِّىٓ أَمَدًا ﴿٢٥﴾ عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا
يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُۥ

يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا ﴿٢٧﴾ لِّيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُوا۟
رِسَٰلَٰتِ رَبِّهِمْ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَىْءٍ عَدَدًۢا ﴿٢٨﴾

﴿وأن المساجد لله فلا تدعوا مع الله أحدا﴾ وە ئیمەی جنۆکە باوەڕمان هەیە کە بە ڕاستی مزگەوتەکان خانەی خودان و، بە تایبەتی بۆ پەرستنی خودا درووست کراون، دووایی ئێوەی جنۆکە هیچ کەسێ مەپەرستن لەگەڵ خودا و، کەسێ تر مەکەن بە هاوبەشی خودا لە پەرستندا.

ئەو ئایەتە فەرمانمان پێ‌ئەدا مزگەوتەکان هەر بۆ پەرستنی خودا درووست کراوە و، ئەبێ ریزی لیبگیرێ، بت و جگەی بت لەو شتانەی ئادەمیزاد بە پیرۆزیان ئەزانن هەڵیان نەواسن و، پیویستە مزگەوت نەکرێ بە جیگەی مامەڵە و بازرگانی و کۆبوونەوەیە پەیوەندی بە نویژ و یادی خوداوە نەبێ.

﴿وأنه لما قام عبد الله يدعوه كادوا يكونون عليه لبدا﴾ وە ئیمەی جنۆکە باوەڕمان هەیە کە بە ڕاستی کاتێ بەندەی خودا کە موحەممەدە هەڵسا خودا بپەرستێ و قورئان بخوینێ، داوای باوەڕهینانی لە خودا ئەکرد، نزیکبوو جنۆکەکان هەندێکیان بکەون بەسەر هەندی تریانا بۆ گوێ‌گرتن لە قورئان و، لەبەر خۆشەویستی ئەوان بۆ پیغەمەر و خویندنی قورئان. هەروەها دوژمنانی پیغەمەریش کاتێ داوای خوداپەرستیان لێ‌ئەکرا، لە دژی پیغەمەر کۆ ئەبوونەوە، بەویتەی خوری‌یە بخرینە سەر یەکتری ئەبوون بە یەك تاقم لە دژی پیغەمەر. گفتوگۆی جنۆکەکان کاتێ گەرانەوە بۆلای تاقمەکەی خۆیان کۆتایی پێ‌هات و، ئەوەی بیستبوویان بۆیان گیرانەوە.

﴿قل إنما أدعو ربي ولا أشرك به أحدا﴾ تۆبلێ بەو کەسانەی سویند خواری یەکترین بۆ جەنگکردن لەگەڵ تۆ: بە ڕاستی من بە تەنها هەر پەروەدگاری خۆم ئەپەرستم و، هیچ کەسێ ناکەم بە هاوبەش بۆ ئەو لە پەرەستندا.

﴿قل إني لا أملك لكم ضرا ولا رشدا﴾ تۆ بلێ: بە ڕاستی من خاوەنی گەرانەوەی زیان لە ئێوە و، بەخشینی هیچ سودێ نیم، بەڵکو من ئادەمیزادیکم بە وینەی ئیوە، لە توانای مندا نی‌یە هیچ شتێ بۆ ئیوە بگەینم لە سوود و لە زیان، هەموویان بە دەستی توانای خودان.

﴿قل إني لن يجيرني من الله أحد ولن أجد من دونه ملتحدا إلا بلاغا من الله ورسالاته﴾ تۆ بلێ: بە ڕاستی هیچ کەسێ سزای خودا لانادا لەسەر من ئەگەر بێ‌فەرمانی خودا بکەم و، من هیچ پەنایەکم بۆ پەیداناکرێ لە جگەی خودا، مەگەر من هەر خاوەنی راگەیاندن و پەیامەکانی خوداییم کە بریتین لە فەرموودەی خوداکە بە منی سپاردووە.

﴿ومن يعص الله ورسوله فإن له نار جهنم خالدين فيها أبدا﴾ وە هەرکەسێ بێفەرمانی خودا و نیردراوی خودا بکات، دوایی بە راستی بۆ ئەو کەسە هەیە ئاگری دۆزەخ. هەتا هەتایە بەردەوام ئەبێ لە ناویا.

﴿حتى إذا رأوا ما يوعدون فسيعلمون من أضعف ناصرا وأقل عددا﴾ ئەوانە بێفەرمانی خودا ئەکەن لەسەر ئەو بێفەرمانی‌یە لاناچن، هەتا کاتێ ئەو شتە بەلینی پێدراوە لە سزای خودا بە چاوی خۆیان ئەیبینن، دوایی ئەزانن چ کەسێ یاریدەری بێ دەستەلاتە و چ کەسێ ژمارەی یاریدەدەرانی کەمە، لە بێباوەران یا باوەرداران؟. زۆری پێ نەچوو گەورەیی ئیسلام بێباوەرانی سەرنزم کرد و باوەرداران توانایان بەرزبوویەوە.

﴿قل إن أدري أقريب ما توعدون أم يجعل له ربي أمدا﴾ تۆ بلێ: من نازانم ئایا ئەو سزایە بەلینی پیدراوە بە ئیوە نزیکە تووشی ئیوە ببێ، یا پەروەدگرای من ماوەیەکی بۆ هاتنی ئەو سزایە داناوە هەتا توشتان ئەبێ.

﴿عالم الغيب فلا يظهر على غيبه أحدا﴾ پەروەدگاری من بە هەموو شتیکی نادیار و نەبینراو ئەزانێ، دووایی پەروەردگاری من هیچ کەسێ هەر پلەیەکی لە جگەی خۆی لە جنۆکە و لە ئادەمیزاد هەبێ، ئاگاداری شتی نادیاری‌ناکا.

﴿إلا من ارتضى من رسول فإنه يسلك من بين يديه ومن خلفه رصدا﴾ مەگەر پەروەدگار کەسێ ئاگاداری هەندی شتی نادیاری بکا لە پیغەمەران پەسەندکراوی لای خودابێ و هەلی بژاردبێ بۆ پیغەمەرایەتی، فیری ئەو کارە نادیارانەی ئەکات و ئەیکا بە کاریکی پەکخەر بۆی و، لە خۆیەوە ئەو کارە نادیارە نازانێ. دووایی خودا چەن پاسەوان لە فریشتە ئامادە ئەکا لەبەردەم ئەو پیغەمەرەوە و لە دوایەوە و، بۆ ئەوەی بیپاریزن لە شەیتانەکان هەتا سروشی خودا رابگەیەنێ بە ئادەمیزاد و بە جنۆکە.

﴿ليعلم أن قد أبلغوا رسالات ربهم وأحاط بما لديهم﴾ لەبەر ئەوەی زانینی بە راستی روونی بکاتەوە بۆ ئادەمیزاد و جنۆکە کە بە راستی پیغەمەران پەیامەکانی پەروەردگاری خۆیانیان راگەیاندووە بەوان و، پەروەدگار ئەزانێ بە هەموو شتێ پیغەمەران ووتوویانە تاکە پیتیکی لە گفتوگۆی ئەوانی لی ووننابێ.

﴿وأحصى كل شيء عددا﴾ وە خودا ژماردوویەتی و ئەزانێ هەموو شتێ لە دانە دانەی دلۆپێ ئاوی باران و دانە دانەی لم و گەلای درەختەکان، ئیتر چۆن بە شتێ نازانێ پیغەمەران کردوویانە.

روالەتی دەرکەوتووی ئەو سێ ئایەتانەی پیشەوە، وامان بۆ دەرئەخەن جگەی پیغەمەران، خودا کەسی تر ئاگاداری شتی نادیاری ناکا و نازانێ بە شتێ لەمەوپاش پەیدا ئەبێ. بەلام هەندێ لە زانایان ئەلین: خودا هەندێ لە دۆستانی خۆی ئاگاداری شتی نادیاری بکا بەهۆی خستنەوەی ئەو شتە بۆ ناو دلیان، یانێ بە ئیلهام نەك بە سروش. بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە ئەگیریتەوە پیغەمەر فورمووی: (لە نەتەوەکانی بەر لە ئیوە چەند کەسێ بوون بە ئیلهام هەوالیانداوە بە شتێ نادیاری بەبێ ئەوەی پیغەمەر بن، ئەگەر لە ئۆمەتی مندا کەسیکی تری وەك ئەوان هەبێ، ئەو کەسە ئەبێ عومەری کوری خەتتاب بێ). زۆر کەسی زانا و زیرەك هەن بەهۆی بەلگە و نیشانەوە هەوال بدەن بە پەیدابوونی شتێ لەمەودوا پەیدا ئەبێ.

# ﴿ سورەتی ئەلموزەمیل ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن جگە لە ئایەتەکانی (١٠-١١-٢٠) لە مەدینە هاتوونەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٢٠) ئایەتن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ﴿١﴾ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢﴾ نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا
﴿٣﴾ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴿٤﴾ إِنَّا سَنُلْقِى عَلَيْكَ قَوْلًا
ثَقِيلًا ﴿٥﴾ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ هِىَ أَشَدُّ وَطْـًٔا وَأَقْوَمُ قِيلًا ﴿٦﴾ إِنَّ لَكَ فِى
ٱلنَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا ﴿٧﴾ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا ﴿٨﴾
رَّبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذْهُ وَكِيلًا ﴿٩﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

زانایان بیریان جیاوازە بۆ هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ئایەتانـە، زۆربـەی زۆریـان ئـەڵێن: قورەیشییەکان لە (الدار الندوە) کۆبوونەوە، بـۆ بـەرگری کـردن لـە پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾، دوای ئەوەی ئەو هەواڵەی بیست پێغەمەر بەرگەکەی پێچایەوە بە لەشیا و بە خەفەتەوە خەوت، لـەو کاتەدا جبرەئیل سروشی بۆ هێنا و، ڕووی کردە پێغەمەر و فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ﴾.

هەندێ لە زانایان ئەڵێن: کاتێ پێغەمەر لە ئەشکەوتی (حیراء) دا بووە، جبرەئیل چوو بۆلای، بە ترسەوە هاتەوە بۆلای جێگەیی و ڕاکشا و فەرمووی دامپۆشن، لـەو کاتـەدا جـبرەئیل هـات بۆلای و فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ﴾.

هەندێ تر لـە زانایان ئەڵێن: پێغەمەر خۆی پێچاوە و، خۆی ئامادەکردبوو بۆ پەرستنی خـودا و نوێژکردن، جبرەئیل هاتە خوارەوە بۆلای و پێی فەرموو: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ﴾.

پێغەمەر فەرمانی پێدرابوو کە هەڵسێ بۆ نوێژکردن لـە دوای سـێیەکی شـەو، یـا لـە دوای نیوەی شەو، یا لە دووسێیەکی بەشی شەودا. یانێ بە ئارەزۆی خۆی لە یەکێ لەو سێ کاتانەدا. بەو بۆنەوە خودا فەرمووی:

﴿يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا نِصْفَهُ أَوِ انقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا أَوْ زِدْ عَلَيْهِ﴾ ئەی کەسێ خۆتـت پێچاوەتەوە بە بەرگی شەوتەوە، هەڵسە بەلای نوێژکردنەوە بە بـەردەوامی لـە شـەودا مەگـەر کەمێ لـە شەو هەڵئەسی، ماوەی ئەو شەوەش کە هەڵئەسێ بۆ نوێژکردن نیـوەی شـەو بـێ، یـا کەمتر بێ لـە نیوەی شەو، یا زۆرتر بێ لـە نیوەی شەو هەتا ئـەبێ بـە دوو ئـەوەندەی سـێ‌یەکی شەو، لـە باسی ماناکردنی ئایەتی (٢٠)ی ئەم سورەتەدا، باشتر باسی شەو و نوێژمان بـۆ ڕوونـتر ئەبێتەوە.

﴿وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلًا﴾ وە تۆ لـەسەر خۆت قورئان بخوێنە و، پەلە مەکە لـە خوێندنیا بە جۆرە پەلـە نەکردنێ بێ، جێگەی دەرچوونی پیتەکانی قورئان ئاشکرا بکەی، هەتا بتوانـی لـە توانـا و مەبەستی قورئان بگەیت، سـوود لــە فەرمانـەکانی و ئامۆژگاری‌یـەکانی وەربگریـت و خـۆت بپارێزی لـە بێ فەرمانی خودا و، بە ئومێدی پاداشتی زۆربـی، پلـەکانی خوێندنـی قورئـان، بـەم جۆرەی خوارەوەیە، سێ پلەن:

١- ﴿التَرْتِيلُ﴾ یانێ خوێندنی قورئان بەلـەسـەر خۆیـی و بـێ پەلـەکردن، جوێ‌کردنـەوەی پیتەکانیان لـە یەکتری و، دەرچوونیان لـە جێگەی خۆیانا و، ئەو جۆرە خوێندنە شیرینترین پلـەی خوێندنی قورئانە.

٢- ﴿الحذر﴾ خوێندنی قورئانە بە پەلـە. بەڵام پێویستە چاودێری یاسای تەجوید بکـرێ. بـە جۆرێ لـە یاسای خوێندنی قورئان دەرنەچێ.

٣- ﴿التدیور﴾ خوێندنی قورئانە لـە نێوان لـەسەرخۆیی و لـە نێـوان پەلـەکردن. ئـەو سـێ پلانە درووستە بۆ خوێندنی قورئان. بۆ هەموو کەسێ کـام پلـەیان ئاسـانە بـۆی بـەو جۆرەیـان قورئان بخوێنێ.

﴿إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا﴾ بە ڕاستی ئێمە ڕەوانە ئەکەین بۆ سەر تۆ بە هۆی جبرەئیلـەوە گفتوگۆیەکی زۆر گران کە بریتی‌یە لـە قورئان لـە هەموو ڕوویەکەوە: گران و بەهێزە لـە لایـەن بەردەوامی و پەك خستنی بێ باوەڕان، لـە لایەن بیر وباوەڕ و دەستوورەوە. لـە لایەن خەباتی‌یەوە لـە دژی تاوانباران و ستەمکاران. بە بۆنەی چاودێری‌کردنی پێنج نوێژەکانەوە. هەڵسان لـە کاتی شەودا بۆ نوێژی بەیانی و، دەستنوێژ شۆردن زۆر جاران بە ئاوی سارد، ڕۆژووگرتن لـە ڕۆژانـی گەرمادا و، هەڵسان بۆ پارشێو، بەجێ هێنانی حەج و عەمرە و تەواف و ڕاکردنی نێوان سـەفا و مەروە. لـە هەمووان گرانتر جەنگکردن لـە دژی بێ‌بـاوەڕان بـۆ بـەرزی و پـەرەپێدانی ئـایین و، نەگۆڕینی ڕەوشتی ئیسلام و، بۆیە زانای بەناوبانگ، هونەرمەندی ژیر (بەرنادشۆ) ئەڵێ: (ئەگەر موحەممەد لـە ناو سەدەی بیستەمدا بووایە خراپە و گومانی لـە ناو ئەبرد). ئەگەر پرسـیار بکـرێ بۆچی خودا فەرمانی داوە خودا پەرستن بکرێ لـە شەودا، خودا ئەفەرموێ:

﴿إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ هِيَ أَشَدُّ وَطْئًا وَأَقْوَمُ قِيلًا﴾ بە ڕاستی هەڵسانی ئادەمیزاد لە جێگەی خەوتنیا، دوای پشوودانی لە کاتەکانی شەودا، ئەو کاتانەی شەو بۆ پەرستن گرانترن لەسەر دەروونی ئادەمیزاد لە کاتەکانی شەودا، چاکتر و ڕاستترە بۆ خوێندنی قورئان و، دەم و دڵی ئادەمیزاد پاکتر و لەسەرخۆترە لە کاتەکانی ڕۆژدا بە شەو.

﴿إِنَّ لَكَ فِي النَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا﴾ بە ڕاستی لە ڕۆژدا کار و هاتووچۆی زۆر دوور و درێژ بۆ تۆ هەیە، بۆ جێبەجێ کردنی کارە گرنگەکانت و پێویستی گوزەرانت. کەواتە شەو بۆ پەرستن و شەو نوێژ. ڕۆژیش بۆ پەیداکردنی هۆی ژیان.

﴿وَاذْكُرِ اسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا﴾ وە تۆ یادی گەورەیی خودا بکە و باسی ناوی پاکی پەروەگاری خۆت بکە و، بە نیازی پاکەوە لەبەر ڕەزامەندی ئەو کارە چاکە بکە و، تۆ واز لە بوونەوەران بهێنە و، ڕوو هەر بۆلای پەروەدگاری خۆت بکە، بە پچڕانی خۆت لە جگەی خودا، بە نیازی پاکەوە. خودای مەزن کاتەکانی کردووە بە سێ بەش. یەکەم بۆ پەرستنی خودا، دووەم بۆ خۆماندووکردن لەگەل بێباوەڕان، سێهەم بۆ پشوودان.

﴿رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَاتَّخِذْهُ وَكِيلًا﴾ خودا پەروەدگاری بەڕێوەبردنی ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاوایە هەر ئەو شایانی ئەوەیە ڕووی بەلاوە بکرێ، هیچ کەسێ نییە ڕووی بکرێ بۆلای جگەی خودا، دووایی تۆ هەر خودا بکە بە بەڕێوەبەری هەموو کارێکت و، هەموو کارێکی خۆت بۆلای ئەو بسپێرە.

وَاصْبِرْ
عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَاهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ﴿١٠﴾ وَذَرْنِي وَالْمُكَذِّبِينَ
أُولِي النَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا ﴿١١﴾ إِنَّ لَدَيْنَا أَنكَالًا وَجَحِيمًا ﴿١٢﴾
وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣﴾ يَوْمَ تَرْجُفُ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ
وَكَانَتِ الْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا ﴿١٤﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَا إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَاهِدًا
عَلَيْكُمْ كَمَا أَرْسَلْنَا إِلَىٰ فِرْعَوْنَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ الرَّسُولَ
فَأَخَذْنَاهُ أَخْذًا وَبِيلًا ﴿١٦﴾ فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ
الْوِلْدَانَ شِيبًا ﴿١٧﴾ السَّمَاءُ مُنفَطِرٌ بِهِ ۚ كَانَ وَعْدُهُ مَفْعُولًا ﴿١٨﴾
إِنَّ هَٰذِهِ تَذْكِرَةٌ ۖ فَمَن شَاءَ اتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِ سَبِيلًا ﴿١٩﴾

﴿وَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَاهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا﴾ وە تۆ ئارام بگرە لەسەر شتێ بت پەرستان ئەیلێن لە گفتوگۆی پڕوپوچ و ئازاردانی خۆت و تۆ دوور بکەوەرەوە لەوان، بە دوورکەوتنەوەیەکی چاك و، تورە مەبە لەوان، کاری خۆت هەوالەکەی لای خودا بکە.

﴿وَذَرْنِي وَالْمُكَذِّبِينَ أُولِي النَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا﴾ وە تۆ واز لە من و ئەو کەسانە بهێنە خاوەنی خۆشی و سامان و ڕابواردنن لە جیهاندا و تۆ بە درۆ ئەخەنەوە و، بڕوایان بە من نیە، تۆ بە جادوگەر و شاعیر و شێت دائەنێن و، تۆ کەمێ مۆڵەتی ئەوان بدە، هەتا سزای ئێمە ئەڕژێ بەسەریانا.

﴿إِنَّ لَدَيْنَا أَنكَالًا وَجَحِيمًا وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا﴾ بە ڕاستی لە لای ئێمە هەیە چەن پێون و کەلەپچە و، دۆزەخی زۆر گەرم و، خواردەمەنیە لە خراپیدا قوت نادرێ و سزایەکی خاوەن ئازار.

﴿يَوْمَ تَرْجُفُ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ وَكَانَتِ الْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا﴾ ئەو شتانەی باسکران پەیدا ئەبن لە ڕۆژێکا زەوی و کێوەکان ئەجولێن بەو شتانەوە لەسەریانن و، کێوەکان ئەبن بە کۆمەڵی لمی تواوە.

﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَاهِدًا عَلَيْكُمْ كَمَا أَرْسَلْنَا إِلَى فِرْعَوْنَ رَسُولًا﴾ بە ڕاستی ئێمە ڕەوانەمان کردووە بۆلای ئێوەی دانیشتووانی مەککە پێغەمەرێ شایەتی ئەدا لە سەرتان لە ڕۆژی دووایدا بەو بێباوەڕتانە و، بەوەی فەرموودەکانی ئێمەتان بە درۆخستۆتەوە، هەروەك ئێمە ڕەوانەمان کرد بۆلای فیرعەون پێغەمەرێ وەك موسابێ.

﴿فَعَصَى فِرْعَوْنُ الرَّسُولَ فَأَخَذْنَاهُ أَخْذًا وَبِيلًا﴾ دووایی فیرعەون بێفەرمانی ئەو پێغەمەرەی کرد، دووایی ئێمە سزای فیرعەونمان دا بە سزایەکی زۆر سەخت لە ناومان برد بە ئاوی دەریا خنکاندمان.

﴿فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ الْوِلْدَانَ شِيبًا﴾ دووایی ئێوە چ کاتێ ئەترسن لە خودا و لە ڕۆژی منالْ ئەگێڕێ بە پیر ئەگەر ئێوە باوەڕ نەیەرن لە جیهاندا و، بەردەوامبن لەسەر بێباوەڕی.

﴿السَّمَاءُ مُنفَطِرٌ بِهِ كَانَ وَعْدُهُ مَفْعُولًا﴾ ئاسمان بەهۆی ئاڵۆزی ئەو ڕۆژەوە پارچە پارچە ئەبێ، بەڵێنی خودا بۆ هاتنی ئەو ڕۆژە گومانی تێدا نیە و ئەبێ بیکا و ببێ، ئیتر بە چ جۆرێ ڕزگاریان ئەبێ بێباوەڕان لە سزای ڕۆژی منالْ پیر بکا و، ئاسمان پارچە پارچە ببێ.

﴿إِنَّ هَذِهِ تَذْكِرَةٌ فَمَن شَاءَ اتَّخَذَ إِلَى رَبِّهِ سَبِيلًا﴾ بە ڕاستی ئەو ترساندن و هەڕەشانە ئامۆژگاری کردنە دووایی هەرکەسێ ئارەزۆی هەیە پەند وەربگرێ، با ڕێگەی ڕاست وەربگرێ بۆلای پەروەدگاری خۆی باوەڕبهێنێ.

إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيْلِ وَنِصْفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٌ
مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَ ۚ وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ۚ عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ
عَلَيْكُمْ ۖ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ ۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ ۙ
وَءَاخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِى ٱلْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ۙ وَءَاخَرُونَ
يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ ۚ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟
ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقْرِضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ
عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا ۚ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿٢٠﴾

﴿إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَى مِن ثُلُثَيِ اللَّيْلِ وَنِصْفَهُ وَثُلُثَهُ وَطَائِفَةٌ مِّنَ الَّذِينَ مَعَكَ﴾ بە ڕاستی پەروەدگاری تۆ ئەزانێ کە بە ڕاستی تــۆ و، کەسانێکی ئـەوتۆی هەڵـەئسن کـەمێ لـە دووسێیەکی شەودا، نیوەی شەو و، سێیەکی شەو بۆ پەرستنی، خودا بۆ شەو و نوێژ.

خودای مەزن لـە سەرەتای ئەم سورەتەدا فەرمانیدا بە پێغەمەر و بە کەسانێ لەگەڵی بـوون، کە دوو سێیەکی شەو یا نیوەی شەو یا سێیەکی شەو هەڵـسـن بـۆ خـودا پەرستی، ئـەوانیش فەرموودەی خودایان بیست و پەیڕەوی فەرمانەکەیان کرد و، هەندێ لـە هاوڕێکـانی پێغەمـەر، کاتەکانی شەویان بە ڕاستی بۆ دیاری نەئەکرا، وا ئەبوو تەواوی شەو یـا زۆربـەی کـاتی شـەو هەڵئەسان بۆ شەو و نوێژ، هەندێکییان وایان لێهات لـەبەر وەستانیان لـە درێژی شەودا قاچیـان ئاوسا، ئەو کارەیان ئەکرد لـەبەر ڕەزامەندی خودا و، نەوەك تووشی هەڵـەبن و کەمتر لـە ماوەی فەرمان پێدراو و هەڵسن، خودای مەزن لـەبەر لابردنی ئازار لـەسەریان ئەو فەرمانانەی خۆی بۆ گۆڕین بە فەرمانێ تر ئاسان بۆ ئەوان، وەك ئەفەرموێ:

﴿وَاللَّهُ يُقَدِّرُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ فَاقْرَؤُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ﴾ وە خودا دیاری کردووە بۆ هەر یەکە لـە شەو و ڕۆژ ئەندازەیدیاری کراوی کـات بۆیـان، خـودا ئەزانێ ئێوە ئەو کاتە دیاری کراوە نازانن و، بـە گوێـرەی گومـانی خۆتـان ئـەو کاتانـە دیـاری ئەکەن، چونکە ئەو کاتە کاتژمێر نەبووە، دووایی خـودا ئـەو داوایـەی پێشووی لـەسـەر ئێـوە هەڵگرت، دووایی ئێوە لـە بریتی هەڵسانتان لـە شەودا بەو جۆرەی ڕابردوو، ئێوە ئەوەی ئاسـانە بۆتان شتێ لـە قورئان بخوێنن و، چەنتان بۆ گونجا هەڵسن و بۆ شەو نوێژ بە ئـارەزۆی خۆتـان و پێویست نییە لـەسەرتان شەو نوێژ.

زانایان ئەڵێن: ساڵێ یا زۆرتر لە ساڵی شەو و نوێژ بەو جۆرەی باسکرابوو پێویست بوو لە سەر پێغەمەر و ئۆمەتی، بەم ئایەتانەی خوارەوە بە یەکجار پێویست بوونی هەڵگیرا لەسەر جگەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ خودا فەرمووی:

﴿عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَى وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ اللَّهِ﴾ خودا ئەزانێ لەمەودوا هەندێ لە ئێوە نەخۆش ئەکەون ناتوانن هەڵسن بۆ شەو و نوێژ، هەندی ترتان ئەڕۆن بە ناو زەوی‌دا، بۆ کاروانی و بازرگانی، داواکردن و پەیداکردنی خواردەمەنی و هۆی ژیان و گوزەرانتان، ئەوانەیش پێویستی‌یان بە پشودان و خەوتنی شەو هەیە.

﴿وَآخَرُونَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَاقْرَؤُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ﴾ وە هەندێ تر لە ئێوە جەنگ ئەکەن لە ڕێگەی‌ئایینی خودادا و بۆ پەرەپێدانی ئایینی خودا و، بۆیان ناگونجێ شەو نوێژ بکەن، دووایی ئێوە ئەوەی ئاسانە بۆتان لە خوێندنی قورئان و کردنی شەو نوێژ بیان کەن و پێویست بوونەکەی نەماوە، ئەگەر بۆتان کرا وا چاکە ئێوە شەو نوێژژ بکەن.

خودای مەزن دووجار ڕستەی (فَاقْرَؤُوا مَا تَيَسَّرَ)ی فەرمووە، یەکەمیان لەبەر هۆی نەزانینی کاتەکانی شەو و ڕۆژ، دووهەمیان لەبەر هۆی نەخۆشی و کاروان و جەنگ کردن.

﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ وە ئێوە بۆ لەمەودوا پێنج نوێژ بکەن و پایەداری بکەن و بە هیچ جۆرێ‌نەکردنیان بۆ نی‌یە، نەبە نەخۆشی و، نە لە کاروان و نە لە کاتی جەنگدا و، بەهەر جۆرێ بۆتان کرا پێویستە بیان کەن و، زەکااتەکانتان ببەخشن بە هەژاران، بە گوێرەی یاسای دیاری‌کراو و، ئێوە دارایی خۆتان ببەخشن لە ڕێگە چاکەکاندا، بە گوێرەی توانای خۆتان و، پێویست نی‌یە لەسەرتان. خودا لە قورئانی پیرۆزدا حەوت جار ڕستەی ﴿وَأَقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ دووپات کردووەتەوە.

﴿وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ اللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا﴾ وە هەرشتێ ئێوەی باوەڕدار پێشی بخەن بۆ سوودی خۆتان لەهەر چاکەیە بێ، ئێوە پاداشتی ئەو چاکەیەتان دارایی بێ یا جگەی دارایی، لە ڕۆژی دووایدا دەستتان ئەکەوێتەوە لە خزمەت خودادا و، بە چاکتر لەوەی لاتانە و، بە گەورەترین پاداشت و، لەوەی ڕای سپێرن دووای خۆتان بۆتان بکەن.

﴿وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ وە ئێوە داوای لێ‌خۆشبوون لە خودا بکەن بۆ گوناهەکانتان. بە ڕاستی خودا لێ‌بوردنی زۆرە بۆ کەسانێ کەمترەخەمی نەکەن لە فەرمانی خودا، میهرەبانە بۆ کەسانێ پەشیمان ئەبنەوە بۆلای خودا.

بۆ زانین: ئەم سورەتە یەکەمین سوورەتە، کۆتای‌یەکەی فەرماندانی سەرەتاییەکەی بگۆڕێ بۆ لای فەرماندانی تر.

# ﴿ سورەتی ئەلمودەسیر ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن جگە لە ئایەتی (٥٦) لە مەدینە هاتوونەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٥٦) ئایەتن.


بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴿٣﴾ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾
وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ ﴿٥﴾ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴿٦﴾ وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ ﴿٧﴾
فَإِذَا نُقِرَ فِي النَّاقُورِ ﴿٨﴾ فَذَٰلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ ﴿٩﴾ عَلَى الْكَافِرِينَ
غَيْرُ يَسِيرٍ ﴿١٠﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەو (١٠) ئایەتانە ئاماژە ئەکەن بۆلای پێشە و ڕەوشتی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ وەك نێردراوێکی ڕاست بۆلای بوونەوەران، ئاماژەیش ئەکەن بۆلای ئەوەی ئادەمیزاد لەبەردەم خودا یەکسانن و، ئەفەرموێ:

﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ قُمْ فَأَنذِرْ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ ئەی کەسێ خۆتت پێچاوەتەوە بە بەرگی خۆتەوە: تۆ هەڵسە لە جێگەی خەوتندا و، بە نیاز و هوشیاری تەواوە و، دووایی تۆ ئادەمیزاد بترسێنە بە هۆی پەیامی خۆتەوە و لە سزای خودا ئەگەر باوەڕ نەهێنن و، پەروەدگاری خۆت بە گەورە دابنێ و کەسی تر جگەی خودا بە گەورە نەیەتە پێش چاوت، دووایی بەرگ و پۆشاك و جێگە وەستانت پاك بکەرەوە لە پیس و پۆخڵی و بە ئاوی پاك، بە بێ پاکی پۆشاك و بەرگ نوێژەکانت درووست نی‌یە، هەروەها دەروونی خۆت لە بێباوەڕی پاك بکەرەوە.

﴿وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ﴾ وە دووایی تۆ واز لە هەموو شتێ بهێنە بیێتە هۆی سزادان و، تۆ شتێ مەبەخشە لە ڕێگەی ڕەزامەندی خودا و لە دەروونی خۆتدا دابنێی زۆرت بەخشیوە، هەرچەندە زۆر ڕاستە تۆ چاکەت زۆرە و، ڕێزی گەورەییت دراوە بەسەر ئادەمیزاددا و، تۆ لەبەر ڕەزامەندی خودا ئارام بگرە لەسەر باری گرانی پێغەمەرایەتی.

﴿فَإِذَا نُقِرَ فِي النَّاقُورِ فَذَلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ عَلَى الْكَافِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ﴾ دووایی هەرکاتێ لە رۆژی دووایی‌دا فوو کرا بە سوردا، کە شتێکە بە وێنەی شاخی گایە، یەکەم جار ئیسرافیل فووی پێدا ئەکات، دووایی ئەو رۆژە سەخت و گرانە لە سەر بێباوەڕان، ئاسان نی‌یە لەسەریان. هەرچەندە دووای تەنگانە خۆشی پەیدا ئەبێ، بەڵام بۆ ئەوان خۆشی نابینرێ و ئازاریان بەردەوامە هەتا هەتایە.

ناوەرۆکی ئەو (١٠) ئایەتانەی پێشەوە، لە وەزو هاتووە: کاتێ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەرانبەر بە هێز و توانای راوەستابوو، لە هەمان کاتا خاوەنی دارایی و چەك نەبوو، جگەی باوەڕی بە تینی بە خودا بە نیازی پاکەوە هیچ شتێ بە دەستەوە نەبوو لەگەڵ ئەوەیشدا تووشی ئازاری زۆر بووبو، بێباوەڕان ژن و منالْ و بەندەکانی خۆیانیان هان ئەدا درك و پیسی‌یان لە رێگەی پێغەمەردا دائەنا، زۆر جاران پیسی‌یان ئەرێژا بەسەریا، بە جۆرێ ئازاریان ئەدا، یەکێ لەوان مێزەرەکەی داگرت و خستی‌یە ملی و رایکێشا بە توندی، بەوەیشەوە وازیان لێ‌نەهێنا سوپا و چەکیان ئامادەکرد لە دژی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەگەڵ ئەو هەمووە ئازارەدا ئارامی گرت لەبەر فەرموودەی خودا لە ئایەتی (٧)ی ئەم سوورەتەدا فەرمانی پێدرابوو.

لە بیرمان نەچێ خودا لە ئایەتی (٤)دا فەرمانی پێ‌دابوو بە پاك و خاوێنی بەرگ و لەشی، ئەو پاك و خاوێنی‌یە جێگەی سەربەرزی و پێشکەوتنە بۆ کۆمەڵێ موسڵمانان. بە داخەوە ئێمە گرنگی نادەین بە پاکی لەش و بەرگ و دەروون و، بە پاکی ناو خانوو رێگە و کۆڵان و جاددەی ناو گوند و شارەکانمان. زۆر جێگەی شایانە خودا لەو ئایەتەدا فەرمانی داوە بە راگرتنی پاك و خاوێنی. ئەوەتە (بتنام) پرۆفیسۆری ئینگلیزی زۆر ستایشی ئایینی پیرۆزی ئیسلامی کردووە لە نامەکەی خۆیا (أصول الشرائع) ئەڵێ بە راستی پاك و خاوێنی راگرتن لە ئایینی ئیسلامدا بە زۆری لەو شتانەیە داوا لە موسڵمانان ئەکا بۆلای بەرزبوونەوەی رەوشتی پاك و بەرەوپێش ئەرۆن ئەگەر بەردەوامبن لەسەر ئەو فەرمانەی پێیان دراوەبە خاوێنی راگرتن بە چاکترین راگرتن.

ئەو ئایەتانەی لە ئایەتی (١١)وە دەست پێ ئەکەن لەوەوە هاتوون: سەرۆکەکانی قورەیش ئەوانەیان کە دوژمنی سەرسەختی پێغەمەر بوون، چەند کەسێ بوون و لە هەموویان گەورەتر کە دژایەتی زۆری پێغەمەریان ئەکردبریتیبوون لە ئەبوجەهل. ئەبو لەهەب. ئەبو سوفیان. وەلیدی کوڕی موغیرە، لە ناو ئەوانەیشدا وەلید لە هەموویان دارایی زۆرتر بوو، پلەو پایەی لە هەموویان بەرزتر بوو، باخ و بێستانی فراوانی لە مەککە و تایف هەبوو، بەرهەمیان لە هاوین و زستاندا کۆتایی پێ نەئەهات، چوارپێ و ئاژاڵ و کارەکەر و دارایی و بەندەی ئەوەندە زۆربوون نەئەهاتنە ژمارە و، (١٠) کوڕی هەبوو لە لای دائەنیشتن، هەموویان خاوەنی پلەو

پایەبوون، پێویستیان بە کاروان و گەڕان نەبوو، بۆ پەیداکردنی ژیان و گوزەران. ئەو سەرۆکانە و ئەوانـەی سـەربەوان بـوون، تەنگـە تـاوبوبون کـە ئـەیان بینـی داواکاری‌یەکـەی پێغەمـەر، وەرئەگیریێ لـە ناو زۆرکەس لـە عەرەبەکان. تەماشـایان ئـەکرد کـاتی حـەج کـردن نزیکـە و، پێغەمەر کۆ ئەبێتەوە لـەگەڵ ئەو کەسانەی دێن بۆ مەککە، ئایینی خۆی بـەوان ڕائەگەیـەنێ. بـۆ ئەو مەبەستە سەرۆکەکانی قوڕەیش کۆبوونەوە. دەستیان کرد بە ڕاوێژ و پیلان داڕشتن، چ شتێ بکەن لـە دژی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾. بۆ ئەوەی ئایینەکەی پـووچ بکەنـەوە، ئـەو کەسـانەی دێـن بـۆ مەککە لـە پێغەمەر وەریان گێڕن.

ئەوەبوو یـەکێ لـەو کـۆڕەدا هەڵسـا بەسـەرپێ ووتـی: موحەممـەد شـایەرە، کەسـی تـری دووهەمیان هەستا ووتی پۆشەویژە، سێ‌هەمیان هەڵسا ووتی: شێتە، چوارەمیان ووتـی: درۆزنـە، وەلید دانیشتبوو بە بێ‌گفتوگۆکردن، بە وەلیدیان ووت: ئەی عەبدوشەمس: بۆ دەنگ ناکـەی؟ لـە وولاّمیاندا ووتی: لـە محەممەدەوە ئەبیسم نامەیە ئەخوێنێ لـە نامەی ئادەمیزاد و جنۆکە ناچـێ، بە ڕاستی پاراوی و شیرینی تێدا دەرئەکەوێ، ئەوەی ڕاسـتی‌بێ موحەممـەد بـۆڕ نـادرێ، وەلیـد ئەوانەی ووتوو، دانیشتووان سەرگەردانبوون و سەریان سـوڕما و، ووتیـان: وەلیـد لـە ئـایینی باوباپیری خۆی وەرگەڕاوە.

قوڕەیشی‌یەکان بەو بۆنەوە ووتیان: زۆر کەس دوای ئایینی موحەممەد ئەکەوێ، وەلید تووڕە بوو، کۆڕەکەی بەجێ‌هێشت، دووایی قوڕەیشەکان خەفەتی زۆر دای‌گرتن، ئەبوجەهلی برازای ووتی: خەفەت مەخۆن، من خۆم ئەزانم پیاوێکی خاوەن فیزە و خـۆی بـە گـەورە دائـەنێ، مـن ئەڕۆم و ئەی‌گێڕمەوە بۆلاتان، ئاماژەیشمان بۆ ئەکا چ کارێ لـە دژی موحەممەد ساز بدرێ.

ئەبو جەهل چوو بۆلای کۆشکی وەلید، بە خەفەتەوە دانیشت وەلید بە ئەبوجـەهلی ووت: بۆ خەفەتباری، ئەبوجەهل ویستی هەڵیکێشێ و هانی بدا و، ووتی: چۆن خەفەتبار نـەبم؟ ئەوەیـە قوڕەیشی‌یەکان. ئەیانەوێ پارە و داراییت بۆ کۆبکەنەوە و ئـەڵێن: بۆیـە تـۆ نامـە و بەرنامـەی موحەممەدت لاپەسەندە، هەتا پلە و پایەت بداتێ و، دارایی و خواردەمەنیت دەست بکـەوێ و، دووایی وەلید ڕقی هەڵسا و، ووتی: من پێویستم بـە دارایـی و پلـەو پایـەی موحەممـەد نی‌یـە، کەواتە هەستە با بچـین بـۆلای کـۆڕ و کۆبوونـەوەی قوڕەیشـی‌یەکان، ئـەبو جـەهل و وەلیـد چوونەوە بۆلایان و ئەوانیش زۆر خۆشحاڵبون، وەلید ووتی: ئەی هۆزی قوڕەیش ئێوە ئەتانەوێ بڵێن: موحەممەد شێتە، ئایا ئێوە موحەمەدتان بە ترسنۆك زانیوە و بینیوە؟ ئێـوە ئـەڵێن موحەممـەد شاعیرە، ئایا ئێوە بینیوتانە موحەممەد جارێ لـە جاران تاکە شیعرێ دابنێ؟ ئێوە ئـەڵێن موحەممـەد درۆزنە، ئایا ئێوە هەرگیز موحەممەدتان بینیوە درۆ بکات؟ ئێوە ئەڵێن موحەممەد پۆشە ویـژە، ئایـا ئێوە موحەممەدتان بینیوە پۆشەویژی؟

دوایی هەموویان بە تێکڕایی ووتیان: خودا ئەزانێ ئەوانە لە موحەممەدەوە نەبینراون، دووایی ووتیان: ئەی عەبدو شەمس، تۆ چ شتێ دائەنێی ئێمە بیکەین لە دژی موحەممەد، وەلید بە درێژی بیری کردەوە لە پیلانێ بڵاوی بکەنەوە لە ناو عەرەبەکاندا، لە پاشانا وەلید ڕووی گرژ بوو ڕوومەتی تێك چوو، تەوێڵی لووچی تێکەوت، ووتی: ئەی دانیشتووان، بە بیری من موحەممەدد جادوگەرە، ئەوەتە ژن و مێرد لەیەك ئەبچڕێ و، باوك و کوڕ لە یەك ئەترازێنێ، دووایی قوڕەیشی‌یەکان هاواریان کرد و ووتیان: مەرحەبابێ لە تۆ ئەی عەبدوشەمس، دانیشتووان بە خۆشی‌یەوە چوونە دەرەوە، ئەوەی وەلید ووتبووی بڵاویان کردەوە، ئەیان ووت: موحەممەد جادوگەرە، بەو بۆنەوە پێغەمەر تووشی خەفەت بوو بەهۆی ئەو بوختانەوە ئەوان هەڵیان ئەبەست، بە خەفەتەوە چوویەوە بۆ جێگەی خۆی، خودای مەزن دڵخۆشی دایەوە و فەرمووی:

ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْتُ لَهُۥ مَالًا
مَّمْدُودًا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودًا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمْهِيدًا ﴿١٤﴾ ثُمَّ يَطْمَعُ
أَنْ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّآ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ لِءَايَٰتِنَا عَنِيدًا ﴿١٦﴾ سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا ﴿١٧﴾
إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾ فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ
﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ وَٱسْتَكْبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ
يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ ﴿٢٥﴾ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ
مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبْقِى وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ ﴿٢٩﴾ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ
﴿٣٠﴾ وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةً ۙ وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً
لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيَسْتَيْقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِيمَٰنًا ۙ
وَلَا يَرْتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۙ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ
وَٱلْكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى
مَن يَشَآءُ ۚ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ۚ وَمَا هِىَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ ﴿٣١﴾

﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا وَجَعَلْتُ لَهُ مَالًا مَّمْدُودًا وَبَنِينَ شُهُودًا وَمَهَّدتُّ لَهُ تَمْهِيدًا﴾ تـۆ واز لـە من و کەسێ بهێنە من بە تەنها بەبێ دارایی و منالّ و یاریدەر درووستم کردووە، دارایی زۆر و چـەند کـورِم دابوویـە، لـە هـەموو کـۆڕ و کۆمـەڵێ ئامـادەبوون لـە لایـی و، خـۆی پێـوە هەڵئەکێشان و، دارایی و پلەو پایەیان تەمەنی درێژ و گوزەرانی خۆشم بۆ ڕاخستبوو بە جـۆرێ ڕاخستنێ ژمارەی دارایی خۆی نەئەزانی.

﴿ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ كَلَّا إِنَّهُ كَانَ لِآيَاتِنَا عَنِيدًا سَأُرْهِقُهُ صَعُودًا﴾ لە پاشانا ئەو کەسە بە ئومێدی ئەوەیە من دارایی و پلەو پایەی زۆرتر لـەوەی داومەتێ بۆ زۆرتر بکەم، مـن بـۆی زۆر ناکـەم و ئەو کارەی لـەگەڵ ناکەم، دووایی سامانی وەلید نەختە نەختە کەم بوویەوە و کوڕەکانی بۆ نەما هەتا خۆی لـە ناچوو. بە ڕاستی ئەو کەسە دوژمنی تۆیە و، بڕوای بـە ئایەتـەکانی نامـەی ئێمـە نییە، دووایی من ئەو کەسە بە سزایەکی سەخت دائەپۆشم و بـەوی ئـەچێژم بـارێکی گـران و ناهەموار لـە ڕۆژی دووایدا. زانایان ئەڵێن: (صَعُودًا) کێوێکە لـە دۆزەخدا.

﴿إِنَّهُ فَكَّرَ وَقَدَّرَ فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ﴾ بە ڕاستی ئەو کەسە بیری ئەکردەوە لـە دەروونی خۆیا و، دیاری و ئامادە بکـا کـارێ لـە دژی موحەممـەد و بـڵاوی بکەنـەوە بـە نـاو دانیشتوواندا، دووایی بێبەش بێ لـە میهرەبانی خودا چۆن بیرێکی خراپی کـردەوە بەرانبـەر بـە موحەممەد بکرێ، لـە پاشانا بێبەشبێ لـە بەزەیی خودا چ بیرێکی خراپی ئامـادەکردبوو لـە دژی موحەممەد.

﴿ثُمَّ نَظَرَ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ثُمَّ أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ﴾ لـە پاشـانا ئـەو کەسـە تەماشـای دانیشـتووانی بێباوەڕانی قورەیشـییەکانی کـرد، هـەتا بـۆی دەرکـەوێ تـا چ ئەندازەیـە ئامـادەن بـۆ پـوچ کردنەوەی قورئان. لـە پاشانا ڕووی خۆی گرژکرد و، وەك کەسێ بیر لـە شتی بکاتەوە، زۆرتـر ڕووی خۆی تێکدا، لـە پاشانا وازی لـە ڕاستی و باوەڕ هێنان هێنا، خۆی بە گەورە دانا لـە ئاستی باوەڕهێنان.

﴿فَقَالَ إِنْ هَذَا إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ إِنْ هَذَا إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ﴾ دووایی ئەو کەسە ووتـی: ئـەو شـتەی موحەممەد ئەیڵێ هیچ شتی نییە مەگەر جادوویەکی گێڕراوەیەو موحەممەد فێری بووە لـە جگەی خۆیەوە، هیچ شتێ نییە مەگەر گفتوگۆی ئادەمیزاد بۆ خۆی هەڵبژاردووە، جادووگەران فـێری ئەویان کردووە.

﴿سَأُصْلِيهِ سَقَرَ وَمَا أَدْرَاكَ مَا سَقَرُ لَا تُبْقِي وَلَا تَـذَرُ لَوَّاحَـةٌ لِّلْبَشَـرِ عَلَيْـهَا تِسْـعَةَ عَشَـرَ﴾ لـە ڕۆژژی دووایدا من ئەو کەسە ئەخەمە دۆزەخ و، چ شتێکی سەرسوڕێنەرە بـە تـۆی ڕایگەیـەنێ سەقەر چ شتێکە؟ هیچ شتێ بە جی نایەڵێ بکەوێتە ناوی و واز لـە هیچ شـتێ نایـەرێ هـەتا لـە ناوی نەبا، ئاگری ئەو دۆزەخە پێسی ئەو کەسە ڕەش ئەکاتەوە و، ئەیسوتێنێ، بەسەر دۆزەخەوە

دانراوە نۆزدە فریشتە، یا نۆزدە تاقم، کاروباری دۆزەخ ئەبەن بە ڕێوە، بیٚفەرمانی خودا ناکەن، بەزەیی‌یان بە کەسا نایەتەوە.

﴿وَمَا جَعَلْنَا أَصْحَابَ النَّارِ إِلَّا مَلَائِكَةً﴾ وە ئێمە نەمان کردووە بـە پاسـەوان و یـاری ئـاگری دۆزەخ جگەی جگەی فریشتەکان و، لـە ڕەگەزی ئادەمیزاد نین، هیچ شتێ توانای بەسەریانا نیە جگەی خودا بە تەنها، ئەو فریشتانە توند و تیژن، بە زەییان بە کەسا نایەتەوە، دۆست و خزمـی کـەس نین.

پرسیار: مەبەست لـە باسی ژمارەی پاسەوانانی دۆزەخ بەو ئەندازەیە چ شـتێکە کـە بووەتـە جێگەی گاڵتەی بێباوەڕان و، کردنەوەی دەرگای لـە ڕێگە لادانی بێباوەڕان؟

وەلام: ﴿وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا﴾ وە ئێمە ژمارەی ئەو فریشتانەمان دانـەناوە بە نۆزدە کەسیا بە نۆزدە تاقم بۆ هیچ مەبەستێ مەگـەر بـۆ تاقی‌کردنـەوەی کەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە، دەربکەوێ بۆ دانیشتووان کە بێباوەڕان گاڵتە بە کەمی ئەو ژمارەیە ئەکـەن و، گاڵتە بە قورئان و بە موحەممەد ئەکەن. ئەوەبوو کاتێ ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە، ئـەبو جـەهل بە قورەیشی‌یەکانی ووت: دایکتان بۆ ئێوە نەمێنێ و بۆتان بگرین بیستوومە کوڕی ئەبوکەبشـە، یانێ موحەممەد، هەواڵی داوە بە ئێوە کە پاسەوانانی دۆزەخ نـۆزدە نەفـەرن. ئێـوەە بـەم ژمـارە زۆرەوە، بەم پاڵەوانی‌یەوە هەتانە، ناتوانن دە کەستان هەڵمەتی‌یان بدەنێ و ئـەو فریشـتانە پـەك بخەن، دووایی ئەبولئەشەوی کـوڕی کـەلدە ووتـی: (١٠) کەسـیان بـەلای ڕاستمەوە و، نـۆ کەسیان بەلای چەپم ئەگرم و ئێو بچن بۆ بەهەشت.

﴿لِيَسْتَيْقِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ﴾ ئەو ژمارەیە لەبـەر ئەوەیـە کەسـانێکی ئـەوتۆ نامـەیان پـێ بەخشراوە باوەڕی بێگومان پەیدا بکەن بە پێغەمەرایەتی موحەممەد و بە ڕاستی قورئان کاتێ بۆیان دەرکەوت، نامەکانی ئەوان بەو جۆرەیە قورئان ئەیلێ:

﴿وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَانًا وَلَا يَرْتَابَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَالْمُؤْمِنُونَ﴾ وە بـۆ ئـەوەیش کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە، باوەڕهێنانیـان زۆر تربـێ و، کەسـانێکی ئـەوتۆ نامـەیان پـێ بەخشراوە، وەك عەبدوڵای کوڕی سەلام و هاوڕێکانی و، باوەڕداران گومانیان نەمێنێ بە ڕاستی قورئان.

﴿وَلِيَقُولَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْكَافِرُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا﴾ وە لـەبـەر ئـەوەیش کەسانێکی ئەوتۆ نەخۆشی و دووڕوویی لـە دڵیانایە و، بێ باوەڕان بڵێـن: خـودا مەبەسـتی بـەو وێنە چ شتێکە ئەڵێ:پاسەوانی دۆزەخ نۆزدە نەفەرن؟

﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾ هەر بەو جۆرەی تاقمێ لـە ڕێگـەی ڕاسـت لایانداوە لە بارەی ژمارەی نۆزدە نەفەر و، تاقمێ تر باوەڕیان هێناوە، هەر بەو جۆرە خـودا لـە ڕێگەی ڕاست لائەدا هەرکەسێ ئارەزۆی بکا و، ڕێگەی ڕاست شارەزای کەسێ ئەکا ئـارەزۆی بفەرموێ.

﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَى لِلْبَشَرِ﴾ وە بە ئەندازەی سوپای پەروەدگاری تۆ نازانێ مەگەر هەر پەروەدگار، سوپای پەروەدگاری تۆ هەر بە تەنها بریتی نییە لە نۆزدە نەفەر لە پاسەوانانی دۆزەخ و جگەی پاسەوانان. بەڵکو هەموو بوونەوەران فەرمانبەرداری ئەون، بە گیاندارانی کێوی و جرِ و جانەوەر و باڵندە و با و بوومەلەرزە و لافاو و جگەی ئەوانیش و، دۆزەخ و باسکردنی دۆزەخ، بۆ ئەوەیە ئامۆژگاری ئادەمیزادی پێ بکرێ و، بە دۆززەخ بیانترسێنێ، بۆ ئەوە تەمێ وەربگرن.

كَلَّا
وَٱلۡقَمَرِ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّيۡلِ إِذۡ أَدۡبَرَ ﴿٣٣﴾ وَٱلصُّبۡحِ إِذَآ أَسۡفَرَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهَا لَإِحۡدَى
ٱلۡكُبَرِ ﴿٣٥﴾ نَذِيرٗا لِّلۡبَشَرِ ﴿٣٦﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَتَقَدَّمَ أَوۡ يَتَأَخَّرَ ﴿٣٧﴾ كُلُّ
نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّآ أَصۡحَٰبَ ٱلۡيَمِينِ ﴿٣٩﴾ فِي جَنَّٰتٖ يَتَسَآءَلُونَ
﴿٤٠﴾ عَنِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٤١﴾ مَا سَلَكَكُمۡ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُواْ لَمۡ نَكُ مِنَ
ٱلۡمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمۡ نَكُ نُطۡعِمُ ٱلۡمِسۡكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ
ٱلۡخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلۡيَقِينُ ﴿٤٧﴾
فَمَا تَنفَعُهُمۡ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴿٤٨﴾ فَمَا لَهُمۡ عَنِ ٱلتَّذۡكِرَةِ مُعۡرِضِينَ
﴿٤٩﴾ كَأَنَّهُمۡ حُمُرٞ مُّسۡتَنفِرَةٞ ﴿٥٠﴾ فَرَّتۡ مِن قَسۡوَرَةِۭ ﴿٥١﴾ بَلۡ يُرِيدُ
كُلُّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ أَن يُؤۡتَىٰ صُحُفٗا مُّنَشَّرَةٗ ﴿٥٢﴾ كَلَّاۖ بَل لَّا يَخَافُونَ
ٱلۡأٓخِرَةَ ﴿٥٣﴾ كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذۡكِرَةٞ ﴿٥٤﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿٥٥﴾
وَمَا يَذۡكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ هُوَ أَهۡلُ ٱلتَّقۡوَىٰ وَأَهۡلُ ٱلۡمَغۡفِرَةِ ﴿٥٦﴾

﴿كَلَّا وَالْقَمَرِ وَاللَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ وَالصُّبْحِ إِذَا أَسْفَرَ إِنَّهَا لَإِحْدَى الْكُبَرِ﴾ زۆر ڕاستە بێباوەڕان ئامۆژگاری وەرناگرن و بیر ناکەنەوە، بە گومانی ئەوان نابێ بتوانن بەسەر پاسەوانانی دۆزەخدا سەربکەون، سوێند ئەخۆم بە مانگ و بەسودی زۆری و، بە شەو ئەڕوا و کاتێ ئەڕوا و تاریکی نامێنێ و بە بەیانی کاتێ هەڵدیێ ڕووناکی پەخش ئەکاتەوە. بە ڕاستی دۆزەخ یەکێکە لە گەورەترین بەلاّ و سزا.

﴿نَذِيرًا لِّلْبَشَرِ لِمَن شَاءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ﴾ ئاگری دۆزەخ ترسێنەرە لە بۆ ئادەمیزاد، لە بۆ کەسێ لە ئێوە ئارەزۆی هەبێ کە بەرەوپێش بڕوا بۆلای چاکە و، وەرگری بۆخۆی، یا بۆ کەسێ دووای بکەوێ لە چاکە و، بەرەو خراپەکردن بڕوا، خۆتان سەربەستن و ئازادن لە هەڵبژاردنی چاکە و خراپە.

﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ إِلَّا أَصْحَابَ الْيَمِينِ فِي جَنَّاتٍ﴾ هەموو کەسێ لە گرەوەی شتێکا کردوویەتی گیراوەبە فەرمانی خودا و گیرۆدەی کردەوەی خۆیەتی مەگەر ئەو کەسە نامەی کرداریان دراوە بە دەستی ڕاستیانەوە و، بە نیازی پاکەوە باوەڕیان هێناوە و، کردەوەی چاکیان کردەوە، ئەو کەسانە بەرەلائەکرێن و لە بەهەشتان.

﴿يَتَسَاءَلُونَ عَنِ الْمُجْرِمِينَ مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ﴾ ئەو کەسانەی لە بەهشتان هەندێکیان پرسیار لە هەندێ تریان ئەکەن لە بارەی ئەو تاوانبارانە لە جیهاندا ئێمە ئەو پەڕی ئازارمان ئەچێشت بە دەستیانەوە، لە چ جێگەیەکن؟ خودا ئەفەرموێ لە دۆزەخدان، بە تاوانباران ئەبێژرێ: چ شتێ ئێوەی خستە ناو دۆزەخ؟ تاوانباران بە خەفەتەوە ئەڵێن: ئێمە لە جیهاندا نوێژمان نەئەکرد، هەتا نوێژ ئێمە بگێڕێتەوە لە خراپە و، خواردەمەنیمان نەئەبەخشی بە هەژاران.

﴿وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ الْخَائِضِينَ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ حَتَّى أَتَانَا الْيَقِينُ﴾ وە ئێمە تێکەلاوی ئەوانەمان ئەکرد خاوەنی کاری پوچ بوون، هاوبەشیمان ئەکردن لە درۆ و بوختاندا و، ڕۆژی پاداشتمان بە درۆ ئەخستەوە و، بڕوامان بە بوونی نەبوو، هەتا مردن هات بۆلای ئێمە و مردین، گومانمان لە هاتنی ئەو ڕۆژە نەما.

﴿فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَاعَةُ الشَّافِعِينَ﴾ دووایی سوود نابەخشێ بەو تاونابارانە پاڕانەوەی پیاوچاکان لە پێغەمەران و جگەی پێغەمەران، چونکە پاڕانەوەی ئەوان تایبەتە بۆ باوەڕداران.

﴿فَمَا لَهُمْ عَنِ التَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ﴾ دووایی چ شتێکە بۆ ئەو تاوانبارانە وازیان هێناوە لە ئامۆژگاریکردن و ڕائەکەن لە دەستی، ئەو تاوانبارانە وێنەی کەری کێوبن، ڕابکەن لە دەستی شێر و ڕاوچی.

﴿بَلْ يُرِيدُ كُلُّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَى صُحُفًا مُّنَشَّرَةً﴾ بەڵکو هەموو یەکێ لە تاوانباران ئەیانەوێ نامەیەکی کراوەی نەپێچراوەیان بدرێتێ و خۆیان چاویان پێ بکەوێ و بۆیان بخوێنرێتەوە. ئەو ئایەتە لەوە هاتووە، قورەیشییەکان ئەیان ووت بە پێغەمەرەکانی ئێمە کاتێ باوەڕت پێ ئەهێنن، بۆ هەر یەکە لە ئێمە نامەیە بێتە خوارەوە بڵێ: بۆ فلان کەسی فلان کەس، تۆ باوەڕ بە موحەممەد بهێنە.

﴿كَلَّا بَل لَّا يَخَافُونَ الْآخِرَةَ كَلَّا إِنَّهُ تَذْكِرَةٌ فَمَن شَاءَ ذَكَرَهُ﴾ بێگومان ئەو جۆرە نامانـە نایـەن بۆلای ئەوان. بەڵكو بۆیە ئەوان داوای ئەو جـۆرە نامانـە ئەكـەن لـە ڕۆژی دووایـی ناترسـن، بێگومان بە ڕاستی قورئان ئامۆژگـاری خودایـە بـۆلای بـەندەكانی خـۆی، دووایـی هەركەسـێ ئارەزۆی هەیە باسی بكا و سوودی لێوەربگرێ بە فەرمانەكانی و بە ئامۆژگاری‌یەكانی، قورئـان گفتوگۆی جادوگەر و شایەرنی‌یە.

﴿وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ هُوَ أَهْلُ التَّقْوَى وَأَهْلُ الْمَغْفِرَةِ﴾ وە تاوانباران باس لـە قورئـان ناكەن و ئامۆژگاری وەرناگرن مەگەر خودا ئارەزۆی ئامۆژگـاری وەرگرتـن بكـا، هـەر خـودا شایستەی ئەوەیە بەندەكانی خۆی بپارێزێ لــە سـزا و، هـەر خـودا خـاوەنی لێخۆشـبوونە لـە بەندەكانی خۆی.

پرسیار: خودای مەزن فەرمووی: ﴿فَمَن شَاءَ ذَكَرَهُ﴾ ئـەوەیش ئـەوە ئەگەیـەنێ ئـادەمیزاد سەربەستە، جاری دووهەم ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ﴾ ئەمـەیش وا ئەگەیـەنێ ئادەمیزاد سەربەست نی‌یە؟

وەڵام: جاری یەكەم مەبەست ئەوەیە: خودا واز لـە ئادەمیزاد ئەهێنێ و، خۆی سەربەستە بـۆ باوەڕهێنان و باوەڕ نەهێنان. مەبەست لـە جاری دووهەم ئەوەیە ئەگەر خودا وویستی ئـادەمیزاد یەكێكیان بكا ئەبێ بكرێ.

# ﴿ سورەتی ئەلقیامە ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٤٠) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

لَا أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ ﴿١﴾ وَلَا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾ أَيَحْسَبُ
الْإِنسَانُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُ ﴿٣﴾ بَلَىٰ قَادِرِينَ عَلَىٰ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُ ﴿٤﴾ بَلْ
يُرِيدُ الْإِنسَانُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُ ﴿٥﴾ يَسْأَلُ أَيَّانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ ﴿٦﴾ فَإِذَا بَرِقَ الْبَصَرُ
﴿٧﴾ وَخَسَفَ الْقَمَرُ ﴿٨﴾ وَجُمِعَ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ ﴿٩﴾ يَقُولُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ
أَيْنَ الْمَفَرُّ ﴿١٠﴾ كَلَّا لَا وَزَرَ ﴿١١﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمُسْتَقَرُّ ﴿١٢﴾ يُنَبَّأُ الْإِنسَانُ
يَوْمَئِذٍ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ﴿١٣﴾ بَلِ الْإِنسَانُ عَلَىٰ نَفْسِهِ بَصِيرَةٌ ﴿١٤﴾ وَلَوْ أَلْقَىٰ
مَعَاذِيرَهُ ﴿١٥﴾ لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ
وَقُرْآنَهُ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُ ﴿١٩﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿لَا أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ وَلَا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ﴾ من بە ڕاستی سوێند ئەخۆم بە ڕۆژی دوایی، بە ڕۆژێ ئادەمیزادەکان لە گۆڕەکانیان دێنە دەرێ و، سوێند ئەخۆم بەو کەسەی سەرزەنشتی خۆی ئەکا لە سەر ئەو گوناهانەی کردوویەتی و، لەسەر ئەوەی کەمتەرخەمی کردووە لە پەرستنی خودادا و، هەست بە پەشیمان بوونەوە ئەکا و، خەفەت ئەخوات لەسەر تەمەڵی خۆی بۆ نەکردنی چاکەی زۆر.

زۆربەی هەرەزۆری زانایان پیتی (لا) لە ڕستەی ﴿لَا أُقْسِمُ﴾ لە هەردوو ئایەتەکەدا بە زیادە ئەژمێرن و، هێنراوە بۆ پتەوکردنی سوێندەکە، هەندێ لە زانایان ئەڵێن: پیتی (لا) بۆ نەفیە و زیاد نیە، چونکە ئەو مەبەستانە، ئەوەندە ئاشکران پێویستییان بە سوێند خواردن نییە، هەندێ تر لە زانایان ئەڵێن: پیتی (لا) لە ئایەتی یەکەمدا زیادە، لە ئایەتی دووەمدا بۆ نەفییە، چونکە نەفسی وا هەیە باوەڕی بە خودا نییە. کەواتە شایستەی ئەوە نییەسوێندی پێ بخورێ.

بەهەرجۆرێ بێ، وولامی سوێندەکان ناوی نەبراوە، یانێ بە ڕاستی من سوێند ئەخۆم: بە ڕۆژی دوایی و، بەو کەسەی لۆمەی خۆی ئەکا، ئێوە دوای مردنتان زیندوو ئەکرێنەوە لە ڕۆژی دوواییدا.

﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَلَّن نَجْمَعَ عِظَامَهُ  بَلَى قَادِرِينَ عَلَى أَن نُسَوِّيَ بَنَانَهُ﴾ ئایا ئادەمیزادی بێباوەڕ گومان ئەبا ئێمە ئێسکەکانی کۆ ناکەینەوە، دووای ڕزان و پارچەپارچەبوونیان؟ بەڵێ: ئێمە ئەو ئێسکانە کۆ ئەکەینەوە، توانامان بەسەریا هەیە کە ئێمە کۆبکەینەوە پەنجەکانی، بە هەموو ئێسك و دەمارە بچووکەکانی پەنجەکانیەوە. هەریەکەیان لە جێگەی خۆیانا دابنێینەوە، ئەبێ بزانرێ ئێسکی پەنجەی هەردوو دەست ژمارەیان (٣٠) ئێسکە و، ژمارەی ئێسکی هەردوو پێ (٢٨) ئێسکن.

باسکردنی پەنجەکانی بە تایبەتی لە ناو هەموو ئەندامەکانی ئادەمیزاددا، ئاماژە بۆ ئەوە کە نیشانەی پەنجەکانی هەموو کەسێ لە ئادەمیزاد، لە درووست بوونیانەوە هەتا مردنیان لە یەك جیاوازن لەگەڵ یەکتری، چاڵ و چۆڵی هێڵی پەنجەکان لە یەکتری ناچن، بۆیە بۆ هەندێ کاری پێویست وێنەی پەنجەکان ئەگرن. هەروەها سوودی پەنجەکان نایەنە ژمارە، وەك نووسین و ڕاکێشان وەرگرتن و شتی تر.

﴿بَلْ يُرِيدُ الْإِنسَانُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُ  يَسْأَلُ أَيَّانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ﴾ بەڵکو ئادەمیزادی تاوانبار ئەیەوێ درێژەبدا بە گوناه و تاوانی خۆی هەتا کۆتایی تەمەنی، خراپە پێش خۆی ئەخا و پەشیمان بوونەوە دووا ئەخا، بۆیە ئەپرسێ چ کاتێ ڕۆژی دوایی پەیدا ئەبێ. هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەوەبوو: (عەدی کوڕی ڕەبیعە) لای پێغەمەر دانیشتبو بە پێغەمەری ووت باسی: ڕۆژی دووایم بۆ بکە، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ باسی هاتنی ڕۆژی دوایی بۆ کرد، عەدی ووتی: سوێندم بە خودا ئەگەر بە چاوی خۆم ببینم بڕوای پێ ناکەم، چۆن ئەگونجێ ئەم ئێسکانە کۆ بکرێنەوە؟.

﴿فَإِذَا بَرِقَ الْبَصَرُ وَخَسَفَ الْقَمَرُ وَجُمِعَ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ يَقُولُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ الْمَفَرُّ﴾ دووایی خودا وولامی ئەو پیاوە تاوانبارە ئەداتەوە و ئەفەرموێ: کاتێ چاو تێك چوو و سەرگەردان بوو هیچ شتێکی نەبینی و، مانگ ڕووناکی نەما و، خۆر و مانگ دایان لە یەکتری و جیهان کاول بوو، پەیڕەو و دەستووری نەما. ئادەمیزاد ئەو ڕۆژە ئەڵێ: لە چ ڕێگەیەکەوە ڕاکردن پەیدا ئەبێ؟ ئەم ڕۆژە زۆر ترسناکە.

﴿كَلَّا لَا وَزَرَ  إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمُسْتَقَرُّ  يُنَبَّأُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ﴾ هیچ پەناگا و ڕێگەی هەڵهاتن نیيە، لەو ڕۆژەدا هەر بۆلای پەروەدگاری تۆ جێگەی گەڕانەوە و پەنا هەیە، بۆلای بەهەشت یا بۆلای دۆزەخ پەنای تر نیيە، لەو ڕۆژەدا هەواڵ ئەدرێ بە ئادەمیزاد بە شتێ لە پێشا کردوویەتی لە کاری چاك و خراپ و، بە شتێ وازی لێهێناوە لەو شتانەی پێویست کرابوون لە سەری.

﴿بَلِ الْإِنسَانُ عَلَى نَفْسِهِ بَصِيرَةٌ وَلَوْ أَلْقَى مَعَاذِيرَهُ﴾ بەڵکو بە ڕاستی ئادەمیزاد ئاگادارە و ئەزانێ بە شتێ کردوویەتی و بە شتێ نەی کردووە، پێویستی بەوەنییە کەس هەواڵی پێبدا بەو شتانە، هەرچەندە چەندین بڕوبیانوو بۆ خۆی بێنێتەوە. ئەندامەکانی هەموویان شایەت ئەدەن لەسەر کردارەکانی.

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەسەر هاتنی سروش بۆلای لە سەرەتاوە، بەهۆی جبرەئیلەوە، زۆری پەلە ئەکرد بۆ وەرگرتنی پەیام و سروش و لەبەرکردنیءن دەم و زمانی خۆی ئەخستە پەلە بۆ وەرگرتنی، نەوەك شتێکی لەکیس بچێ، خودای خاوەن میهرەبان ووتی:

﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ﴾ تۆ بۆ خوێندنی قورئان زمانت مەجوولێنە؛ لەبەر ئەوەی پەلە بکەی بۆ لەبەرکردنی قورئان و، دووپات بکەیتەوە شتێ جبرەئیل ئەیهێنێ بۆلای تۆ، لە ترسی ئەوەی هەندێکت بۆ لەبەر نەکرێ. بە ڕاستی لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوەی ئەو قورئانە لە دڵی تۆدا و، دانانی خوێندنی قورئان لەسەر زمانی تۆدا.

﴿فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُ﴾ دووایی کاتێ ئێمە بەهۆی زمانی جبرەئیلەوە قورئانمان خوێندەوە بەسەر تۆدا و، کۆتایی پێهات، دوایی تۆ دەست بکە بە خوێندنەوەی قورئان و، مەترسە ئەو قورئانەت لە بیر ناچێتەوە، لە پاشانا لەسەر ئێمەیە ڕوونکردنەوەی مانا و فەرمان و مەبەستەکانی.

كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ ﴿٢٠﴾ وَتَذَرُونَ ٱلْآخِرَةَ ﴿٢١﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾
إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ ﴿٢٤﴾ تَظُنُّ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ ﴿٢٥﴾
كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِيَ ﴿٢٦﴾ وَقِيلَ مَنْۜ رَاقٍ ﴿٢٧﴾ وَظَنَّ أَنَّهُ ٱلْفِرَاقُ ﴿٢٨﴾ وَٱلْتَفَّتِ
ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ ﴿٢٩﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمَسَاقُ ﴿٣٠﴾ فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ
﴿٣١﴾ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٣٢﴾ ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ يَتَمَطَّىٰٓ ﴿٣٣﴾ أَوْلَىٰ لَكَ
فَأَوْلَىٰ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰٓ ﴿٣٥﴾ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾
أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ ﴿٣٧﴾ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ فَجَعَلَ مِنْهُ
ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ﴿٣٩﴾ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧيَ ٱلْمَوْتَىٰ ﴿٤٠﴾

﴿كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ الْعَاجِلَةَ وَتَذَرُونَ الْآخِرَةَ﴾ زۆر ڕاستە ئێوە ئادەمیزاد جیهانی بڕاوەتان خۆش ئەوێ و، کار بۆ ئارەزۆی جیهان ئەکەن و، واز لە دوارۆژی نەبڕاوە دێنن و، ئێشی بۆ ناکەن کە سوودی تێدایە بۆ خۆتان.

﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ لە ڕۆژی دووایدا چەن ڕوومەتێ هەن جوان و نەرم و خۆشحاڵ، تەماشای پەروەدگاری خۆیان ئەکەن بە چاوی سەر، بەبێ دانانی ماوەیە بۆ ئەو تەماشایە و بەبێ چۆنیەتی و دیاری‌کردنی لایەك، ئەو کەسانە بریتین لە پێغەمەران و پیاوچاکان و دۆستانی خودا و باوەڕداران.

هەندی لە زانایان ئەڵێن: خودا لە هەردوو جیهاندا بە چاوی سەر نابینرێ، ووشەی ﴿نَاظِرَةٌ﴾ بەلای ئەوانەوە بە مانا چاوەڕوانکردنی فەرمان و پاداشتی پەروەدگارن و، ووڵامی ئەو زانایانەیان داوەتەوە بەوەی کە مادەی ﴿نَظِرَةٌ﴾ لەگەڵ پیتی ﴿ إلی﴾دا بە مانا تەماشا کردنە، بە پێی پیتی ﴿ إلی﴾ بە مانا چاوەڕوان کردنە ﴿نظر الی شيء﴾ ﴿نظَرَ شيئاً﴾ زۆر جیاوازن، هەروەها بینینی خودا شتێکی گونجاوە بە گوێرەی ئەقڵ و خراپەیە ڕوونادا، بەبێ دیاری کردنی ماوە لە نێوان تەماشاکەران و خودای مەزندا.

﴿وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ تَظُنُّ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ﴾ وە چەندین ڕوومەت هەن لە ڕۆژی دووایدا ڕەشە و گرژ هەڵگەڕاوە و خەفەتبار، گومان ئەبەن کە ئەکرێ لەگەڵ ئەوان کارێکی نالەباری وا پشتیان بشکێنێ، ئەو کەسانە بریتین لە بێ باوەڕان و دوژمنانی خودای مەزن.

﴿كَلَّا إِذَا بَلَغَتْ التَّرَاقِيَ وَقِيلَ مَنْ رَاقٍ وَظَنَّ أَنَّهُ الْفِرَاقُ﴾ ڕاست و بێگومانە: ئەی تاوانبار: تۆ واز لە تاوان و جیهانی کەم دەوام بهێنە، بیر لەو لەو مردنە بکەرەوە و کە خۆشی و ئاوات ئەکوژێ، کاتێ گیان ئەگاتە قوڕگ و نزیکە لە لەش دەرچێ و، ئەو کاتە لە دوای دەستەڵات نەمان لە لایەن خێزانەکەتانەوە ئەبێژرێ، ئایا نوشتەنوسێ نیە نوشتەیەکی بۆ بنووسن یا پزیشکێ نی‌یە دەرمانێکی بداتێ، بڕوای بێگومان پەیدا ئەکا، بە ڕاستی لە جیهان جوێ ئەبێتەوە و، نوشتە و دەرمان سودێ بە تۆ نابەخشن.

﴿وَالْتَفَّتِ السَّاقُ بِالسَّاقِ إِلَى رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمَسَاقُ﴾ وەڕانێکی ئەو کەسەی لە گیاندا نایە ئەلکێ بە ڕانەکەی تریەوە و، توانای جوڵاندنیانی نی‌یە لەبەر سەختی ئەو کاتە و دەردی گرانی، ئەو کەسە لەو ڕۆژەدا ڕەوانەی لای فەرمانی پەروەدگاری تۆ ئەکرێ، یا بۆلای بەهەشت یا بۆلای دۆزەخ.

﴿فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّى وَلَكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّى ثُمَّ ذَهَبَ إِلَى أَهْلِهِ يَتَمَطَّى﴾ دووایی ئەو تاوانبارە بڕوای بە پێغەمەر و بە قورئان نەهێناوە و، زەکاتی دارایی خۆی نەداوە، نوێژی نەکرد و، بەڵام قورئان و پێغەمەری بە درۆخستوونەتەوە و، وازی لە باوەڕهێنان نەهێناوە، لە پاشانا ئەڕۆیشتەوە بۆلای خێزانەکەی بە فیز و بە دەمارەوە و، خۆی بە گەورە ئەزانێ.

﴿أَوْلَى لَكَ فَأَوْلَى ثُمَّ أَوْلَى لَكَ فَأَوْلَى﴾ هاوار و نەمان بۆ تۆ ئەی تاوانبار، دووایی هاوار بۆ تۆ، لە پاشانا هاوار و سزای سەخت بۆ تۆ، دووایی هاوار و نەمان بۆ تۆ، چونکە باوەڕت بە زیندووبوونەوە نەبووە.

﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى﴾ ئایا ئادەمیزاد گومانی وایە کە وازی لێ‌ئەهێنرێ بەبێ ئەوەی داوای‌کردنی هیچ کارێکی لێ‌بکرێ و، زیندوو ناکرێتەوە و، پاداشتی کارەکانی وەرناگرێ.

﴿أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى﴾ ئایا ئەو ئادەمیزادە دڵۆپێ ئاوی بێزلێکراوە نەبووە لە تۆوی پیاوێکە ئەرێژرایە ناو منداڵدانی ژنێکەوە، لە پاشانا بووە بە پارچەیە خوێنی ڕەق، دووایی دروستی کردوە، دواتر کردوویەتی بە ئادەمیزادێکی ڕێك و پێك و ئەندامەکانی شیاوی یەکتری بوون.

﴿فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى﴾ دووایی خودا لەو ئادەمیزادە دوو تاقم منداڵ، نێر و مێ درووست کردووە.

﴿أَلَيْسَ ذَلِكَ بِقَادِرٍ عَلَى أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَى﴾ ئایا ئەو کەسەی ئەو ئادەمیزادەی بەو جۆرانە درووست کردووە توانای نی‌یە کە مردووان زیدوو بکاتەوە؟ بێگومان توانای هەیە و، ئاسانترە لای ئەو.

# ﴿ سورەتی ئەلئینسان ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن جگە ﴿وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ آثِمًا أَوْ كَفُورًا﴾ کە لە مەککە هاتووەتە خوارەوە، ئەوەکانی تری لە مەدینە هاتوونەتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: لە ئایەتی (٣٣) هەتا کۆتایی سورەتەکە لە مەککە هاتوونەتە خوارەوە، ئەوەکانی تری لە مەدینە هاتوونەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٣١) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

هَلْ أَتَىٰ عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا ﴿١﴾
إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا
بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾
إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَلَاسِلَا وَأَغْلَالًا وَسَعِيرًا ﴿٤﴾ إِنَّ
الْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ﴿٥﴾
عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا ﴿٦﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

خودای مەزن لە زۆر جێگەی قورئاندا ڕوونی کردووەتەوە کە ئادەمیزادی چۆن درووست کردووە، هەر لە یەکەم جارە و کە دڵۆپی ئاو بووە و، باسی بەسەرهاتی ئادەمیزادی کردووە، دووای لە دایکبوونی هەتا ڕۆژی دووایی و زیندووبوونەوەی و، چوونی بۆ بەهەشت یا بۆلای دۆزەخ، لەم سورەتەدا باسی ئەوە ئەفەرموێ، ئادەمیزاد بەر لەوەی پەیدابووبێ چۆن بووە، چ شتێ بووە؟ هەتا ئەو کاتەی بووە بە دڵۆپێ ئاو. دوای ئەوەیش بەرەبەرە چ شتێکی لێ پەیدا ئەبێ و چی بەسەردێ و ئەفەرموێ:

﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا﴾ بە ڕاستی ڕابردووە بەسەر ئادەمدا چەند بەشێکی دیاری لە کاتێکی وادا کۆتایی پێ نایە، ئەو ئادەمە شتێکی وانەبوو باسی کرابێ و، نەئەناسرا و نە ئەزانرا و چ شتێکە، مەبەست لەودا چی‌یە و، بە زۆر شتی جیاواز ناوی ئەبرا، زانایان ئەڵێن: ئادەم (٤٠) ساڵ خۆڵ بووە، (٤٠) ساڵ قوڕێکی ڕەشی بۆگەن بووە،

(٤٠) ساڵ خۆڵێکی ڕەق بووە، بە وێنەی گۆزەیـەکی سـوورکراوەن درووستبوونی ئـادەم بـە (١٢٠) ساڵ کۆتایی پێ هات. بەڵام ئادەمیزاد بەم جۆرەی ئێستایان، یەکەم جار دڵۆپێ ئاو بـوە لە پشتی باوکیا، دووایی چووەتە ناو منداڵدان بووە بە پارچەیـە خوێنـی ڕەق، دواتـر بـووە بـە پارچەیە گۆشت کە چووە بەسەر ئێسکدا، دووایی لـە دایك بووە و، بووە بەم ئادەمیزادە جـوان و ڕێك و پێکە. زانایان ئەڵێن: ئادەمیزاد لـەسەر ڕووی زەوی‌دا پەیدابووە لـە ماوەی پێنج هـەزار ملیۆن ساڵ لـەمەوبەر و، هەموو شتێکیش هەر خودا ئەیزانێ.

﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ﴾ بە ڕاستی ئێمە ئادەمیزادمان درووستکردووە لـە دڵۆپێ ئاوی ژن و پیاو، تێکەڵاو بە یەکتری ئەبن، ڕەگەزی زۆر جیاوازیان لێ پەیدا ئـەبێ، ئێمـە ئەمانەوێ تاقیان بکەینەوە، لە گرانی و هەرزانی‌دا، لـە بەجێـهێنانی فەرمانـەکانی ئێمـەدا. ئـەو فەرموودەی خودایە ئاماژە بۆ ئەوە ئەکا کە ئادەمیزاد لە ڕەگەزی خاکەوە گوێزراوەتەوە بـۆلای ڕەگەزی ئاو، لـە ئاوی‌پیاو و ژن چەن ئادەمیزادی جیاوازیان لێ پەیدا ئەبێ لە هەموو ڕوویێکـەوە لە لایەن ڕەوشت و ڕەنگ و ئەقڵ و زانست و لـەش و باڵایانەوە. یەکەم جار بێ بیر و هـۆش و بەراوردن.

﴿فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ دووایی ئەو شتانەی باسـکران ئێمـە ئـەو ئـادەمیزادە ئەکـەین بـە کەسێکی ئەوتۆ بتوانێ هەموو شتێ ببیستێ، هـەمو شـتێ ببینـێ و، بیانزانـێ و بـەکاریان بـهێنێ بۆخۆی، ئەو ئایەتە ئاماژە بۆ ئەوە ئەکا دووای چەن ڕۆژێ لـە منـاڵدانی دایکیـا گیـان ئـەکرێ بەبەریا، لـە تاریکی مناڵدانەوە بۆلای ڕوونـاکی جیـهان ئەگوێزرێتـە و ئـەبێ بـە ئـادەمیزادێکی تەواوی خاوەن گۆش و هۆش و خاوەن ئەقڵ.

﴿إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾ بە ڕاستی ئێمە ڕێگەی ڕاسـت و پوچمـان ڕوون کردووەتەوە بۆ ئادەمیزاد، دوایی ئەو ئادەمیزادە سوپاسی خـودا ئـەکا لـەسـەر ئـەوەی ڕێگـەی ڕاستم بۆ ڕوون کردووەتەوە و، باوەڕ بە ئێمە ئەهێنێ و بە تەنها ئێمە ئەپەرستێ، یا سوپاسی ئێمە ناکاوبێ فەرمانی ئێمە ئەکا و باوەڕ نایەرێ. ئەو ئایەتە ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئادەمیزاد لـە ڕەگـەزی ئاژەڵیەوە ئەگۆرێ بۆلای ژیانی ئادەمیزادێکی خاوەن ئەقڵ و خاوەن بیر.

﴿إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَلَاسِلَا وَأَغْلَالًا وَسَعِيرًا﴾ بە ڕاستی ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ بێ‌باوەڕان چەند پێونێ بۆ پێکانیان چەن زەنجیرێ بۆ دەستیان و ئاگری دۆزەخ بۆ سوتاندنی لـەشیان.

بوونەوەران هەیانە ووشك و بێ‌گیان وەك خـاك و بـەرد، هەیانـە خـاوەن هەسـتن و گەشـە ئەکەن و خاوەنی زانست نین وەك ڕووەك و درەخت. هەیانە خاوەنی گیان و گەشـە و زانسـت وەك ئادەمیزاد. کەواتە ئادەمیزاد هاوبەشە لـەگەڵ هەموو بوونـەوەران و، لـە هـەموویان جـوێ ئەبێتەوە بە ئەقڵ و زانست، بـەوە بەرپرسـارن بـۆ تۆشـبوونی سـزا، وەك خـودا لـەو ئایەتـەدا فەرمووی، بۆ وەرگرتنی پاداشتی چاك وەك خودا ئەفەرموێ:

﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا﴾ بە ڕاستی پیاوچاکان و ڕاستگۆیان و خودا پەرستان مەی لە بەهەشتا لە ناو پەرداخێکی شوشەدا ئەخۆنەوە، ئەو شتەی تێکەڵاوی ئەو مەیە ئەکرێ ئاوی کافورە، کافور بریتییە لە سەرچاوەی ئاوێ، لەو ئاوە ئەخۆنەوە بەندەی دۆستانی خودا، ئەیبەن بۆلای خانوو کۆشك و جێگەکانی خۆیان بە بردنێکی ئاسان و بێئازار بە بێ دۆڵچە و سەتڵ، ئاوی کافور ساردە و تامی خۆشە و بۆنی پاکە و، مەی بەهەشت بێ ئازار و بێ سەرئێشەیە، بە دژی مەی لە جیهاندا.

يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ
يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا ﴿٧﴾ وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا
وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا
﴿٩﴾ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا ﴿١٠﴾ فَوَقَاهُمُ اللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ
الْيَوْمِ وَلَقَّاهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴿١١﴾ وَجَزَاهُم بِمَا صَبَرُوا جَنَّةً وَحَرِيرًا
﴿١٢﴾ مُّتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى الْأَرَائِكِ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا ﴿١٣﴾
وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَالُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا ﴿١٤﴾ وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِآنِيَةٍ
مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴿١٦﴾
وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴿١٧﴾ عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا
﴿١٨﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا
﴿١٩﴾ وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا ﴿٢٠﴾ عَالِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ
خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوا أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَاهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا
طَهُورًا ﴿٢١﴾ إِنَّ هَٰذَا كَانَ لَكُمْ جَزَاءً وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا ﴿٢٢﴾

دوای ئەوەی خودای مەزن ئامۆژەی فەرموو بۆلای هەندێ شت ئامادەی کردووە بۆ پیاوچاکان لەمەودوا، ئەفەرموێ ئەو پیاوچاکانە شایستەن بۆ ئەوەی ئەو شتانەیان لەگەڵ بکرێ لەبەر ئەمانەی دووایی:

﴿يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا﴾ ئەو پیاوچاکانە جێبەجێ ئەکەن ئەو شتانەی خودا پێویستی کردووە لەسەریان: وەك نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و حەج و عەمرە

جگەی ئەوانیش و، ئەترسن لە ڕۆژی سزای ئەو ڕۆژە زۆر سەختە و بڵاو ئەبێتەوە بە هەمو لایەکا و درێژ خایەنە.

بۆ زانین: (نذر) بریتی‌یە لە شتێ بە گوێرەی یاسا پێویست نەکراوە لەسەر ئادەمیزاد. بەڵام خۆیان لەسەر خۆیانی پێویست ئەکەن. بەو جۆرەی ئەیڵێن: بۆ خودابێ لەسەر من: چاکەیە یا نوێژێ یا ڕۆژوێ یا حەجێ بکەم، کردنیان ئەبەستێ بە کارێکەوە: یانێ ئەڵێ: ئەگەر ئەو نەخۆشەم چاك بۆیەوە پێویستبێ لەسەرم فلان شت بکەم، دووایی ئەبێ ئەو شتە بکات.

﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا﴾ وە ئەو پیاوچاکانە خواردەمەنی و هەموو شتێ کە زۆر گرنگە لایان و لە سەرەڕای ئەو خواردەمەنی‌یە لایان خۆشە و کەمیشە، ئەیبەخشن بە هەژاران و بەهەتیوەکان و بە دیلەکان، هەر لەسەر خۆشەویستی خودا. یاسای ئیسلام پێشکەوتووترینی هەموو یاسا و هەموو بیر و باوەڕێکە، لەسەرووی هەموویانەوە یاسای نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ دەست گیرۆیی کردنی داماوان و لێقەوماوان، بە تایبەتی دیلەکانی جەنگ و، بۆ پاراستنی مافی مرۆڤ.

﴿إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا﴾ ئەو پیاوچاکانە ئەڵێن: بە ڕاستی ئێمە خواردەمەنی ئەدەین بە ئێوە لەسەر پاداشت و ڕەزامەندی خودا بە تەنها، داوای پاداشت و سوپاس لە ئێوە ناکەین و نامانەوێ پاداشتمان بدەنەوە و سوپاسمان بکەن.

زانایان بیریان جیاوازە لە بارەی هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە، هەندێکیان ئەڵێن: لە بارەی پیاوێکی مەدینییەوە هاتووەتە خوار، ناوی (دەصداح) بووە، ڕۆژێ بە ڕۆژوو بووە لە کاتی ڕۆژووشکاندنا هەژارێك و هەتیوێك و دیلێك هاتن، چوار کولێرەی هەبووە سیانی داوە بەوان و، کولێرەیەکی بۆ خۆی و خێزانەکەی هێشتەوە. زۆربەی زانایان ئەڵێن: لە بارەی عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە (ڕەزای خوای لێبێ) هاتووەتە خوارەوە کە کرێکاری کردبوو بۆ جولەکەیە بە ئەندازە جۆیە، کردی بە سێ کولێرە هەرسیانی بەخشی بەو کەسانە باسکران، خۆی و خێزانەکەی بە برسێتی مانەوە.

﴿إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا﴾ بە ڕاستی ئێمە ئەترسین لە سزای پەروەدگاری خۆمان لە ڕۆژێکا ڕوومەتی ئادەمیزاد زۆر گرژ و زۆر تاریکە، هەر لەبەر ئەو ترسە و ڕەزامەندی خودا ئێمە چاکەتان لەگەڵ ئەکەین.

﴿فَوَقَاهُمُ اللَّهُ شَرَّ ذَلِكَ الْيَوْمِ وَلَقَّاهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا﴾ دووایی خودا ئەو پیاوچاکانە ئەپارێزی لە سزای سەختی ئەو ڕۆژە بەهۆی ترسانیان لە پەروەدگاری خۆیان و، بەوانی ئەبەخشێ لە جیاتی ڕووی گرژ و تاڵ و ناشیرین ڕوویەکی کراوە و جوان، خۆشی دڵیان و، ترسیان نامێنێ و ئاسایش ڕوویان تێ ئەکا.

﴿وَجَزَاهُم بِمَا صَبَرُوا جَنَّةً وَحَرِيرًا﴾ وە خودا پاداشتیان ئەداتەوە بە بۆنەی ئارامگرتنیان لەسەر برسێتی خۆیان هەتا جگەی خۆیان تێر بکەن بە چوونیان بۆ بەهەشت و بە لەبەرکردنی ئەوریشم، ئەوەی دەروونیان لای خۆشبێ خودا بەوانی ئەبەخشێ.

﴿مُتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى الْأَرَائِكِ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا﴾ ئەو پیاو چاکانە دائەنیشن لەسەر کورسی لە بەهەشتا، گەرمای خۆر و سەرمای سەخت نابینن لە بەهەشتا، بێگومان لەو کاتەدا خۆر نییە و، سەرمای وایش نییە ئازاریان بدات.

﴿وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَالُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا﴾ وە سێبەری درەختەکانی بەهەشت بە نزمی ئەکەوێتە سەریان و، هێشووی میوەی درەختەکان ئاسانکراوە بۆیان، بە ڕاوەستان و دانیشتن و ڕاکشانەوە ئەتوانن بیان کەنەوە و بیانخۆن بە بێ ماندووبوون.

﴿وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِآنِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا﴾ وە پەرداخی لە زیو درووستکراو، کوپەی بێ دەسکی لە شوشە درووست کراو پڕ لە مەی بێ ئازار لە لایەن خزمەتکارانی بەهەشتەوە ئەگێڕرێ بەسەریانا.

﴿قَوَارِيرَ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا﴾ ئەو شوشانە درووست کراون لە سپیەتیدا بە وێنەی زیو، لە بێ گەردی بە وێنەی شووشەن، ئەو کەسانەی بەسەر کورسییەکانەوە دانیشتوون. ئەو پەرداخانەیان بۆ دیاریکردوون بە گوێرەی تینوێتی خۆیان بە جۆرە دیاری کردنێ، نە کەمترە و نە زۆرترە.

﴿وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّى سَلْسَبِيلًا﴾ وە ئەو پیاوچاکانە لە ناو بەهەشتا پەرداخی پڕ مەی بێ ئازار دەرخواردیان ئەدرێ، ئەوەی تێکەڵاوی ئەو مەیە ئەکرێ ڕیشووی جۆرە ڕووەکێکە تامی زۆر خۆشە، ئاوی کانییەکانی تێ ئەکرێ لە بەهەشتا ناوی ئەبرێ بە سەلسەبیل یانێ زۆر بە ئاسانی لە قوڕگ ئەڕواتە خوارەوە.

﴿وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا﴾ وە چەن کوڕێکی تەمەن بەردەوام نامرن و پیرنابن زۆر ڕووخۆشن و ئەگەڕێن بەسەر دانیشتووانی بەهەشتا، کاتێ تۆ ئەو منالانە ئەبینی گومان ئەبەیتە ئەوان لە جوانیدا کە مرواریـن بڵاوکراون لەسەر ڕاخەری دانیشتندا.

﴿وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا﴾ وە هەرکاتێ شتێ ئەبینن لە بەهەشتا، تۆ چاکەی زۆر سامانی فراوان ئەبینی، بە جۆرێکن نە گوێ بیستوویەتی و نە چاو بینیویەتی و نە بە دڵی هیچ ئادەمیزادێکا هاتووە.

﴿عَالِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ﴾ بەرگی ئەوریشمی تەنکی سەوز و، ئەوریشمی قایم ئەدرێ بەسەر دانیشتووانی بەهەشتا.

﴿وَحُلُّوا أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَاهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا﴾ وە دانیشتووانی بەهەشت ڕازێنراونەتەوە بە بازنەی زۆر لە دەستیانا درووست کراون لە زیو و، پەروەدگاری خۆیان خوراوەیەکی پاکی بێ ئازاریان دەرخوارد ئەدات.

﴿إِنَّ هَذَا كَانَ لَكُمْ جَزَاء وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا﴾ بە دانیشتووانی بەهەشت ئەبێژرێ دووای چوونیان بۆ بەهەشت: بە ڕاستی ئەو خواردن و خواردنەوە و بەرگانە دراون بە ئێو پاداشتی کرداری خۆتانە لە لایەن خوداوە دراوە پێتان و، کۆشش و ماندووبوونی ئێوە وەرگیراوە و زۆر چاکە لە لای ئێمە، لەبەر ئەوەی ئێوە بە هەژار و هەتیو و دیلەکانتان ئەوت: ئێمە پاداشتمان لە ئێوە ناوێ و نامانەوێ سوپاسمان بکەن.

إِنَّا
نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ تَنزِيلًا ﴿٢٣﴾ فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعْ
مِنْهُمْ ءَاثِمًا أَوْ كَفُورًا ﴿٢٤﴾ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٢٥﴾
وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَٱسْجُدْ لَهُۥ وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ
هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمْ يَوْمًا ثَقِيلًا ﴿٢٧﴾ نَّحْنُ
خَلَقْنَٰهُمْ وَشَدَدْنَآ أَسْرَهُمْ وَإِذَا شِئْنَا بَدَّلْنَآ أَمْثَٰلَهُمْ تَبْدِيلًا
﴿٢٨﴾ إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿٢٩﴾
وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٣٠﴾
يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٣١﴾

﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ تَنزِيلًا﴾ بە ڕاستی ئێمە قورئانمان ناردووەتە خوارەوە بۆ سەر تۆ بە ناردنە خوارەوەیە، بەش لە دوای بەش بەهۆی جبرەئیلەوە لەبەر چەن سودێکی تایبەتی بۆ ئێوە.

﴿فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ آثِمًا أَوْ كَفُورًا﴾ دووایی تۆ ئارام بگرە لە سەر دواخستنی سەرخستنی تۆ بەسەر بێباوەڕانی مەککەدا لەبەر فەرمانی پەروەدگاری خۆت، هەموو فەرمانەکانی من ڕابگەینە بە دانیشتووان هەتا کاتێ فەرمانت پێ ئەدەم بە جەنگ کردن لەگەڵیانو، تۆ پەیرەوی هیچ گوناهبارێ و، بێباوەڕێ مەکە لە دانیشتووانی مەککە.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەوەبووە: ئەبوجەهل ووتی: ئەگەر من موحەممەدم بینی نوێژی ئەکرد پێ ئەخەمە سەر ملی. عەتەبەی کوڕی ڕەبیعە و، وەلیدی کوڕی موغەیرە ووتیان

بە پیغەمەر: ئەگەر تۆ دارایی و ژنت ئەوێ لەم داوایەی خۆت وەرگەری دارایی زۆرت ئەدەینێ و، عەتبە ووتی: من کچی خۆمت ئەدەمێ و بەبێ مارەیی بۆت ئەنیرم.

﴿واذكر اسم ربك بكرة وأصيلا ومن الليل فاسجد له وسبحه ليلا طويلا﴾ وە تۆ بەردەوامبە لەسەر باسی پەروەدگاری خۆت بەکردنی نویژی بەیانی و مەغریب لە بەیانی و ئیوارانـدا و، دووایی لە هەندێ کاتی شەودا سوژدە ببە بۆ پەروەدگاری خۆت بە کردنی نویـژی مەغریب و عیشا، پاك و خاوینی دەربرە بۆ پەروەدگار بە بەشیکی زۆر لە شەو و نویژ لەشەوداکردن.

﴿إن هؤلاء يحبون العاجلة ويذرون وراءهم يوما ثقيلا﴾ بە راستی بێ باوەرانی مەککە ئەو جیهانەی بە گورجی کۆتایی پێ دێ خۆشیان ئەوێ و، ئەو رۆژە سەختەی لە پیشیانەوەیە کە رۆژی دوواییە وازی لێ ئەهینن و کاری بۆ ناکەن.

﴿نحن خلقناهم وشددنا أسرهم وإذا شئنا بدلنا أمثالهم تبديلا﴾ ئەو بێباوەرانە ئیمە دروستمان کردوون لە نەبوونەوە و، جوان و بەهیزمان کردووە دروستکردنیان بە بەستنەوەی جومگە و دەماریان بە یەکەوە و، هەرکاتێ ئارەزۆمان کرد ئەو بێباوەرانە لەناو ئەبەین و وینەی ئەوان درووست ئەکەین و لە جیگەی ئەواندا دایان ئەنیین و، ئەوان ئەگۆرین بەمان بە گۆرانیکی ئاسان بە کەسانێ باوەر بە ئیمە ئەهینن و بە تەنها هەر ئیمە ئەپەرستن.

﴿إن هذه تذكرة فمن شاء اتخذ إلى ربه سبيلا﴾ بە راستی ناوەرۆکی ئەو سوورەتە ئامۆژگاری کردنە لە لایەن ئیمەوە بۆ ئادەمیزاد و جنۆکە، دووایی هەرکەسێ ئارەزۆی هەیە ریگەیە بگرێ بۆلای پەروەدگاری خۆی لە جیهاندا، بەهۆی ئەو ریگەیەوە خۆی نزیك بخاتەوە لە پەرستنی پەروەدگار.

﴿وما تشاؤون إلا أن يشاء الله إن الله كان عليما حكيما﴾ وە ئیوە دوای ئەوەی خودا ریگەی چاك و خراپی بۆ ئیوە روون کردووەتەوە هیچ شتێ بۆ خۆتان هەلنابژیرن و ئارەزۆی ناکەن مەگەر بە ویست و ئارەزۆی خودا ئەو شتە ئەکەن، یانێ فەرمانی پیداون ئەو شتە چاکە بیکەن و ئەو شتە خراپەیە مەیکەن، ئیتر ئیوە بە سەربەستی خۆتان یەکیکیان هەلبژیرن و خۆتان بەرپرسیارن. بە راستی خودا هەموو شتێ ئەزانێ چ شتێ شایستەی هەرکەسێ بێ، هەموو شتێ لە جیگەی شیاوی خۆیا دائەنێ.

﴿يدخل من يشاء في رحمته والظالمين أعد لهم عذابا أليما﴾ هەرکەسێ خودا ئارەزۆی بکا ئەیخاتە ناو ئاپینی خۆی و ناو بەهەشتی خۆی و، خودا ئامادەی کردووە بۆ ستەمکاران سزایەکی خاوەن ئازاری سەخت.

# ﴿ سورەتی ئەلمورسەلات ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن ئەڵێن: جگـە لـە ئایـەتی (٤٨) لـە مەدینە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٥٠) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا ﴿١﴾ فَالْعَاصِفَاتِ عَصْفًا ﴿٢﴾ وَالنَّاشِرَاتِ نَشْرًا ﴿٣﴾
فَالْفَارِقَاتِ فَرْقًا ﴿٤﴾ فَالْمُلْقِيَاتِ ذِكْرًا ﴿٥﴾ عُذْرًا أَوْ نُذْرًا ﴿٦﴾ إِنَّمَا
تُوعَدُونَ لَوَاقِعٌ ﴿٧﴾ فَإِذَا النُّجُومُ طُمِسَتْ ﴿٨﴾ وَإِذَا السَّمَاءُ فُرِجَتْ
﴿٩﴾ وَإِذَا الْجِبَالُ نُسِفَتْ ﴿١٠﴾ وَإِذَا الرُّسُلُ أُقِّتَتْ ﴿١١﴾ لِأَيِّ يَوْمٍ أُجِّلَتْ
﴿١٢﴾ لِيَوْمِ الْفَصْلِ ﴿١٣﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الْفَصْلِ ﴿١٤﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ
لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٥﴾ أَلَمْ نُهْلِكِ الْأَوَّلِينَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ نُتْبِعُهُمُ الْآخِرِينَ
﴿١٧﴾ كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِالْمُجْرِمِينَ ﴿١٨﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٩﴾
أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّاءٍ مَّهِينٍ ﴿٢٠﴾ فَجَعَلْنَاهُ فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿٢١﴾ إِلَىٰ قَدَرٍ
مَّعْلُومٍ ﴿٢٢﴾ فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ الْقَادِرُونَ ﴿٢٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٤﴾
أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ كِفَاتًا ﴿٢٥﴾ أَحْيَاءً وَأَمْوَاتًا ﴿٢٦﴾ وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ
شَامِخَاتٍ وَأَسْقَيْنَاكُم مَّاءً فُرَاتًا ﴿٢٧﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٨﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا فَالْعَاصِفَاتِ عَصْفًا وَالنَّاشِرَاتِ نَشْرًا﴾ مـن سـوێند ئـەخۆم بـەو فریشـتانە نێردراون بۆ ئەوەی سروش و هەموو چاکەیە ڕابگەیەنن بە پێغەمەران، دووایی من سوێند ئەخۆم بەو فریشتانە بە تیژی ئەڕۆن بۆ سەرەوە و بۆ خوارەوە، بە تیژ ڕۆیشتنی وێنەی تیژی بـا، سـوێند ئەخۆم بەو فریشتانە کاتێ دێنە خـوارەوە بـۆلای زەوی باڵـەکانیان بـڵاو ئەکەنـەوە و، نامـە و تۆماری کردەوەکانی ئادەمیزاد بڵاو ئەکەنەوە لە ڕۆژی دووایدا.

تەفسیری زمناکۆیی

﴿فَالْفَارِقَاتِ فَرْقًا فَالْمُلْقِيَاتِ ذِكْرًا عُذْرًا أَوْ نُذْرًا إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَاقِعٌ﴾ دووایی من سوێند ئەخۆم بەو فریشتانە دێن بۆلای پێغەمەران ڕاستی و کاری پوچ لە یەك جویٚ ئەکەنەوە، دووایی من سوێند ئەخۆم بەو فریشتانە فەرمانی خودا و قورئان ئەبەن بۆلای پێغەمەران و بەوانی ئەگەیەنن، لەبەر نەمانی بیانووی ئادەمیزاد، یا لەبەر ترساندیان، سوێندم بەوانە هەموو ئەو شتەی بەڵێنی دراوە بە ئێوە کە پەیدابوونی ڕۆژی دووایە پەیدا ئەبێ بە بێ گومان.

هەندی لە زانایان بەم جۆرە مانای ئەو ڕستانەیان کردووە: یانی من سوێند ئەخۆم بەو فریشتانە نێردراون پەیاپەی و، یەك لە دوای یەك بە زۆری، دوایی من سوێند ئەخۆم بەو بایانە بە تیژی هەڵیان کردووە، سوێند ئەخۆم بەو بایانە بە سوکی و بە نەرمی هەڵئەکەن بە هەڵکردنێ سود بەخشە، دووایی من سوێند ئەخۆم بەو بایانە کاتێ پەیدائەبن درەخت لە بن دەردێنن و خانووەکان کاول ئەکەن و شوێنەوار ئەگۆڕن، دووایی من سوێند ئەخۆم بەو بایانە لە کاتی پەیدابوونیانا یادی خودا ئەخەنەدڵی ئادەمیزادەوە، لەبەر ئەوەی بیانوویان نەمێنێ و بترسن.

هەندێ لە زانایان بە جۆرێ تر مانایان کردووە. یانێ سوێند ئەخۆم بەو ئایەتانەی قورئان یەك لە دوای ئەك ڕەوانەکراون بۆ سەر موحەممەد بە چاکەی زۆرەوە. دووایی من سوێند ئەخۆم بەو ئایەتانەی دڵی ئادەمیزاد ئەشکێنن بە هەڕەشەی خودا بە وێنەی ڕووەکێ شکابێ، من سوێند ئەخۆم بەو ئایەتانە ڕووناکی و ناسینی خودا بلاو ئەکەنەوە لە دڵی باوەڕدارانا بە بلاوکردنەوەی ئاشکرا، سوێند ئەخۆم بەو ئایەتانەی کاری ڕاست و پوچ لە یەك جویٚ ئەکەنەوە، دووایی من سوێند ئەخۆم بەو ئایەتانەی قورئان ئەخەنە دڵی باوەڕداران، لەبەر ئەوەی بیانوویان نەمێنێ، یا بترسن و باوەڕ بهێنن.

هەندێ تر لە زانایان ئەڵێن: ئەو پێنج ڕستانە یەك مانایان نییە، سیانی یەکەمیان بە مانا بایەکانن، دووانەکانی دووایی بە مانا فریشتەکانن. زانینی هەموو شتێ هەواڵەی خودایە و، ئێمە داوای زانینی هەموو شتێکمان لێ ناکرێ. لە پاشا خودا ئەفەرموێ ئەو ڕۆژە کاتێ پەیدا ئەبێ.

﴿فَإِذَا النُّجُومُ طُمِسَتْ وَإِذَا السَّمَاءُ فُرِجَتْ وَإِذَا الْجِبَالُ نُسِفَتْ وَإِذَا الرُّسُلُ أُقِّتَتْ﴾ دووایی کاتێ پەیدا ئەبێ ئەستێرەکان ڕووناکیان نامێنێ و، کاتێ ئاسمان پارچەکانی لە یەك جویٚ ئەبنەوە و ئەستێرەکانی لە ناو ئەچن و، کێوەکان ئەبن بە تۆز و ئەچن بەم لاولادا و، کاتێ فریشتەکان کاتێکیان بۆ دیاریکراوە لە لایەن خوداوە، لەبەر ئەوەی شایەتی خۆیان بدەن لەسەر بەندەکانی خودا، دووایی تاقمێکیان ئەنێردرێن بۆلای بەهەشت، تاقمێ تریان بۆلای دۆزەخ ئەنێررێن.

﴿لِأَيِّ يَوْمٍ أُجِّلَتْ لِيَوْمِ الْفَصْلِ وَمَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الْفَصْلِ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ بۆلای چ ڕۆژێ دواخراوە ئەو شتانە، بە تایبەتی شایەتی دانی ئەو فریشتانە، دوواخراوە بۆ ڕۆژی بوونەوەران لە یەك جویٚ ئەکرێنەوە بە جۆرێکی دادپەروەی و ڕاستی و، چ شتێکی

سەرسوڕێنەر و گرانە بە تۆی ڕابگەیەنێ ڕۆژێ جوێ‌کردنـەوە چ شتێکە، ڕۆژێکـە بـەراوردی لەگەڵ هیچ ڕۆژێکا ناکرێ لە سەختیدا، هاوار و سزای سەخت بۆ ئەو کەسـانەیە لـەو ڕۆژەدا باوەڕیان بە خودا و نامەی خودا و بە پێغەمـەر و بـە زیندووبوونـەوەی دوای مـردن نیـە و بـە درۆیان ئەخەنەوە.

﴿أَلَمْ نُهْلِكِ الْأَوَّلِينَ ثُمَّ نُتْبِعُهُمُ الْآخِرِينَ كَذَلِكَ نَفْعَلُ بِالْمُجْرِمِينَ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ ئایا ئێمە لە ناومان نەبردوون بێ‌باوەڕانی پێشووی تاقمی نوح کە پێغەمەری خۆیان بـە درۆخستەوە، لـە پاشانا بە دووای ئەوانمانا نەهێناوە تاقمێ تری بێ‌باوەڕان بە وێنەی تاقمی لووت و لە ناو بـردن، هەر بەو جۆرە کارەی لەگەڵ ئەوانمانا کرد و لە ناومان بردن، ئێمە ئەو کـارەیش لەگـەڵ ئـەو کەسە تاوانبارانەی ئەوتۆ ئەکەین موحەممەد بە درۆ ئەخەنەوە، چونکە تاوانیان، وەك یـەك وایـە. لەو ڕۆژەدا سزای سەخت بۆ ئەو کەسانەیە ئایەتەکانی نامـەی خـودا و پێغەمـەرەکان بـە درۆ ئەخەنەوە.

خودای مەزن (١٠) جار ڕستەی ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِـذٍ لِّلْمُكَذِّبِـينَ﴾ دووپـات کردووەتـەوە، لەبـەر جیاوازی مەبەست لە مانای ئەو ئایەتەی لە پێشی ئەوانەوە باسکراون. هاوار و سـزای سـەخت بۆ ئەو کەسانەیە باوەڕ بە یەکێتی خوا نایەرن.

﴿أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّاء مَّهِينٍ فَجَعَلْنَاهُ فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ إِلَى قَدَرٍ مَّعْلُومٍ فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ الْقَادِرُونَ وَيْـلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ ئایا ئێوەی بێ‌باوەڕانمان درووست نـەکردووە لـە ئـاوێکی بـێ‌نرخ لـە پشـتی باوکەوە دێتە دەرێ، دووایی ئێمە ئەو ئاوەمان داناوە لە جێگەیە شیاوی دانانی ئەو ئاوەیە، وەك منالّدانی دایك، بۆلای کاتێ خودا دیاری کردووە بۆ لەدایك بوونی، دووایی دیاری‌مان کردووە و ئامادەمان کردووە پلە بە پلەی گۆڕان بەسەر ئەو ئاوەدا دێ هەتا ئەبێ بە بێچویەکی تەواو لە منالّدانی دایکیا، دووایی ئێمە چاك دیاری‌کەرێکین، چوونکە ئێمـە ئـەومان درووستکردووە و کردمان بە ئادەمیزادێ بە شیرینترین شێوە و دیمەن. هاوار و سزای سەخت لە ڕۆژی دووایدا بۆ کەسانێکە بڕوایان بە توانای ئێمە نی‌یە کە چۆن ئێمـە ئـەوانمان لـەو ئـاوە درووسـت کـردووە ئەتوانین دوای مردنیان زیندوویان بکەینەوە بە ئاسانتر.

﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ كِفَاتًا أَحْيَاء وَأَمْوَاتًا وَجَعَلْنَا فِيـهَا رَوَاسِـيَ شَـامِخَاتٍ﴾ ئایـا ئێمـە زەویمـان درووست نەکردووە بە جۆرێ بوونەوەرانی زیندوو لەسەری خۆی و بوونەوەرانی مردوو لە ناو بگرێتە خۆی؟ بێگومان بەو جۆرەمان درووست کـردووە و، دامـان نـاوە لـە زەوی‌دا چـەندین کێوێ بەرز و نەجولاّو هەتا خوار نەبێتەوە بە ئێوەوە.

﴿وَأَسْقَيْنَاكُم مَّاء فُرَاتًا وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ وە ئایا ئێمە دەرخواردی ئێوەمان نەداوە ناوێکی شیرین و بەتام، هۆی گەشەکردنی زەوی ژیانی ئێوەی ئادەمیزادە و، نەمان و سزای سـەخت بـۆ ئەو کەسانەیە لە جیهاندا ئەو ڕۆژەی دووایی و زیندووبوونـەوە بـە درۆ ئەخاتـەوە و بـاوەڕ بـە خودا نایەرێ.

أنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٩﴾ أنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ ظِلٍّ ذِى ثَلَٰثِ
شُعَبٍ ﴿٣٠﴾ لَّا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِى مِنَ ٱللَّهَبِ ﴿٣١﴾ إِنَّهَا تَرْمِى بِشَرَرٍ
كَٱلْقَصْرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ ﴿٣٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٤﴾
هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴿٣٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ
لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٧﴾ هَٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ جَمَعْنَٰكُمْ وَٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ فَإِن كَانَ
لَكُمْ كَيْدٌ فَكِيدُونِ ﴿٣٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى
ظِلَٰلٍ وَعُيُونٍ ﴿٤١﴾ وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٤٢﴾ كُلُواْ وَٱشْرَبُواْ هَنِيٓـًٔا
بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٤٤﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ
لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٥﴾ كُلُواْ وَتَمَتَّعُواْ قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ ﴿٤٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ
لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرْكَعُواْ لَا يَرْكَعُونَ ﴿٤٨﴾ وَيْلٌ
يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ فَبِأَيِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٠﴾

بێباوەڕان سزای خودایان بە درۆ ئەخستەوە و، گاڵتەیان بە سزای خودا و بەو کەسە ئەکرد هەڕەشەی ئەکرد لەوان بەو سزایە. دووایی لە ڕۆژی دووایدا پاسەوانانی دۆزەخ بەوان ئەڵێن:

﴿انطَلِقُوا إِلَى مَا كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ انطَلِقُوا إِلَى ظِلٍّ ذِي ثَلَاثِ شُعَبٍ﴾ ئێوەی بێباوەڕ بڕۆن بۆلای شتێ ئێوە بە درۆتان ئەخستەوە و گاڵتەتان بەو شتە ئەکرد، بڕۆن بۆلای دووکەڵی ئاگری لە دۆزەخدا، لە گەورەییدا کاتێ بەرز ئەبێتەوە خاوەنی سێ پارچەیە: پارچەیەکیان ئەکەوێتە لای ژوورەوەی بێباوەڕان. پارچەیەکیان ئەکەوێتە لای ڕاستییان پارچەیە تریان ئەکەوێتە لای چەپیان.

﴿لَا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِي مِنَ اللَّهَبِ إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَالْقَصْرِ﴾ ئەو دووکەڵە سێبەرە و، سودێ نابەخشێ بەوان لە بۆ لابردنی گەرمای گڕی ئاگری دۆزەخ هیچ شتێ، بەڵکو ئەو سێبەرە سزاکەیان زۆرتر ئەکات. بە ڕاستی دۆزەخ لە کاتی بەرزبوونەوەی کڕەکەیا پرژی وا فڕە ئەدا بچووکەکەیان ئەوەندەی کۆشکێکی گەورەیە.

﴿كَأَنَّهُ جِمَالَتٌ صُفْرٌ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ ئەو پرژە بەرز ئەبێتەوە بە وێنەی هوشتری زەردە، لە ڕەنگ و لە گەورەییدا، هاوار و سزای سەخت بۆ ئەو کەسانەیە باوەڕ نایەرن و ڕۆژی دووایی و زیندووبوونەوە بە درۆ ئەخاتەوە لە جیهاندا، لە ڕۆژی دووواییدا بەشیان ڕسوایی و سزای گرانە.

﴿هَذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ ئەو ڕۆژەی باسیکرا ڕۆژی گفتوگۆ نەکردنی تاوانبارانە لە هەندێ جێگەدا، هەرچەندە لە جێگەیەتردا گفتوگۆ ئەکەن و، دەستوور نادرێ بەوان گفتوگۆ بکەن و دووایی بیانو بهێننەوە لەو جێگەیەدا و، هاوار و سزای سەخت لەو ڕۆژەدا بۆ ئەو کەسانەیە باوەڕ نایەرن و ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە بە درۆ ئەخەنەوە.

﴿هَذَا يَوْمُ الْفَصْلِ جَمَعْنَاكُمْ وَالْأَوَّلِينَ فَإِن كَانَ لَكُمْ كَيْدٌ فَكِيدُونِ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ ئەو ڕۆژەی باسکرا ڕۆژی جوێکردنەوەی کاری ڕاست و پوچ جوێ کردنەوەی باوەڕداران و تاوانبارانە، ئێمە ئێوە و تاوانبارانی ڕابردوو کۆ ئەکەینەوە لە ڕۆژی دوایی و لە یەك جێگەدا، دووایی ئەگەر ئێوە فێڵ و ڕێگەیەکتان هەیە سزای ڕۆژی دووایتان لێ بگێڕێتەوە، دووایی بهێنن با ڕزگارتان بکا لە سزای ئێمە لەم ڕۆژەدا. هاوار و سزای سەخت بۆ ئەو کەسانەیە لەو ڕۆژەدا زیندووبوونەتەوە ڕۆژی دوایی بە درۆ ئەخەنەوە و باوەڕیان پێ نایەرن.

﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي ظِلَالٍ وَعُيُونٍ وَفَوَاكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ﴾ بە ڕاستی بۆ ئەو کەسانە هەیە لە خودا ئەترسن و خۆیان لە بێ فەرمانی خودا ئەپارێزن لە ناو سێبەری درەختی بەهەشتا و، لە لای چەن کانیاوی ئاوی شیرین و بۆیان هەیە میوەی هەمەڕەنگ لە هەندی لەو شتانە ئارەزۆی ئەکەن.

﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ فریشتەکان بەوان ئەڵێن: ئێوە لە خواردەمەنی بەهەشت بخۆن و، لە ئاوی شیرین و مەی بێ ئازار بخۆنەوە، نۆشی گیانتان بێ بەهۆی پاداشتێ ئێوە ئەیکەن لە جیهاندا.

﴿إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ بە ڕاستی هەر بەو جۆرەی پاداشتی ئێوەمان دایەوە، هەروایش ئێمە پاداشتی ئەو کەسانە ئەدەینەوەچاکە بکەن لە جیهاندا. سزای گران و هاوار لەو ڕۆژەدابۆ ئەو کەسانەیە باوەڕیان بە زیندووبوونەوە و بوونی بەهەشت نی‌یە و بە درۆیان ئەخەنەوە. بە تاوانباران ئەبێژرێ:

﴿كُلُوا وَتَمَتَّعُوا قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ ئێوە بخۆن و ڕابوێرن ماوەیەکی کەم لە جیهاندا. بە ڕاستی ئێوە تاوانبارن. هاواری سەخت بۆ ئەو کەسانەیە کە باوەڕیان بە ڕۆژی دووایی نی‌یە.

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ارْكَعُوا لَا يَرْكَعُونَ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ وە هەرکاتێ بێژرا بەو تاوانبارانە: ئێوە کڕنووش ببەن بۆ خودا و نوێژ بکەن، ئەوانیش کوڕنووش نابەن و نوێژ ناکەن. هاوار و سزای گران بۆ ئەو کەسانەیە لەو ڕۆژەدا باوەڕیان بە زیندووبوونەوە نیە.

﴿فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ﴾ دوای قورئان بەو هەمووە کارە پەك خەرانەوە بە چ شتێ تر تاوانباران باوەڕ ئەهێنن، ئەگەر باوەڕ بە قورئان نەیەرن.

بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان. سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ پەروەدەکـەری هـەموو بوونەوەران. دروودی بێ ژمارە لـەسەر گیانی پاکی پیشەوای هەموو ئادەمیزاد، لـەسـەر هـەموو پەیڕەوانی بێ.

## ﴿ سورەتی نـەبـەأ ﴾

بە ئەلموعسیرات و بە تەسائولیش ناوبراوە.

لە مەککـە هاتووەتـە خـوارەوە.. ژمـارەی ئایەتـەکانی (٤٠) ئایـەتن. ئـەم جزمـە هـەموو سوورەتەکانی لە مەککە و لـە سەرەتای هـاتنی ئـایینی ئیسـلامدا هاتوونەتـە خـوارەوە جگـەی سوورەتی (ئەلبەینە) و سوورەتی (نەسر) لـە مەدینە هاتوونەتە خوارەوە، هەرچـەندە هـەندێ لـە زانایان ئەڵێن: سورەتی (ئەلبەینە) لـە مەککـە هاتووەتـە خـوارەوە. سـوورەتەکانی ئـەم جزمـە هەموویان کورتن. کەمێکیان نەبێ. زۆربەی ئەم سوورەتانە بۆ ئاگادارکردنەوەی ئادەمیزادن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ ﴿١﴾ عَنِ النَّبَإِ الْعَظِيمِ ﴿٢﴾ الَّذِي هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ ﴿٣﴾
كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ﴿٤﴾ ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ﴿٥﴾ أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا ﴿٦﴾
وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴿٧﴾ وَخَلَقْنَاكُمْ أَزْوَاجًا ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا
﴿٩﴾ وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاسًا ﴿١٠﴾ وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا ﴿١١﴾ وَبَنَيْنَا
فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ﴿١٢﴾ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴿١٣﴾ وَأَنْزَلْنَا
مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاءً ثَجَّاجًا ﴿١٤﴾ لِنُخْرِجَ بِهِ حَبًّا وَنَبَاتًا ﴿١٥﴾ وَجَنَّاتٍ
أَلْفَافًا ﴿١٦﴾

### ﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

### بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ عَنِ النَّبَإِ الْعَظِيمِ الَّذِي هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ﴾ بت پەرستانی مەککە لـە ناوخۆیانـا پرسیار لـە شـتێ ئەکـەن کـە زۆر گرنگـە، خـودای مـەزن وولامـی ئـەو پرسیارە ئەداتـەوە و ئەفـەرموێ: پرسـیار لـە هـەواڵێکی زۆر گـەورە و گرنگـی ئـەوتۆ ئەکـەن کـە بریتیـە لـە زیندووبوونەوەی مردووان، کە ئەوان بـیر و باوەڕیـان جیـاوازە لـە بوونـی زیندووبوونـەوەدا.

هەندێکیان باوەڕیان وابوو هەیە، هەندێ بە نەبوونی هەندێ تریان لە ناو ئەواندا بوون و، نـەیان ئەزانی ئەبێ یا نابێ.

بنچینەی ئیسلام سێ شتە: باوەڕ بە تەنهایی خودا، باوەڕ بە پێغەمەرایەتی موحەممەد، باوەڕ بـە زیندووبوونەوە و بە ڕۆژی دووایی، ئەو بت پەرستانە لە باوەڕ بەوانە زۆر دووربوون.

﴿كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ﴾ ئەو بیر و باوەڕەی ئـەوان بـەو جـۆرە نی‌یـە، لەمـەودوا ئەزانن کە زیندووبوونەوە هەیە، لە پاشانا بە ئاشکرایی ئەزانن ڕاستە و پەیدا ئەبێ، شایستەیە بۆ ئێوە لە بێباوەڕی خۆتان بگەڕێنەوە و، بترسن لە ڕۆژی پرسیار و، ئەزانن چ شتێ بەسەریانادێ. خـودای مـەزن شـتێ زۆر گـەورەتری لـە زیندووبوونـەوە پـەیداکردووە. زیندووکردنـــەوەی ئادەمیزاد، زۆر ئاسانترە لەو شتانە، وەك خودا ئەفەرموێ:

﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا وَخَلَقْنَاكُمْ أَزْوَاجًا﴾ ئایا ئێمە زەویمان نـەکردووە بـە ڕاخەر بۆ ئێوە، وەك بێشکە و، سوودی لێوەربگرن و شاراوەکانی ناوی دەربخـەن و، ئایـا ئێمـە کێوەکانمان نەکردووە بە مێخ بۆ زەوی و، بە وێنەی مێخی چادر، هەتا زەوی خوار نەبێتـەوە بـە ئێوەوە و، تووشی ئازار ببن و، ئایا ئێمە ئێوەمان درووست نەکردووە بە چەشنێ، بە نێر و بە مێ تۆوتان پارێزراوبێ و کۆمەڵتان پایەدار بێ و ژمارەتان زۆربێ؟

﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاسًا وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا﴾ وە ئایا ئێمە خـەوی ئێوەمـان نەگێڕاوە بە مایەی خۆشی و پشوودان بۆ ئێوە و، ئەگەر خەو نەبێ گیان و لـەشی ئێـوە تووشـی ئازاار ئەبێ و، ئایا ئێمە شەومان نەکردووە بە پۆشاك بۆتـان هـەتا ئـەوەی ئێـوە پێتـان ناخۆشـە دەرکەوێ داپپۆشن. لە سەرما لە گەرما بتانپارێزن و، ئایـا ئێمـە ڕۆژمـان نـەکردووە بـە کـاتی کارکردنی ئێوە و پەیداکردنی هۆی ژیانتان؟

﴿وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا﴾ وە ئایا ئێمە حەوت ئەسـتێرەی بـەهێزمان لە ژووری ئێوەوە درووست نەکردووە، مەبەست لەو حەوت ئەستێرانە ئـەوانن لای ئـادەمیزاد زانراون و ئەسووڕێنەوە و، ئەگینا جگە لەوانە ئەستێرەی تر هــەن نایەنـە ژمـارە، ئـەو حـەوت ئەستێرانە بریتین لە مەریخ ون موشتەری و، زوحەل و، نەورانوس و، نیتۆن و، پلۆتۆ و، ئێکس، جگە لە زەوی و، عوتارید و زوهرە، چونکە ئەوانە جێگەی سووڕانەوەیان نزیکترن لە خـۆرەوە و، ئایا ئێمە چرایەکی زۆر ڕووناکی پەخش کەرمان بۆ ئێوە درووست نەکردووە کە بریتی‌یە لـە خۆر و، جگەی ڕووناکی سەرچاوەی گەرمایە بۆ ئێوە.

﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاءً ثَجَّاجًا لِنُخْرِجَ بِهِ حَبًّا وَنَبَاتًا وَجَنَّاتٍ أَلْفَافًا﴾ وە ئایـا ئێمـە لـە هەورێ با ئەیگوشێ نەمان ناردووە ئاوێ زۆر بەخوڕی دێتە خوار و، لەبەر ئەوەی بەهۆی ئـەو ئاوەوە دانەویلە و، ڕووەك و، باخ و بۆستانی چڕ و پڕ و هـەندێ لـە لقـەکانی درەختـەکانیان چوون بە ناو یەکا و، زەوی بەو ئاوە ئەبووژێتەوە.

إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ كَانَ مِيقَاتًا ﴿١٧﴾ يَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ
فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا ﴿١٨﴾ وَفُتِحَتِ السَّمَاءُ فَكَانَتْ أَبْوَابًا ﴿١٩﴾ وَسُيِّرَتِ
الْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا ﴿٢٠﴾ إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا ﴿٢١﴾ لِّلطَّاغِينَ
مَآبًا ﴿٢٢﴾ لَّابِثِينَ فِيهَا أَحْقَابًا ﴿٢٣﴾ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا
﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴿٢٥﴾ جَزَاءً وِفَاقًا ﴿٢٦﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا
لَا يَرْجُونَ حِسَابًا ﴿٢٧﴾ وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا كِذَّابًا ﴿٢٨﴾ وَكُلَّ شَيْءٍ
أَحْصَيْنَاهُ كِتَابًا ﴿٢٩﴾ فَذُوقُوا فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴿٣٠﴾

﴿إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ كَانَ مِيقَاتًا﴾ بە ڕاستی ڕۆژی دووایی ڕۆژی جویٚ‌کردنەوەی پیاوچاکـان و پیاوخراپانە، کاتیٚ پرسـیارو پاداشـت وولامـە، جگـەی خـودا ئـەو کاتـە نازانـیٚ، لـەو ڕۆژەدا بوونەوەران لـە ناو ئەچن، بوونەوەران ئەبن بـە بوونـەوەریٚ بـە جگـەی ئیٚسـتای جیهان و لـە ناچوون بۆ ئادەمیزاد و جنۆکە نابیٚ لـەو ڕۆژەدا لـە ناچوون هیچ توانایە، خودای مەزن ئاماژە بۆ نیشانەی ئەو ڕۆژە ئەکا و ئەفەرمویٚ:

﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّور فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا﴾ ڕۆژیٚکە فوو ئەکریٚ بە کەڕەنادا و، هـەموو مـردووان زیندوو ئەبنەوە، دووایی پۆل پۆل ئەچن بۆ گۆڕەپـانی کۆبوونـەوە. مەبەسـت لـە فووکـردن بـە کەڕەنادا ئامادەبوونی ئادەمیزادە بۆ پرسیار و وولاّم، بە ویٚنەی زەنگ لیٚـدان لـە قوتابخانـەدا و، لەسەر بازگەدا بۆ ئامادەبوونیان بۆ خویٚندن و مەشقی سەربازەکان بەلاّم چۆنیەتی ئەو کەڕەنایـە هەر خودا ئەیزانیٚ.

﴿وَفُتِحَتِ السَّمَاء فَكَانَتْ أَبْوَابًا﴾ وە ئاسمان ئەکریٚتەوە و پارچە پارچە ئەبیٚ و، دووایی ئاسمان چەن دەرگای لیٚ پەیدا ئەبیٚ و، ئەستیٚرەکانیشیان نامیٚنیٚ و ڕیٚك و پیٚکـی گـەردوون و ئاسمـان و زەوی نامیٚنیٚ.

﴿وَسُيِّرَتِ الْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَـادًا لِلْطَّـاغِينَ مَآبًـا﴾ وە کیٚوەکـان لـە جیٚگەی خۆیان لـە زەویدا نامیٚنن، دووایی ئەبن بە تۆز و ئەڕۆن بـەم لاولادا. بـە ڕاسـتی دۆزەخ ئامادەیە و چاوەڕوانی بیٚباوەڕان ئەکات، جیٚگەی گەڕانەوەی ستەمکارانە.

﴿لَابِثِينَ فِيهَا أَحْقَابًا لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا جَزَاء وِفَاقًـا﴾ بیٚبـاوەڕان دائەنیشن لـە ناو دۆزەخدا ماوەیەکی دوور و دریٚژ و بیٚکۆتـایی مەگـەر خـودا ئـارەزۆی هاتنـە

دەرەوەیان بکا و، ناچێژن لـە ناو دۆزەخدا هیچ جـۆرە ساردی‌یە و، هیـچ خوراوەیـە، تینوێتـی ئەوان بشکێنێ، جگەی ئاوی زۆر گەرم و کیم و زوخی دانیشتووانی دۆزەخ. سزایان ئەدەین بە سزایە، شیاوی کردار و خراپەی خۆیانە.

﴿إِنَّهُمْ كَانُوا لَا يَرْجُونَ حِسَابًا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا كِذَّابًا﴾ بە ڕاستی جیهان چاوی کوێرکردبوون، بە ئومێدی پرسینەوەی ڕۆژی دووایی نەبوون، خۆیانیان لـە هیچ تاوانێ نەئەگێڕاوە و، نیشـانە و ئایەتەکانی قورئانیان بە درۆ ئەخستەوە بەدرۆخستنەوەی زۆر خراپ.

﴿وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ كِتَابًـا فَذُوقُـوا فَلَـن نَّزِيدَكُـمْ إِلَّـا عَذَابًـا﴾ وە ئێمـە هـەموو شتێ لـە کردارەکانی ئێوەمان کۆکردووەتەوە و تۆمارمان کردوون لـە نامەیەکدا و هیـچ شتێ لـە ئێمـە وون نابێ، بە هەڕەشەوە بەوان ئەبێژرێ: دووایی ئێوە بچێژن سزای پەروەدگاری خۆتان، دوایی ئێمە هیچ شتێ بۆ ئێوە زۆر ناکەین جگە لـە ئازاری سەخت.

لـە دووای ئەوەی خودای مەزن باسی بێ‌باوەڕانی فەرموو، دووایی باسی باوەرداران ئـەکا و ئەفەرموێ:

إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَآئِقَ وَأَعْنَٰبًا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴿٣٣﴾ وَكَأْسًا
دِهَاقًا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ﴿٣٥﴾ جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً
حِسَابًا ﴿٣٦﴾ رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلرَّحْمَٰنِ لَا يَمْلِكُونَ
مِنْهُ خِطَابًا ﴿٣٧﴾ يَوْمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ صَفًّا لَّا يَتَكَلَّمُونَ
إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا ﴿٣٨﴾ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلْحَقُّ فَمَن
شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ﴿٣٩﴾ إِنَّآ أَنذَرْنَٰكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا يَوْمَ
يَنظُرُ ٱلْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًا ﴿٤٠﴾

﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا حَدَائِقَ وَأَعْنَابًا وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا وَكَأْسًا دِهَاقًا﴾ بە ڕاستی بـۆ ئـەو کەسـانە هەیە لـە خودا ئەترسن و بێ‌فەرمانی خودا ناکەن، جێگەی ڕزگاری کە بریتی‌یە لـە چەندین بـاخ و باخات لـەواندا هەیە درەختی بەردار و درەختێ تربێ هەمە جۆر و، بۆیان هەیە چەندین کچـی مەمك خڕی تازە گۆپکەی کردووە و شۆڕ نەبووەتەوە ئەو کچانە هەموویان لـە یـەك تەمـەندان و، بۆیان هەیە پەرداخی پڕ لـە ئاوی شیرین و مەی و خواردنەوەی تری نایابی بێ ئازار.

﴿لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّابًـا جَـزَاءً مِّـن رَّبِّـكَ عَطَـاءً حِسَـابًا﴾ دانیشـتووانی بەهەشـت گفتوگۆی بێ سوود و گفتوگۆی درۆ نابیستن لـە نـاو بەهەشـتا، چونکـە درۆ لـەگـەل یـەکترێ

ناکەن پاداشتی چاکەیان ئەدرێتەوە لـە لایەن پەروەدگاری تۆوە بە چاکە و پاداشتێکی تەواو، بـە ئەندازەی کرداری خۆیان و زۆرتر.

﴿رَبِّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا الرحْمَنِ لَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَابًا﴾ پەروەدگاری تۆ بریتی‌یە لە پەروەدگاری ئاسمانەکان و زەوی و شتێ لـە نێوان ئاسمان و زەویدان و، پەروەدگارێکی خاوەن بەخشندەی خاوەن بەزەیییە، هیچ کەسێ توانای ئەوەی نی‌یە گفتوگۆ بکات لـە خزمەت خودا بۆ پارانەوەی خۆی، توانای رەخنەگرتنی لـە خودا نی‌یە لـە رۆژی دووایدا.

﴿يَوْمَ يَقُومُ الرُّوحُ وَالْمَلَائِكَةُ صَفًّا لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّـا مَـنْ اذِنَ لَـهُ الرحْمَـنُ وَقَـالَ صَوَابًـا﴾ ئـەو رۆژەی جبرەئیل و فریشـتـەکان بـە ریـز رائەوەسـتن بوونـەوەران توانـای گفتوگۆیـان لـە هیـچ روویەکەوە نی‌یە مەگەر کەسێ بتوانێ گفتوگۆ بکات خودای خاوەن بەخشندەیی دەستووری پێ بدا و، گفتوگۆی راست بکا و لـێی رازی بێ.

﴿ذَلِكَ الْيَوْمُ الْحَقُّ فَمَن شَاء اتَّخَذَ إِلَى رَبِّهِ مَآبًا﴾ ئەو رۆژە رۆژێکی راستە و بێگومـان پـەیدا ئەبێ کە پاشەرۆژە دووایی هەرکەسی ئارەزۆ بکا رێگەیە وەرئەگرێ بۆ خۆی بگەرێتەوە بـۆلای پەروەدەکەری خۆی.

﴿إِنَّا أَنذَرْنَاكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا يَوْمَ يَنظُرُ الْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَا لَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًـا﴾ بە راستی ئێمە ئێوەمان ترساندووە لـە سزایەکی سـەختی نزیـك، رۆژێ مـەردم تەماشـای شـتێ ئەکات و بە توانای خۆی پێشی خستووە لـە جیهاندا و، مرۆڤی بێباوەڕ ئەڵێ: خۆزگایە من هەر خاك بوومایە و زیندوو نەکرامایەوە لـەم رۆژەدا.

# ﴿ سورەتی نازیعات ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە.. ژمارەی ئایەتەکانی (٤٦) ئایەتن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرۡقٗا ﴿١﴾ وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشۡطٗا ﴿٢﴾ وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبۡحٗا
﴿٣﴾ فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبۡقٗا ﴿٤﴾ فَٱلۡمُدَبِّرَٰتِ أَمۡرٗا ﴿٥﴾ يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ
﴿٦﴾ تَتۡبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ﴿٧﴾ قُلُوبٞ يَوۡمَئِذٖ وَاجِفَةٌ ﴿٨﴾ أَبۡصَٰرُهَا
خَٰشِعَةٞ ﴿٩﴾ يَقُولُونَ أَءِنَّا لَمَرۡدُودُونَ فِي ٱلۡحَافِرَةِ ﴿١٠﴾ أَءِذَا كُنَّا
عِظَٰمٗا نَّخِرَةٗ ﴿١١﴾ قَالُواْ تِلۡكَ إِذٗا كَرَّةٌ خَاسِرَةٞ ﴿١٢﴾ فَإِنَّمَا هِيَ زَجۡرَةٞ
وَٰحِدَةٞ ﴿١٣﴾ فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ ﴿١٤﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەگەر ئێمە بیربکەینەوە لەو شتانەی خودای مەزن سوێندی‌یان پێ ئەخوا، لەبەر ئەوەیە ئادەمیزاد باوەڕ بە بوونیان ، یا بە بێ نرخیان دانەنێن، یا بە سوودەکانیان نازانن، خودای مەزن سوێندیان پێ ئەخوا، هەتا بزانن هەن و بێ‌نرخ نین و خاونی سوودی زۆرن و بەڵگەن لەسەر توانای خودا و خودای مەزن ئەفەرموێ:

﴿وَالنَّازِعَاتِ غَرْقًا﴾ من سوێند ئەخۆم بەو ئەستێرانەی دێن و ئەڕۆنبە درێژایی ساڵ لەسەر بازنەی خۆیان، بە جۆرە ڕۆیشتنێ خودا بۆی دیاری کردوون، دووای دەرکەوتنیان لەکەل ئاوا ئەبن.

زانایان جگەی ئەو مانایە بۆ ووشەی (النازعات) چەن مانای تریان بۆ باس کردووە: هاتووە بە ماانای ئەو فریشتانە گیانی بێ‌باوەڕان لە سەریانەوە دەردێنن و لەپەنجەکانیانەوە دەئەرچێ بە خنکاندنی سەخت. هاتووە بە مانای ئەو تیرانە کە لە کەوان دەرەئەچن و ئەڕوا بە لەشی بێ‌باوەراندا.

﴿وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطًا﴾ من سوێند ئەخۆم بەو ئەستێرانەی ئەوتۆ لە کەلێکەوە بە خێرایی ئەڕۆن بۆلای کەلێ‌تر. ووشەی (النَّاشِطَاتِ) هاتووە بە مانای ئەو فریشتانە کە گیانی بێ‌باوەڕان

دەرئەکێشن بە ئاسانی و گیانی بێباوەڕان ئەکێشن بە سـەختی و بـە گرانـی، بـاوەڕداران لـەو کاتەدا بەهەشت ئەبینن و، بێباوەڕان دۆزەخ ئەبینن.

﴿وَالسَّابِحَاتِ سَبْحًا﴾ من سوێند ئەخۆم بەو ئەستێرانەی مەلە ئەکەن لـە حەوادا، بە وێنـەی مانگ و ئەستێرە گەڕۆکەکان هەریەکەیان لـە بازنەی خۆیانا ئەسووڕێنەوە، ووشەی (السَّابِحَاتِ) هاتووە بە مانای ئەو فریشتانە گیانی باوەڕداران ئەکێشن بە نەرمی و لـەسەر خـۆ بـە بـێ ئـازار، دووایی وازی لێ ئەهێنن هەتا پشوێ بدا، وێنەی کەسێ مەلە ئەکا لـە ناو ئاودا.

﴿فَالسَّابِقَاتِ سَبْقًا﴾ دووایی من سوێند ئەخۆم بەو ئەستێرانەی هەندێکیان پێش هەندێ تریان ئەکەون لـە ڕۆیشتنیانا هەتا کۆتایی سوڕاندنیان بە سووڕانێکی ڕێك و پێك. ووشـەی (سَّابِقَاتِ) هاتووە بە مانای ئەو فریشتانە لـە چاکە و باوەڕدا پێشی ئادەم کەوتوون بە پێش کـەوتنی چـاك. هاتووە بە مانای گیانی باوەڕداران پێشبڕکێ ئەکەن بۆلای فریشـتەکان، هـەتا گیانیـان بکێشـن، چونکە بۆلای خۆشی بەهەشت ئەڕۆن، هاتووە بە مانای ئەو چارەویانە پێشی یەکتری ئەکەون لە کاتی جەنگدا.

﴿فَالْمُدَبِّرَاتِ أَمْرًا﴾ دووایی من سوێند ئەخۆم بەو ئەستێرانەی کار و فرمـانی دووایـی بـیری ئادەمیزاد ئەخەنەوە و، بەهۆی گۆڕانی شەو و ڕۆژەوە و وەرزەکانەوە، ڕێگە نیشـان ئـەدەن بـە ئادەمیزاد لـە دەریا و لـە زەویدا.

ووشەی (فَالْمُدَبِّرَاتِ) هاتووە بە مانای ئەو فریشتانە بەهۆی دەستووری خـوداوە کاروبـاری ئادەمیزاد بەڕێوە ئەبەن بە تایبەتی جبرەئیل و میکائیل و ئیسرافیل و عیزرائیل، هاتووە بە مانای ئەو ئاسمانە فەرمانی خودا لـە ناو ئەوانەوە دێتە خوارێ بۆ سەرە دانیشتووانی ڕووی زەوی.

چاك وایە ئێمە باوەڕمان بە فەرموودەی خودا بێ و، دیاریکردنی مەبەستی خـودا هەواڵـەی لای خۆی ئەکەین.

﴿يَوْمَ تَرْجُفُ الرَّاجِفَةُ تَتْبَعُهَا الرَّادِفَةُ قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ أَبْصَارُهَا خَاشِعَةٌ﴾ سوێندم بەو شتانەی پێشوو ئێوە زیندوو ئەکرێنەوە ڕۆژێ زەوی دێتـە لـەرزین، لـە دوای زەوی ئاسمـان ئەکـەوێ و هەموو ئەستێرەکان ئەبن بە تۆز و ئەچن بە هـەوادا، دڵـی بێبـاوەڕان بـە بینینـی ئـەو ڕۆژە بـە سەختی لێ ئەدا و، چاوی خاوەن دڵان سەرەو بەخوار و شۆڕە لـە ترسا.

﴿يَقُولُونَ أَئِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِي الْحَافِرَةِ أَئِذَا كُنَّـا عِظَامًـا نَّخِـرَةً﴾ ئـەو کەسـانەی باوەڕیـان بـە زیندووبوونەوە نیە، کاتێ بیبژرێ بەوان: بەڕاستی ئێوە زیندوو ئەکرێنەوە ئەڵێن: ئایا ئێمە چـۆن لـە گۆڕ دێنە دەرەوە و، زیندوو ئەکرێنەوە، ئایا لـە کاتێکـا ئێمـە ئێسـکی پـواو ڕزیوبـن چـۆن زیندوو ئەبینەوە؟

﴿قَالُوا تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَاحِدَةٌ فَإِذَا هُم بِالسَّاهِرَةِ﴾ بێباوەڕان بە گاڵتەوە ئەیان ووت: ئەگەر زیندوو بوونەوە ڕاستبێ، ئەو کاتە ئێمە گەڕانەوەیەکی زۆر خاوەن زیانە بۆ ئێمە لەبەر ئەوەی بەدرۆی ئەخەینەوە. دووایی خودا ئەفەرموێ: ئێوە زیندوو بوونەوە بە گران مەزانن و لەسەر خودا ئاسانە، دووایی ئەوان زیندوو ئەبنەوە بە هۆی یەك دەنگەوە لە لایەن ئیسرافیلەوە، دووایی ئەوان بە زیندوویی لەسەر ڕووی زەوین و لە دەشتێکی پاندان.

خودای مەزن دڵخۆشی پێغەمەر ئەداتەوە، ئەفەرموێ: ئارام بگرە لەسەر ئازاری ئەو تاقمە بێباوەڕە و لە سەرگاڵتە پێکردنی ئەوان بە تۆ و بە زیندووبوونەوە، فیرعەونیش ئازاری موسای زۆردا، ئەفەرموێ:

هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿١٥﴾
إِذْ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى ﴿١٦﴾ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿١٧﴾
فَقُلْ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَأَهْدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخْشَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَرَىٰهُ
ٱلْـَٔايَةَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿٢٠﴾ فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ ﴿٢١﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ﴿٢٢﴾ فَحَشَرَ
فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلْـَٔاخِرَةِ وَٱلْأُولَىٰٓ
﴿٢٥﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰٓ ﴿٢٦﴾ ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُ ۚ بَنَىٰهَا
﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّىٰهَا ﴿٢٨﴾ وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَىٰهَا ﴿٢٩﴾
وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾ أَخْرَجَ مِنْهَا مَآءَهَا وَمَرْعَىٰهَا ﴿٣١﴾
وَٱلْجِبَالَ أَرْسَىٰهَا ﴿٣٢﴾ مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ ﴿٣٣﴾

﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ مُوسَى إِذْ نَادَاهُ رَبُّهُ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ طُوًى﴾ بە ڕاستی هاتووە بۆلای تۆ هەواڵی موسا، کاتێ پەروەدگاری موسا بانگی موسای کرد لە شیوێکی پاك و بە نرخدا کە بریتیبوو لە شیوی توا. خودا فەرمانی دا بە مووسا و فەرمووی:

﴿اذْهَبْ إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى فَقُلْ هَل لَّكَ إِلَى أَن تَزَكَّى وَأَهْدِيَكَ إِلَى رَبِّكَ فَتَخْشَى﴾ تۆ برۆ بۆلای فیرعەون، یاخی بووە و لە سنوورد دەرچووە و خۆی بە گەورە دائەنێ، دووایی تۆ بە فیرعەون بڵێ: تۆ ئارەزۆ ئەکەی تۆ برۆ بۆلای ئەوەی خۆت پاك بکەیتەوە لە بت پەرستی و گوناهو بێفەرمانی خودا و، باوەڕبهێنێ و، واز لە بێفەرمانی خودا بهێنێ و، ڕوو بکەی بۆلای ناسینی خودا، موسا ڕووی بۆلای فیرعەون و ئەو شتانە پێ ڕاگەیاند و باوەڕی نەهێنا.

﴿فَأَرَاهُ الْآيَةَ الْكُبْرَى فَكَذَّبَ وَعَصَى﴾ دووایی موسا نیشانەیە گەورەی لە ڕاستی خۆی نیشاندا بە فیرعەون و داردەستەکەی بو بە مارێکی خێرا، دووایی فیرعەون باوەڕی بە موسا نەهێناوە، بێفەرمانی موسای کرد.

﴿ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَى فَحَشَرَ فَنَادَى فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَى﴾ لە پاشانا فیرعەون وازی لە موسا هێنا و پشتی تێکرد و پیلانی ساختە هێنا لە دژی موسا، دووایی فیرعەون و جادوگەران و سوپای خۆی کۆکردەوە و، هەڵسایە پێی و بانگی تاقمەکەی خۆی کرد و، دووایی بەوانی ووت: من پەروەدگاری هەرە گەورەی ئێوەم.

﴿فَأَخَذَهُ اللَّهُ نَكَالَ الْآخِرَةِ وَالْأُولَى إِنَّ فِي ذَلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَى﴾ دووایی خودا فیرعەون و تاقمەکەی گرتن و سزای‌دان لە پاشەڕۆژدا بە سوتانی ئاگری دۆزەخ و، لە جیهاندا بە خنکاندنی ئاو. بە ڕاستی ئەو شتەی خودا کردی بە فیرعەون و تاقمەکەی پەند و ئامۆژگاری‌یە بۆ کەسێ لە خودا بترسێ.

بە ڕاستی یاخی‌بوونی کاربەدەستان، هۆی نادانی و بێنرخی گەلەکەیتی، ئەگینا ئەو تاقە کەسێکە ناتوانێ ستەمی زۆر بکا لە دانیشتووان. بەڵام گەلە بێنرخەکەی سەری بۆ شۆڕ ئەکەن و یاریدەی ئەدەن و ئەیپەرستن و ئەویش لە خۆی بایی ئەبێ و پەت ئەپچڕێنێ و، بە ئارەزۆی خۆی ئەوەی بیەوێ ئەیکا. کەواتە ئەو گەڵە بێ نرخە وەك کاربەدەستەکانیان تاوانبارن.

﴿أَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَاءُ﴾ لە پاشانا خوا هەڕەشە لەو کەسانە ئەکات باوەڕیان بە زیندووبوونەوە نی‌یە، ئەفەرموێ: ئایا ئێوەی باوەڕ درووستکردنتان گرانە یا ئاسمان. بێگومان درووستکردنی هەردوولایان لای خودا گران نی‌یە. بەڵام درووستکردنی بێباوەڕان ئاسانتر لە پاشانا خودا باسی چۆنیەتی درووستکردنی ئاسمان ئەکا و، ئەفەرموێ:

﴿بَنَاهَا رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا﴾ خودا ئاسمانی درووست کرد بە جۆرێ خودا ئەندازەی سەقفێ ئاسمانی بەرزکردووەتەوە لە زەوی، دووایی خودا ئاسمان و ئەستێرەکانی ڕێك و پێك کردووە، هەریەکەیانی لە جێگەی سروشتی خۆیانا دانا، بە جۆرێ هەر یەکەیان لەسەر بازنەی تایبەتی خۆیان ئەسورێنەوە.

﴿وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا﴾ وە خودا شەوی ئاسمانی تاریك کردووە بە هۆی ئاوابوونی خۆرەوە و، خودا ڕووناکی ئاسمانی دەرخستووە بە هۆی هەڵهاتنی خۆرەوە، بە درێژایی ساڵ بەردەوامن.

﴿وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءَهَا وَمَرْعَاهَا﴾ وە خودا دووای درووست کردنی ئاسمان زەوی ئامادەی کردو ڕای‌خست بە جۆرێ شایستەبی بۆ دانیشتن لەسەری، زەوی هەرچەندە بە ڕواڵەت بە پانی ئەبینرێ لەبەر گەورەیی. بەڵام لە ڕاستیدا خڕە وەك هێلکە و، خودا دەری هێناوە لە زەویدا ئەو ئاوەی لە هەوری ئاسمانەوە ئەڕژایە سەر زەوی و هەندێکی ئەچووە ناوی و، دەری هێنا گیا و ڕووەك و درەختی زەوی، بۆ خواردنی خۆتان و ئاژاڵەکانتان.

﴿وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ﴾ وە خودا کێوەکانی دانا لەسەر زەوی هەتا نەجوڵێ و ئێوە ئازارتان پێ بگا لە ناو بچن، خودا زەوی ڕاخست و ئامادەکرد و ئاوی لێدەرهێنا و، ڕووەك و گیای لێ ڕواند، لەبەر خۆش گوزەرانی خۆتان و، بۆ ژیانی چوارپێکانتان.

خودای مەزن ئاسمان و شەو و ڕۆژ و زەوی و ئاو و لەوەڕ و گیا و کێو و خۆر و مانگ درووست کردوون هەموویان لەبەر سوودی خۆتان و ئاژاڵەکانتان؛ بۆ ئەوەی ئێوە باوەڕ بە خودا و بە زیندووبوونەوە بهێنن، ئێوە بیر لە ڕۆژی دوایی بکەنەوە و، خۆتانی بۆ ئامادە بکەن، ئەو ڕۆژەیە خودا باسی ئەکا و ئەفەرموێ:

فَإِذَا جَاءَتِ الطَّامَّةُ الْكُبْرَى ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يَتَذَكَّرُ الْإِنسَانُ مَا سَعَى ﴿٣٥﴾ وَبُرِّزَتِ الْجَحِيمُ لِمَن يَرَى ﴿٣٦﴾ فَأَمَّا مَن طَغَى ﴿٣٧﴾ وَآثَرَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ الْجَحِيمَ هِيَ الْمَأْوَى ﴿٣٩﴾ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى ﴿٤١﴾ يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا ﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَاهَا ﴿٤٣﴾ إِلَى رَبِّكَ مُنتَهَاهَا ﴿٤٤﴾ إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَاهَا ﴿٤٥﴾ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَاهَا ﴿٤٦﴾

﴿فَإِذَا جَاءَتِ الطَّامَّةُ الْكُبْرَى يَوْمَ يَتَذَكَّرُ الْإِنسَانُ مَا سَعَى﴾ دووایی کاتێ ڕۆژی دوایی گەورە هات، هەموو شتێ بە ئاسمان و بە زەوییەوە کاول ئەکا و، جگە لە درووستکەری هەموو بوونەوەران کەسی تر نامێنێتەوە، لە زمانی عەرەبدا بە ووشەی (الطَّامَّةُ) بە مانا بەڵایەکە ڕێگەی بێ ناگیرێ. بەڵام ڕۆژی دوایی لە هەموویان گەورەترە، ڕۆژی دوایی ئەو ڕۆژەیە ئادەمیزاد بیری شتێ ئەکاتەوە لە جیهاندا کردوویەتی لە کردەوەی چاك و خراپ و، ڕای کردووە بۆلایان.

﴿وَبُرِّزَتِ الْجَحِيمُ لِمَن يَرَى فَأَمَّا مَن طَغَى وَآثَرَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا فَإِنَّ الْجَحِيمَ هِيَ الْمَأْوَى﴾ وە دۆزەخ ئاشکرا ئەکرێ بۆ هەموو کەسێ ببینێ بە بێ پەردە و، بە بێ پاسەوان، دوویی هەر کەسێ لە سنوور دەرچووبێ لە جیهاندا و، باوەڕ بە خودا و ڕۆژی دوایی نەهێنابێ و، زیندەگانی جیهان و ڕابواردنی بۆ خۆی هەڵبژاردبێ، دووایی بە ڕاستی دۆزەخ جێگەی گەڕانەوە دانیشتنی ئەو کەسەیە.

﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى﴾ وە هەرکەسێ ترسابێ لە ڕاوەستانی لەبەردەم پەروەدگاری خۆیا و، ویستبێتی گوناهێ بکا و خۆی لە دواکەوتنی ئارەزۆی دەروونی خراپی خۆی قەدەغەکردبێ و، ئەو گوناهەی نەکردبێ، دووایی بە ڕاستی بەهەشت جێگەی گەڕانەوەی دانیشتنی ئەو کەسەیە.

﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَاهَا﴾ بێباوەڕان پرسیار لە تۆ ئەکەن چ کاتێ ڕۆژی دووایی بەرپا ئەبێ، تۆ لە ناو چ شتێکای لە بیرکردنـەوە و باسی ڕۆژی دووایی، زانینی ئە ڕۆژە پەیوەندی بە تۆوە نییە، نە تۆ و نە جگەی تۆ نازانن چ کاتێ بەرپا ئەبێ.

﴿إلى ربك منتهاها إنما أنت منذر من يخشاها﴾ بۆلای پەروەدگاری تۆ بە ئەوپەری زانینی کاتی پەیدابوونی پاشەرۆژ. بە ڕاستی تۆ هەر ئەوەت لەسەرە بەو کەسە ڕابگەیەنێ لە سەختی ڕۆژی دووایی ئەترسێ کە ڕۆژی دووایی بە بێگومان بەرپا ئەبێ.

ئەو بێباوەڕانە ئامۆژگاری تۆ کاریان تێ ناکا، وازیان لێ بهینە هەتا تووشی ڕسوایی خۆیان ئەبن، لە ناکاودا تووشی ڕۆژی دووایی ئەبن لە بیریان نامینێ چەند کات لە جیهاندا بوون و، وەك خودا ئەفەرموێ:

﴿كأنهم يوم يرونها لم يلبثوا إلا عشية أو ضحاها﴾ بێباوەڕان بەو جۆرەن کاتێ ڕۆژی دووایی ئەبینن، وا ئەزانن لە جیهاندا دانەنیشتوون جگە لە کاتیکی کەمی ئیوارە، یا کاتیکی کەم لە ڕۆژی جیهان.

بێباوەڕان کاتێ ڕۆژی دووایی ئەبینن بروای بیگومان پەیدا ئەکەن بە بوونی و وا ئەزانن ڕاستەو جیگەی مانەوەی بەردەوامە و، جیهان ڕیگەی ڕۆیشتن بوە بۆلای ئەو ڕۆژە وجیهان بلقی سەر ئاو بووە.

**بە یاریدەی خودا کۆتایی بە ماناکردنی هات، لە کاتیکا پارتی کریکارانی کورد و یەکیتی نیشتمانی کوردستان خەریکی جەنگبوون لە دژی یەکتری و، دیارە نەگبەتی کوردانە ( ڕۆژی ٣ی جیمادی دووهەمی کۆچی ) سالی ( ١٤٢١ ) ٢٠٠٠/٩/٣٠ زایینی**

# ﴿ سورەتی عەبەسە ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٤٢) ئایەتن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ أَوْ
يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ﴿٤﴾ أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾
وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴿٩﴾ فَأَنتَ
عَنْهُ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾ كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴿١١﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿١٢﴾ فِى صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ
﴿١٣﴾ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍۭ ﴿١٤﴾ بِأَيْدِى سَفَرَةٍ ﴿١٥﴾ كِرَامٍۭ بَرَرَةٍ ﴿١٦﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان**

ئەگێرنەوە جارێك پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە مەککەدا دانیشتبوو کۆمەڵێ لە گەورە پیاوانی قورەیش لە خزمەتیا بون، وەك عەتبە و شەیبە و کوڕانی ربیعە، ئەبو جەهل و وەلیدی کوڕی موغەیرە و، جگەی ئەوانیش لەو کاتەدا کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئامۆژگاری ئەکردن و، ئەی ترساندن لە پاشەڕۆژی خراپی بت پەرستی و ستەمکاری و، بەڵێنی پێ‌ئەدان ئەگەر موسڵمان بن چاکەی هەردوو جیهانیان دەست ئەکەوێ و، ئومێدەواربوو خودا شارەزاییان پێ ببەخشێ و ببنە هێز بۆ ئیسلام، یا بەلای کەمەوە واز لە خراپە بهێنن و، ئەو کاتە موسڵمانان لاوازبوون و لە ناو ئازاری بت پەرستاندابوون، لەو کاتەدا پیاوێکی کوێری هەژار هاتوو فەرموودەکانی پێغەمبەر بڕی و ووتی: شتێکم فێربکە لەوەی کە بۆت هاتووە کە سوودی لێ وەربگرم، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ وولامی نەدایەوە، لەسەر فەرموودەکانی خۆی ڕۆیشت لەگەڵ کۆمەڵی قورەیشی‌یەکان، ئەو کوێرە گفتوگۆی خۆی سێ‌جار دووپات کردەوە، بەو بۆنەوە پێغەمبەر ڕووی خۆی گرژکرد و، ڕووی لێ وەرگێڕا، خودای مەزن سەرزەنشی پێغەمبەری کردوو فەرمووی: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ﴾.

زانایان بیریان جیاوازە بۆ دیاری‌کردنی ئەو کوێرە هەژارە، زۆربەی ززۆریان لایان وایەئیبنو مەکتومی هاوڕێی پێغەمبەر و خاڵۆزای خەدیجەی ژنی بووە، هەندێ لە زانایان ئەڵێن: جگەی ئیبنو مەکتومبووە.

هەروەها زانایان بیریان جیاوازە لە دیای‌کردنی ئەو کەسەی ڕووی وەرگێڕا لەو هەژارە و، ئەڵێن:

کەسێکی دیاری نەکراوە، چونکە خودا ئەفەرموێ ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّى﴾ بە ڕاناوی نادیاری. بەڵام ئەوەی بە ناوبانگیێ لە ناو زانایانا ئەڵێن: ئەو کەسە پێغەمەر بووە، ئەوەتە خودا ئەفەرموێ: ﴿فَأَنتَ لَهُ تَصَدَّى﴾ بە ڕاناوی ڕووبەڕو، بەهەر جۆرێ بێ پێغەمەر خاوەنی هەست و کۆششی خۆیەتی و سەربەستە، بۆ پەرەپێدانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، بۆیە وولامی ئەو کوێرەی نەدایەوە، هەتا ئەو هەلەی لە دەست دەرنەچێ و بە دەست کەوتی زانیوە و، ویستوویەتی لە کیسی نەچێ لەبەر بەرژەوەندی گشتی ئیسلام، نەك بۆ سوودی تایبەتی خۆی و، فێرکردنی فەرموودەکانی خودا کاتی دیاری‌کراوی بۆ نیە و لە کیس ناچی و ئەتوانرێ هەموو کاتێ جی‌بەجێ بکرێت. بەڵام کاتی باوەڕهێنانی بێباوەڕان تەسکە و لە دەست دەرئەچێ و، لە لایە ترەوە خودا بە فەرموودەی خۆی ئاماژە بۆ ئەوە ئەکا جیاوازی پلەو پایە و ساماندراری پوچ بکاتەوە و، لە جیهاندا ئادەمیزاد یەکسانن و، هەژار و ساماندار وەك یەك وان، خودای مەزن بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو ڕووداوە بە درێژی ڕوونی ئەکاتەوە و ئەفەرموێ:

﴿عَبَسَ وَتَوَلَّى أن جَاءَهُ الْأَعْمَى﴾ پێغەمەر ناوچاوانی خۆی گرژ کرد و، ڕووی وەرگێڕا لەبەر ئەوەی ئەو کوێرە هات بۆلای، چونکە ئەو خەریکی شتێ بوو گرنگبوو کە سوودی گشتی تێدا ئەبینی کە باوەڕهێنانی سەرۆکەکانی قورەیش بوو. ئەو پیاوە کوێرە ناوی عەبدوڵای کوڕی مەکتومە، یەکێ بووە لە کۆچکەران و، بانگ وێژی پێغەمەر بووە. زۆر جار پێغەمەر لە جێی خۆی دای ئەنا بۆ پێشەوایی موسڵمانان بۆ نوێژکردن، خودا بۆ ئەوەی ناوی بردووە بە کوێر، هەتا ئاماژە بفەرموێ بۆ ئەوەی خاوەنی بیانوە.

لەوانەیە پرسیار بکرێ: ئەبوایە سەرزەنشتی ئەو کوێرە بکرایە نەك جگەی ئەو، لە وولامدا ئەبێژرێ: لەوانەیە هەڕەشە بێ لە بێباوەڕان و دانانیانە بە بێ نرخ کە پێغەمەر ئامۆژگاری‌یان ئەکا و باوەڕ ناهێنن، نەك سەرزەنشت و لۆمەکردنی پێغەمەر و ئەو پیاوە کوێرە.

﴿وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ يَزَّكَّى أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ الذِّكْرَى﴾ وە چ شتێکە تۆ وا لێ بکا بزانی چۆنیەتی مەبەستی ئەو کوێرە بناسی، لەوانە بوو ئەگەر تۆ وولامی ئەو کوێرەت بدایەتەوە، پاك ئەبووەوە لە گوناه، بەو گفتوگۆیەی تۆ، یا بیری ئەو بکەوێتەوە شتێ لە بیری چووەتەوە، دووایی ئامۆژگاری کردنی تۆ و بیرخستنەوەکەی سوودی پێ ئەبەخشی.

﴿أَمَّا مَنِ اسْتَغْنَى فَأَنتَ لَهُ تَصَدَّى وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّى﴾ تۆ بۆ واز لە ئامۆژگاری کەسێ ئەهێنێ خودا ئەزانێ ئەو پێویستی بەو شتە هەیە لای تۆیە، دووایی تۆڕ و ئەکەی بۆلای کەسێ

خۆی بەوە نابینێ، پێویستی بە خودا و بە تۆ هەبێ، بەهۆی پەو پلە و سامانی خۆیەوە و، بە ئومێدی ئەوەی باوەڕبهێنێ، هیچ زیانێ تووشی تۆ و ئیسلام نابێ کە ئەو باوەڕ نەهێنێ و شانازی بە سامانی خۆیەوە بکا.

﴿وَأَمَّا مَن جَاءَكَ يَسْعَى وَهُوَ يَخْشَى فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّى﴾ وە بەلام ئەو کەسەی بە گورجی ڕائەکا دێت بۆلای تۆ و، لە خودا ئەترسێ بە وێنەی ئەو پیاوە کوێرە، دووایی واز لەو ئەهێنێ، خۆت خەریك ئەکەی بە بت پەرستانەوە، بە ئومێدی ئەوەی ئەوان ئیسلام ببن و ڕانومایی وەرگرن، نیازت وانەبێ کە کات فراوانە بۆ فێرکردنی فەرمانی خودا بەو پیاوە کوێرە، واز لە تاوانباران بهێنە، خودا تۆڵەیان لێ ئەکاتەوە.

﴿كَلَّا إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ فَمَن شَاءَ ذَكَرَهُ﴾ تۆ جارێ تر کاری بەو جۆرە مەکە. بە ڕاستی ئایەتەکانی قورئان ئامۆژگاری کردنە بۆ ئادەمیزاد، دووایی هەرکەسێ ئارەزۆ ئەکا با ئامۆژگاری قورئان وەربگرێ و یادی خودا بکات.

بە ڕاستی یاریدەی کەسێ نادا خۆی وا تەماشا بکا پێویستی بە خودا و بە تۆ و، بە ئامۆژگاری قورئان نییە. بەلام خودا یارمەتی پیاوچاکان ئەدا، با کوێر و هەژاریشن. لە پاشانا خودای مەزن باسی ڕانومایی و وانەکانی و فەرمانەکانی قورئان ئەکا و ئەفەرموێ:

﴿فِي صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍ﴾ قورئان نووسراوەتەوە، تۆمارکراوە لە چەند پەڕەیەکدا، شایستە و خاوەنی ڕێزە لای خودا، وانە و فەرموودەکانی بالا و بەسوودە، پاکە لە هەموو شتێکی پوچ و گومرایی.

﴿بِأَيْدِي سَفَرَةٍ كِرَامٍ بَرَرَةٍ﴾ پەڕەی ئەو قورئانە بە دەست چەند نوێنەرێکی زۆر بەڕێزن، لە خودا ترسن، بە وێنە فریشتەکان و پێغەمەران، لە لایەن خۆیانەوە ئەپارێزن و ڕای ئەگەینن بە ئادەمیزاد.

قُتِلَ الْإِنسَانُ
مَا أَكْفَرَهُ ﴿١٧﴾ مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ ﴿١٨﴾ مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ ﴿١٩﴾ ثُمَّ
السَّبِيلَ يَسَّرَهُ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ أَمَاتَهُ فَأَقْبَرَهُ ﴿٢١﴾ ثُمَّ إِذَا شَاءَ أَنشَرَهُ ﴿٢٢﴾ كَلَّا لَمَّا
يَقْضِ مَا أَمَرَهُ ﴿٢٣﴾ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَىٰ طَعَامِهِ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا
﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴿٢٨﴾
وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴿٢٩﴾ وَحَدَائِقَ غُلْبًا ﴿٣٠﴾ وَفَاكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾ مَّتَاعًا لَّكُمْ
وَلِأَنْعَامِكُمْ ﴿٣٢﴾ فَإِذَا جَاءَتِ الصَّاخَّةُ ﴿٣٣﴾ يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾

وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ يَوۡمَئِذٖ شَأۡنٞ
يُغۡنِيهِ ﴿٣٧﴾ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ مُّسۡفِرَةٞ ﴿٣٨﴾ ضَاحِكَةٞ مُّسۡتَبۡشِرَةٞ ﴿٣٩﴾ وَوُجُوهٞ
يَوۡمَئِذٍ عَلَيۡهَا غَبَرَةٞ ﴿٤٠﴾ تَرۡهَقُهَا قَتَرَةٌ ﴿٤١﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَفَرَةُ ٱلۡفَجَرَةُ ﴿٤٢﴾

﴿قُتِلَ الْإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ﴾ یا خودابێ بەهرە و بێ بەشبێ لە میهرەبانی خودا و نەمێنێ ئەو ئادەمیزادە، بێباوەڕ و خاوەن دارایی‌یە. خۆی بەسەر هەژاراندا، هەڵەئکێشێ، چ شتێ پاڵی پێوە ناوە، بەوەی باوەڕ نەهێنێ بە خودا، لەگەڵ ئەو هەمووە چاکەیەدا خودا داوییە بەو، زۆر سەیر و سەرسوڕێنەر ئەو شتە.

﴿مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ﴾ بۆ بیر لە خۆی ناکاتە خودا لە چ شتێ ئەوی درووست کردووە، هەتا واز لە پەرستنی خودا بهێنێ، خودا ئەوی درووست کردووە لە ئاوێکی بێ نرخ، دووایی خودا ئەندازەی لەشی دیاری کردووە، ڕێکی خستووە ئەندامەکانی، بە جۆرێ شیاوی یەکترین، لە پاشانا ڕێگەی چاکە و خراپەی بۆ ئامادەکردووە، ئەقڵی داوەتێ، کامیان بۆخۆی هەڵەئبژێری سەربەستە.

﴿ثُمَّ أَمَاتَهُ فَأَقْبَرَهُ ثُمَّ إِذَا شَاء أَنشَرَهُ﴾ لە پاشانا خودا دوای تەمەنی دیاریکراوی ئەی مرێنێ، لە پاشانا خودا فەرمان ئەدا بیخەنە گۆڕەوە و، وازی لێ نەهێنرێ گیاندارانی کێوی بیخۆن و، دووای مردنیش ڕێزی لێئەگیری، لە پاشانا هەرکاتێ خودا ئارەزۆی کرد دوای مردنی زیندووی ئەکاتەوە. ئادەمیزادی بەو جۆە بێ، جێگەی سەرسوڕما نەبێ فەرمانی خودا بکا و باوەڕ نەهێنێ و خودا نەپەرستێ. درووستکردنی بێ هۆدە نی‌یە.

﴿كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَا أَمَرَهُ﴾ ڕاست و بێگومانە ئادەمیزاد جێبەجێی نەکردووە شتێ خودا فەرمانی پێداوە، هەموو توانای پێ بەخشیوە بۆ کردنی کاری چاك و، بڕوبیانوومان بۆ نەهێشتووەتەوە، لەگەل ئەوەیشدا زۆربەی ئادەمیزاد کەمتەرخەمی ئەکەن، زۆریان یاخی ئەبن و چاکەی خودا بە کار ئەهێنن لە خراپەدا، پەلاماری دانیشتووانی بێتاوان ئەدەن و ستەمیان لێ ئەکەن، دووایی ئەگەر بەوانەی پێشوو لە خودا ناترسێ.

﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَى طَعَامِهِ﴾ ددوایی یا ئادەمیزاد تەماشای لای خواردەمەنی خۆی بکا کە ئەبێتە هۆی ژیانی خۆی و، پێ ڕائەبوێرێ و، پرسیار لە ئەقڵی خۆی بکا چ کەسێ ئەو خواردەمەنیانەی بۆ درووست کردووە؟

﴿أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاء صَبًّا ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا﴾ خواردەمەنی‌یەکەی بەم جۆرە بۆ ئامادەئەکەین، کە بە ڕاستی ئێمە ئاومان پەیداکردووە ئەیڕێژینە خوارەوە زۆر بە خوڕی و بە تەوژم و بەتین. لە پاشانا ئێمە زەویمان قڵیشاندووە بەهۆی سەوزبوون و سەردەرهێنانی گیاو ڕووەکەوە، بە قڵیشانێ شیاوی ئەو ڕووەکانە بێ.

﴿فَأَنبَتْنَا فِيهَا حَبًّا وَعِنَبًا وَقَضْبًا وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا وَحَدَائِقَ غُلْبًا وَفَاكِهَةً وَأَبًّا مَّتَاعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ﴾ دووایی ئێمە ڕواندوومانە لە ناو زەویدا بەهۆی ئەو ئاوەوە دانەوێڵە و، تریێ و، سەوزەیە بە تەڕی ببڕی و بخورێ، وەك هەموو سەوزیە، هەر لە کەوەرەوە، هەتا قارچك و ڕێواس و سەوزەی تر و زەیتوون و، خورما و باخ و باخاتی چڕ و پڕ. میوەی هەمەجۆر و، لەوەڕگا و گیا لەو جۆرەی ئادەمیزادانەی چێناوە و، ئاژاڵەکانیان ئەیخۆن، ئەوانەی باسکران هەموویان بۆ سوودی ژیانی ئێوەیە، هەندێکیان بۆ خۆتان و هەندێ تریان بۆ مانەوەی ئاژاڵ و چوارپێ‌کانتان.

دووای ئەوانەی جیهان نۆرەی باسی ڕۆژی دووایيە، خودا ئەفەرموێ:

﴿فَإِذَا جَاءتِ الصَّاخَّةُ﴾ دووایی کاتێ لە ڕۆژی دووایدا دەنگێکی سەخت پەیدا ئەبێ هەموو گوێچکەکان کەڕ ئەکاتەوە ئەوەندە سەخت و گرانە.

ووشەی (الصَّاخَّةُ) بە دەنگێك ئەڵێن: دوو شتی ڕەق لە یەك بدەن. بێگومان ڕۆژی دووایی ئاسمان و ئەستێرەکان کێشیان نامێنێ، زەوی بە کێوەکانییەوە لەگەڵ ئەستێرەکانی تر لە یەك ئەدەن، لەو کاتەدا گرمە و شاخە پەیدا ئەبێ، هیچ گیاندار و گوێچکەی بەرگەی ناگرێ، لەبەر ئەوەی دەنگەی زۆر تیژ و سەخت و بێ وێنەیە لە گەورەییدا.

﴿يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ وَأُمِّهِ وَأَبِيهِ وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيهِ﴾ ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە هەموو کەسێ ڕائەکا و هەڵدێ لەبرا و، دایك و، باوك و، ژن و، کوڕی خۆی، دۆست و خزمایەتی لەو ڕۆژەدا نی‌یە.

﴿لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ﴾ بۆ هەموو ئادەمیزادێ لەوان لەو ڕۆژەدا کارێکی تایبەت بە خۆیانەوە هەیە، بەو کارەوە خەریکن و، وازی لە جگەی خۆیانی پێ هێناوە. بێگومان ئادەمیزاد واز لەو کەسانە ئەهێنن یارمەتیان داون لەسەر کاری خراپ، یا باوەڕدار نەبن، بە وێنەی هابیل لە برای ڕائەکا و، ئیبراهیم لە باوکی و، نوح لە کوڕ و ژنەکەی، لوت لە ژنەکەی خۆی و، ئاسیيە لە فیرعەنی مێردی، چەن کەسێ هەن لەو ڕۆژەدا ڕوویان گەشە، دەمیان بە پێ‌کەنین، شادمانن و دڵخۆشنن لەبەر ئەو شتەی خودا بەخشیویە بەوان.

﴿وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ أُوْلَئِكَ هُمُ الْكَفَرَةُ الْفَجَرَةُ﴾ وە چەند ڕوومەتێ هەن لەو ڕۆژەدا تۆز بەسەر ڕوومەتیانەوەیە و، خەفەتبارن، ڕەنگی ڕەش دای ئەپۆشێ، چونکە کردەوەی خراپی زۆریان کردووە لە جیهاندا، ئەو کەسانەن بێ‌باوەڕبوون لە جیهاندا، لە سنووری ئایین دەرچوون.

# ﴿ سورەتی تەکویر ﴾

لە مەکە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٢٩) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ ﴿١﴾ وَإِذَا النُّجُومُ انكَدَرَتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا الْجِبَالُ
سُيِّرَتْ ﴿٣﴾ وَإِذَا الْعِشَارُ عُطِّلَتْ ﴿٤﴾ وَإِذَا الْوُحُوشُ حُشِرَتْ
﴿٥﴾ وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ ﴿٦﴾ وَإِذَا النُّفُوسُ زُوِّجَتْ ﴿٧﴾ وَإِذَا
الْمَوْءُودَةُ سُئِلَتْ ﴿٨﴾ بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَتْ ﴿٩﴾ وَإِذَا الصُّحُفُ نُشِرَتْ
﴿١٠﴾ وَإِذَا السَّمَاءُ كُشِطَتْ ﴿١١﴾ وَإِذَا الْجَحِيمُ سُعِّرَتْ ﴿١٢﴾ وَإِذَا الْجَنَّةُ
أُزْلِفَتْ ﴿١٣﴾ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا أَحْضَرَتْ ﴿١٤﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان**

خودای مەزن لەو ئایەتانەی سەرەوەدا ئاماژە بۆ هەندێ ڕووداو و کارەساتی ترسناك ئەکات، لە کاتی پرسیار و وولاّم و پاداشت لە ڕۆژی دووایی‌دا پەیدا ئەبن کە (١٢) ڕووداون و، ئەفەرموێ:

﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ وَإِذَا النُّجُومُ انكَدَرَتْ﴾ هەرکاتێ خۆر پێچرایەوە و، وونبوو دوای ئەوەی بە چاو ئەبینرا و، لە ناو چوو لەبەر نەمانی هێزی کێشانی و، سارد بوویەوە و، ڕووناکی نەما و، کاتێ ئەستێرەکان ئەم دیودیوکران و کەوتنە خوارەوە و، پرژ و بلاّوبوون.

﴿وَإِذَا الْجِبَالُ سُيِّرَتْ وَإِذَا الْعِشَارُ عُطِّلَتْ﴾ وە هەرکاتێ کێوەکان لە جێگەی خۆیانا هەڵکەنران و بوون بە تۆز و، چوون بە هەوادا وەك هەوا لەگەڵ زەوی‌دا و، کاتێ ئەو هوشترانە کە دە مانگ تێپەڕیوە بەسەر ئاوس بوونیانا وازی لێ هێنراوە بەبێ شوان ئەسووڕێتەوە کە زۆر بە نرخە لایان و، هەموو کەسێ خەریکی خۆیەتی.

هەندێ لە زانایان بەم جۆرە مانای (وَإِذَا الْعِشَارُ عُطِّلَتْ) کراوە (وە هەرکاتێ هەورەکان لە باران بارین وازیان لیهێنرا و، بارانیان لێ نەئەهاتە خوارەوە، چوونکە پەیرەو و دەستووری جاران تێك و پێك بووە، هەتا هەور بارانی لێ بێتە خوارەوە، هەور و تیشکی خۆر و هەڵمی ئاو نەماوە).

﴿وَإِذَا الْوُحُوشُ حُشِرَتْ وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ﴾ وە کاتێ گیاندارانی کێوی لە ترسی نـەمانی زەوی ڕائەکەن بەم لاو بەو لادا، ترسیان لە خۆیان و لە ئادەمیزاد نیـیـە و جێگەیـە نادۆزنـەوە پشووی تێدا بدەن و، دووایی هەموویان لـە ترسـانا ئـەمرن و، کاتـێ هـەموو دەریاکـان گـەرم ئەکرێن و ئەرژێنە ناو یەکتری و ئەبن بە یەك زەریا و، لەبەر کاولوبوونی زەوی، هیچ شتێ نی‌یە ڕێگەیان لێ بگرێ و تێکەڵاوی یەکتری ئەبن.

مانای ڕستەی (وَ إِذَا الْبِحَارُ سَجِّرَتْ) بەم جۆرەیش کراوە: یانێ هەرکاتێ دەریاکـان گڕیـان گرت بەهۆی ئاگری ناو زەوی، لە کاتێکا زەوی پارچە پارچە ئەبێ و، ئـاو و ئـاگری تێکـەڵاو ئەبن و، دەریاکان گڕ ئەگرن.

﴿وَإِذَا النُّفُوسُ زُوِّجَتْ وَإِذَا الْمَوْؤُودَةُ سُئِلَتْ بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَتْ﴾ وە هـەرکاتێ گیـانی هـەموو ئادەمیزادێ گەڕایەوە بۆلای لە شەیتانەکانیان و، جـووت بوونـەوە لەگـەڵ یـەکتری و، کاتـێ پرسیار کرا لـەو کچە منالانەی زیندە بە چاڵ ئەکرێن، لەبەر چ گوناهێ کوژراون؛ بە ڕاستی لە ڕۆژی دووایی‌دا زیندوو ئەکرێنەوە، پرسیاریان لێ ئەکرێ بۆ ئێوە کوژران و، گوناهتـان چ شتـێ بووە.

﴿وَإِذَا الصُّحُفُ نُشِرَتْ وَإِذَا السَّمَاءُ كُشِطَتْ وَإِذَا الْجَحِيمُ سُعِّرَتْ﴾ وە هـەرکاتێ نامـەی کردارەکانی ئادەمیزاد کرانەوە و، نامەی هەموو کەسـێ درا بـە دەسـتی خۆیـەوە و، هـەرکاتێ ئاسمان لابرا و، ئەستێرەکان وونبوون لە ناو ئاسماندا و، هەرکاتێ دۆزەخ گەرم کرا.

﴿وَإِذَا الْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا أَحْضَرَتْ﴾ وە هرکاتێ بەهەشـت نزیـك کـرایەوە بـۆ خاوەنەکانیان؛ چونکە بۆ ئـەوان ئامـادەکراوە، دووای ئـەو دوازدە ڕووداوانـە هـەموو کەسـێ ئەزانێ بە شتێ ئامادەی کردووە بۆ خۆی.

فَلَا أُقْسِمُ بِالْخُنَّسِ ﴿١٥﴾
الْجَوَارِ الْكُنَّسِ ﴿١٦﴾ وَاللَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ ﴿١٧﴾ وَالصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ ﴿١٨﴾
إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴿١٩﴾ ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي الْعَرْشِ مَكِينٍ ﴿٢٠﴾ مُطَاعٍ
ثَمَّ أَمِينٍ ﴿٢١﴾ وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ رَآهُ بِالْأُفُقِ الْمُبِينِ
﴿٢٣﴾ وَمَا هُوَ عَلَى الْغَيْبِ بِضَنِينٍ ﴿٢٤﴾ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَانٍ رَّجِيمٍ ﴿٢٥﴾
فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ ﴿٢٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿٢٧﴾ لِمَن شَاءَ مِنكُمْ أَن
يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٢٩﴾

﴿فَلَا أُقْسِمُ بِالْخُنَّسِ الْجَوَارِ الْكُنَّسِ﴾ دووایی بە ڕاستی من سوێند ئەخۆم بەو ئەستێرانەی ئەوتۆ بە ڕۆژدا لەبەرچاو ون ئەبن و نابینرێن، بە شەودا بە چاو ئەبینرێن، بە شەو و ڕۆژدا ئەسووڕێنەوە و دەرئەکەونەوە.

﴿وَاللَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ وَالصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ﴾ وە سوێند ئەخۆم بەو شەوەی کاتێ تاریکییەکەی ڕوو ئەکاتە سەر زەوی و، سوێند ئەخۆم بە بەیانێ کاتێ ڕووناکییەکەی پەخش ئەبێتەوە بە زەویدا و، هەموو شتێ ئەگرێتەوە.

﴿إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي الْعَرْشِ مَكِينٍ﴾ سوێندم بەوانەی باسکران. بە ڕاستی قورئان گفتوگۆی نێردراوێکی بەڕێزە لە لای خودا و، فەرمانی پێدراوە ڕای بگەیەنێ بە پێغەمەری خۆی، خاوەنی هێزێکی یەکجار زۆرە لای خودای خاوەن پلە، هێزێکی وای هەیە ئەو فریشتەیە چوار گوندی تاقمی لوتی ژێراوژوور کرد، جبرەئیل فریشتەیەکە خاوەنی پلەوپایەی بەرزە لای خاوەنی هەموو بوونەوەران.

﴿مُطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ﴾ ئەو فریشتەیە جبرەئیلە لەو جێگەیە فریشتەکان پەیڕەوی ئەکەن و لە فەرمانی دەرناچن و، هاوڕێکەی ئێوە کە موحەممەدە شێت نییە، بە گوێرەی گومانی بێباوەڕان.

﴿وَلَقَدْ رَآهُ بِالْأُفُقِ الْمُبِينِ وَمَا هُوَ عَلَى الْغَيْبِ بِضَنِينٍ﴾ وە بە ڕاستی پێغەمەر جبرەئیلی بینیوە لەسەر ئەو دیمەنەی خودا درووستی کردووە لە ئاسۆی ئاشکرادا لە لای سەرەوەی خۆر هەڵات کە جێگەی هەڵهاتنی خۆرە، موحەممەد لەسەر ڕاگەیاندنی سروش و جگەی سروش لەو شتانەی نابینرێن گومانی لێ ناکرێن و ڕژد و چرووك نییە، ئەوەی لای خوداوە جبرەئیل بۆی بهێنێ بە ئادەمیزادانی ڕائەگەیەنێ.

﴿وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَانٍ رَجِيمٍ فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ﴾ وە ئەو قورئانە گفتوگۆی شەیتانی بێبەش لە بەزەیی و لە میهرەبانی خودا نییە وەك بێباوەڕان بە تایبەتی (سەلمان روشدی) تاونبار ئەیڵێن، ئەو قورئانەی هیچ شتێ نییە لەوەی بێباوەڕان ئەیڵێن، جگە لەوەی ئامۆژگاری کردنی ڕاستی و بێگومانە بۆ هەموو بوونەوەرانی ژیر و دادپەروەر و بێ لایەن.

﴿لِمَن شَاءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ﴾ ئەو قورئانە ئامۆژگارییە بۆ کەسێ لای ئێوە دوای ڕاستی بکەوێ، لەسەری ڕاوەستێ و سوودی لێ وەربگرێ. بەلام کەسێ بەردەوامبێ لەسەر گومڕایی سوودی لێ وەرناگرێ و، ئامۆژگاری کاری تێ ناکا.

﴿وَمَا تَشَاؤُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ وە ئێوەی بێباوەڕ ئارەزۆی ڕێی ڕاست ناکەن و دووای چاکە ناکەون، مەگەر پەروەردگاری بوونەوەران ئارەزۆ بکا و بە زۆر پێتان بکا، خودای گەورە ئەقڵی داوە بە ئێوە و خۆتانی سەربەست کردووە، ئێوە ڕێگەی ڕاست ناگرن بە ئارەزۆی خۆتان. خودا ئێوەی وەك ئاژاڵی بێ ئەقڵ درووست نەکردووە.

# ﴿ سورەتی ئەلئینفیطار ﴾

لە مەكە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەكانی (١٩) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

إِذَا السَّمَاءُ انفَطَرَتْ ﴿١﴾ وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انتَثَرَتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا الْبِحَارُ
فُجِّرَتْ ﴿٣﴾ وَإِذَا الْقُبُورُ بُعْثِرَتْ ﴿٤﴾ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ
وَأَخَّرَتْ ﴿٥﴾ يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ ﴿٦﴾ الَّذِي
خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾
كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِالدِّينِ ﴿٩﴾ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا
كَاتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴿١٢﴾ إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ
الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ ﴿١٤﴾ يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ الدِّينِ ﴿١٥﴾ وَمَا هُمْ عَنْهَا بِغَائِبِينَ
﴿١٦﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ ﴿١٧﴾ ثُمَّ مَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ
﴿١٨﴾ يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْئًا وَالْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ ﴿١٩﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان**

﴿إِذَا السَّمَاء انفَطَرَتْ وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انتَثَرَتْ﴾ ئەم سورەتە و سوورەتی پێشوو باسی هەندێ لەو شتانە ئەکا لە کاتی ڕۆژی دووایی و، دوای پرسیار و پاداشت پەیدا ئەبن، بەڵام لەم سورەتەدا بە شێوەیەکی کورتتر ئەفەرموێ: هەر کاتێ ئاسمان پارچە پارچە بوو، ئەستێرەکان کەوتنە خوارەوە، چونکە کێشییان نامێنێ و، کاتێ کەوتنە خوارەوە و، بڵاوبوونەوە و نەمان.

﴿وَإِذَا الْبِحَارُ فُجِّرَتْ﴾ وە هەرکاتێ شەپۆلی ئاوی دەریاکان بەرزبوونەوە، بوون بە هەڵم و، بەم لاولادا ڕۆیشتن و بە ئاگری ناو زەوی گەرم کران، دوای نەمانی زەوی.

﴿وَإِذَا الْقُبُورُ بُعْثِرَتْ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ﴾ وە هەرکاتێ گۆڕەکان خاکەکەی لە ناوبرا و ئەو مردووانەی لە ناویاندا بوون زیندووکرانەوە بە کردەوەی خۆیانەوە، لەو کاتانەدا هەموو کەسێ ئەزانێ چ شتێکی بۆخۆی پێش خستووە و، چ شتێکی بۆ خۆی دواخستووە لە چاك و لە خراپ.

﴿يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ﴾ ئەی ئادەمیزاد چ شتێکە فریـوی تـۆی داوە لـە بـۆ پەرستنی پەروەدگاری زۆر گەورەی خۆت لـە هەموو ڕوویەکەوە، بە بێ پرسیار و پاداشـت واز لە بەندەی خۆی نایەرێ، پرسیاریان لێ ئەکا و پاداشتیان ئەداتەوە و، تۆڵـەیان لێ ئەسێنێ، ئیـتر چۆن فریو ئەخۆن.

﴿الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ﴾ پەروەردگارێکی ئەوتۆیە تۆی درووست کردووە لە دڵۆپـێ ئاو، دووایی هێزی نهێنی و ئاشکرای لە ناو لەشی ئێوەدا داناوە و، دووایی ئەندامەکانی تۆی بە شیاو بۆ یەکتری درووست کردووە و، بە جۆرێکی وا دەستێکی تۆ درێـژ نیـیـە لـەوەی تریـان، هەندێ لە لەشی تۆ ڕەش نییە و ئەوی تریان سپی بێ، مەگەر هەندێ جار نەبێ بـۆ نیشـانەیە خودا ئەیزانێ.

﴿فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاء رَكَّبَكَ﴾ بە هەر جۆر و دیمەنێ پەروەدگار ئارەزۆی کردووە پێکیـەوە ناوی، درێژ بێ یا کورت، سپی بێ یا ڕەش یا زەرد، بە جوانترین شێوە و باڵا، بە وێنەی بەرارز و گوێ درێژ درووستی نەکردوویی.

﴿كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِالدِّينِ﴾ زۆر ڕاست و بێگومانە بەڵکو بۆیە فریوتان خواردووە و باوەڕتان بە پاداشت و پرسیار نەبووە، بێگومان ئێوە زینـدوو ئەکرێنـەوە و، پرسـیاری کـار و کـردەوەی خۆتانتان لێئەکرێ.

﴿وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ كِرَامًا كَاتِبِينَ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ﴾ وە بە ڕاستی دانراوە بەسەر ئێـوەدا چەن فریشتەیە ئاگایان لـە هەموو گفتوگۆ و کرداری ئێوە هەیە، بەڕێز و بەهێز و دەست پاك و، ئەو شتەی پێیان سپێردراوە بە تەواوی بە هەموو جۆرێ جێبـەجێ ئەکـەن، هـەموو شـتێ ئێـوە بیکەن ئەینووسن، هەرشتێ ئێوە بیکەن ئەیزانن. جۆری نووسینی کـردار و گوفتـار هـەر خـودا ئەیزانێ.

﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ الدِّينِ وَمَا هُـمْ عَنْـهَا بِغَـائِبِينَ﴾ بـە ڕاستی پیاوچاکان و ڕاسـت وێـژان لـە نـاو ڕابواردنـی چـاك و بەهرەمـەندیدان، بێبـاوەڕان و بەدکاران لە ناو دۆزەخـدان، ئەچنـە نـاو دۆزیخ لـە ڕۆژی پاداشـت و پرسـیاردا، سـزاکەی ئەچێژن و، هیچ کەسێ لەوان نایەنە دەرەوە لە ناود ۆزەخدا چاونوقاندنێ.

﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ ثُمَّ مَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ يَوْمَ لَا تَمْلِـكُ نَفْـسٌ لِّنَفْـسٍ شَـيْئًا وَالْـأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ﴾ وە چ شتێکی زۆر گەورەیە بە تۆی ڕابگەیەنێ ڕۆژی پاداشت چ شتێکە، لە پاشانا چ شتێ بێ بە تۆی بناسێنێ ڕۆژی پاداشت چییە، ڕۆژی پاداشت ڕۆژێکە هیچ کەسێ خاوەنی هیچ شتێ نییە بۆ هیچ کەسێ لە سوود و لە زیان، هەموو کارێ لەو ڕۆژەدا هەر بۆ خودایە بە بـێ ڕاوێژکار و بە بێ یاریدەدەر.

# ﴿ سورەتی ئەلموتەفیفین ﴾

لـە مەککە هاتووەتە خوارەوە. هەندێ لـە زانایـان ئـەڵێن: لـە مەدینـە هاتووەتـە خـوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٣٦) ئایەتن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكۡتَالُواْ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسۡتَوۡفُونَ ﴿٢﴾
وَإِذَا كَالُوهُمۡ أَو وَّزَنُوهُمۡ يُخۡسِرُونَ ﴿٣﴾ أَلَا يَظُنُّ أُوْلَٰٓئِكَ أَنَّهُم
مَّبۡعُوثُونَ ﴿٤﴾ لِيَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿٥﴾ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦﴾
كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡفُجَّارِ لَفِي سِجِّينٖ ﴿٧﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سِجِّينٞ ﴿٨﴾ كِتَٰبٞ
مَّرۡقُومٞ ﴿٩﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿١١﴾
وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعۡتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ
ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿١٤﴾ كَلَّآ إِنَّهُمۡ
عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمۡ لَصَالُواْ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١٦﴾ ثُمَّ يُقَالُ
هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿١٧﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

کۆمەڵێ لـە تاوانباران بازرگانییان ئەکرد و، بە توانا و هێزی خۆیانەوە شـانازییان ئـەکرد، شتێکییان ئەکڕی و ئەیان فرۆشت. بەڵام ئـەوان بـە نرخـی کـەم ئـەیانکڕی و بـە نرخـی زۆر ئەیانفرۆشت. لـە هەردوو جاردا قازانجی زۆریان بۆ خۆیان مسۆگەر ئەکرد. ئادەمیزادیـان ناچـار ئەکرد بۆ سوودی خۆیان و، ئەوانیش چاریان نەئەما ئەبوایە خۆیانیان بدایە بە دەستەوە بۆ نیازی ستەمکاران. چەندە ئایەتەکانی قورئان لـە مەککە لـە بارەی باوەڕبوون بە یەکێتی خـودا و ڕۆژی دوواییەوە ئەهاتنە خوار و، لـە مەدینە زۆربەی لـە بارەی مامەڵە و کۆمەڵایـەتی و دەسـتووری جیهانەوە ئەهاتنە خوارەوە. بەڵام وا دیارە کۆمەڵی لـە دانیشتووانی مەککە کە خـاوەنی سـامانی

زۆر و پلەو پایەی زۆربوون. زیانی زۆریان لە هەژاران ئەدا لە پێوانە و کێشانە و ترازوبازی‌دا، بۆیە خودای مەزن هەڕەشەی لێ‌کردن و فەرمووی:

﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ﴾ نەمان و سزایەکی زۆر سەخت بۆ کەسانێکی ئەوتۆ ستەم ئەکەن لە ئادەمیزاد لە پیاوانە و کێشانەدا، کەسانێکی ئەوتۆن کاتێ شتێ بە پێوانە وەربگرن لە ئادەمیزادی بێچارە بۆ خۆیان، بە تەواوی ئەی‌پێون و زۆری ئەبەن بۆخۆیان و، هەرکاتێ شتێ بپێون یا بیکێشن بۆ ئادەمیزاد بە ناتەواوی و بە کەمی ئەی پێون و ئەیکێشن، لە هەردوو جاردا قازانج بۆ خۆیان مسۆگەر ئەکەن.

﴿أَلَا يَظُنُّ أُولَئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ئایا ئەو کەسانەی ترازوبازی ئەکەن نازانن کە بە ڕاستی ئەوان زیندوو ئەکرێنەوە و پرسیاریان لێ ئەکرێ لە ڕۆژێکی گەورەدا کە ڕۆژی دوواییە، ڕۆژێکە ئادەمیزاد زیندوو ئەکرێنەوە لە گۆڕەکانیانا ڕائەوەستن لەبەر فەرمان و لەبەردەم پەروەردگاری هەموو بوونەوەران بۆ پرسیار و پاداشت، ئەوەی باسکرا تۆڵەی ترازوو بازانە کە شتێکی کەم بدزن لە دانیشتووان، ئەبێ تۆڵە و سزای ئەو کەسانە بە نارەوا دارایی ئادەمیزاد زەوت ئەکەن چۆنبێ؟

﴿كَلَّا إِنَّ كِتَابَ الْفُجَّارِ لَفِي سِجِّينٍ وَمَا أَدْرَاكَ مَا سِجِّينٌ كِتَابٌ مَّرْقُومٌ﴾ زۆر ڕاست و بێگومانە، ترزاوبازان نابێ گومان ببەن زیندوو ناکرێنەوە، ئەبێ بزانرێ ئەو کەسانەی باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نەبێ و، ئەو کەسانەی شتێ بۆخۆیان ساختە بهێنن بۆ لابردنی سزا لەسەر خۆیان، بەهۆی فێڵ و فڕە وە بۆ ڕەواکردنی ترازوبازی. بە ڕاستی نامەی کرداری گوناهباران و بەدکرداران لە ناو دەفتەرێکی پەستی ڕەشدایە کە ناوی تاوانبارانی تێدا تۆمار ئەکرێ، چ شتێکی زۆر سەرسوڕێنەرە بە تۆی بناسێنێ ئەو دەفتەرە ڕەشە چ شتێکە؟ ئەو دەفتەرە نامەیەکە ژمارەی خراوەتە سەر بۆ دیاری‌کردنی ناوی ئەو کەسانە تاوانبارن و سزایان ئەدرێ.

﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ الَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ﴾ نەمان و سزای زۆر سەخت لە ڕۆژی دووایدا بۆ ئەو کەسانەیە ڕۆژی پاداشت و سزا بە درۆ ئەخەنەوە و، بڕوای پێ نایەرن، کەسانێکی ئەوتۆ ڕۆژی پاداشت بە درۆ ئەزانن و، هیچ کەسێ ئەو ڕۆژە بە درۆ نازانێ، مەگەر هەموو کەسێ لایدابێ لە سنووری خودا، گوناهبارن دووای ئارەزۆی پوچی خۆیان کەوتبن.

﴿إِذَا تُتْلَى عَلَيْهِ آيَاتُنَا قَالَ أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ﴾ هەرکاتێ ئایەتەکانی نامەی ئێمە بخوێنرێتەوە بەسەر ئەو کەسەدا کە وەلیدی کوڕی موغیرە، ئەیووت: ئەو ئایەتانە داستانی پڕوپووچی پێشینانە، هەرکەسێ دڵی بۆلای دادپەروەری بڕوات، زۆر لای ئاسانە باوەڕ بە ڕۆژی دوایی بهێنێ، بەڵام هەرکەسێ دەستدرێژی بکاتە سەر مافی ئادەمیزاد، زۆر لای گرانە باوەڕ بەو ڕۆژە بهێنێ، چونکە نەمانی خۆی دەرئەخا.

﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ بێگومـان قورئـان و ڕۆژی دوایـی داسـتانی پڕوپوچی پێشووان نی‌یە، بەڵكو ئەو شتە خراپەی ئەو تاوانبارانە ئەیكەن كەوتووەتە سەر دڵیـان و ڕەشی كردووەتەوە و، بیر لـە ڕاستی ئایەتەكانی قورئان و ڕۆژی دوایی ناكەنەوە.

﴿كَلَّا إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ﴾ ڕاست و بێگومانە. بە ڕاسـتی ئـەو بێ‌باوەڕانـە لـە ڕۆژی دوواییدا لـەبەزەیی و ڕێز و بینینی پەروەدگار بێ‌بەشن و، خودا بە چاوی بەزەیی تەماشایان ناكا و، پاكی‌یان ناكاتەوە لـە گوناه.

﴿ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُو الْجَحِيمِ ثُمَّ يُقَالُ هَذَا الَّذِي كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُـونَ﴾ لـە پاشانا بـە ڕاسـتی ئـەو تاوانبارانە ئەچنە ناو ئاگری دۆزەخ و سزاكەی ئەچێژن، لە پاشانا ئەبێژرێ بەوان: ئا ئەمـە ئـەو سزا بە ئێوە لـە جیهاندا بە درۆتان ئەخستەوە و باوەڕتان پێ نەئەهێنا.

كَلَّآ إِنَّ كِتَـٰبَ ٱلۡأَبۡرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ
﴿١٨﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ ﴿١٩﴾ كِتَـٰبٞ مَّرۡقُومٞ ﴿٢٠﴾ يَشۡهَدُهُ ٱلۡمُقَرَّبُونَ
﴿٢١﴾ إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٍ ﴿٢٢﴾ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٢٣﴾ تَعۡرِفُ فِي
وُجُوهِهِمۡ نَضۡرَةَ ٱلنَّعِيمِ ﴿٢٤﴾ يُسۡقَوۡنَ مِن رَّحِيقٖ مَّخۡتُومٍ ﴿٢٥﴾
خِتَـٰمُهُۥ مِسۡكٞۚ وَفِي ذَٰلِكَ فَلۡيَتَنَافَسِ ٱلۡمُتَنَـٰفِسُونَ ﴿٢٦﴾ وَمِزَاجُهُۥ
مِن تَسۡنِيمٍ ﴿٢٧﴾ عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴿٢٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
أَجۡرَمُواْ كَانُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَضۡحَكُونَ ﴿٢٩﴾ وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمۡ
يَتَغَامَزُونَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمُ ٱنقَلَبُواْ فَكِهِينَ ﴿٣١﴾
وَإِذَا رَأَوۡهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّ هَـٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ ﴿٣٢﴾ وَمَآ أُرۡسِلُواْ عَلَيۡهِمۡ
حَـٰفِظِينَ ﴿٣٣﴾ فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ ﴿٣٤﴾
عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٣٥﴾ هَلۡ ثُوِّبَ ٱلۡكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٦﴾

﴿كَلَّا إِنَّ كِتَابَ الْأَبْرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ وَمَا أَدْرَاكَ مَا عِلِّيُّونَ كِتَابٌ مَّرْقُومٌ يَشْهَدُهُ الْمُقَرَّبُـونَ﴾ بـە ڕاستی و بە بێ‌گومان نامەی كرداری پیاوچاكان و خودا پەرستان لـە ناو جێگایەكی بـەرز و بـە نرخدا دانراوە و، چ شتێكی گەورەی سەرنج ڕاكێشە بە تۆی بناسێنێ ئەو جێگە بەرزە شایستەی

چ شتێکە؟ ئەو جێگە بەرز و بە نرخە نامەیەکە ژمارەی خراوەتە سەر بۆ دیاری کردنی ناوی پیاوچاکان، تاقم تاقم فریشتە بەرێزەکانی نزیك لە خوداو ئەڕۆن بۆ تەماشا کردنی ئەو نامەیە، کە هەستی پێ ئەکرێ هەموو کەسێ نزیکی بێ ئەیبینێ.

﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ عَلَى الْأَرَائِكِ يَنظُرُونَ﴾ بە ڕاستی پیاوچاکان و خودا پەرستان لە ناو خۆشی و بەهرەمەندی چاکی بەهەشتان، بەسەر کورسی‌یەوە دانیشتوون، تەماشای ئەو شتانە ئەکەن خودا لە بەهەشتا بۆی ئامادەکردوون. تەماشای دوژمنانی خۆیان ئەکەن.

﴿تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ النَّعِيمِ يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ خِتَامُهُ مِسْكٌ﴾ بە ڕاستی تۆ هەرکاتێ ئەو کەسانە ببینی ئەزانی ئەوان لە چ چاکە و ڕابواردنان، چونکە تۆ بەسەر ڕومەتیانەو جوانی و سپی‌یەتی و خۆشی ئەبینی، لە مەیەکی پاکی بێ‌ئازاردەر دەرخواردی ئەوان ئەدرێ، ئەو مەیە مۆرکراوە سەرەکەی چەسپە و نەکراوەتەوە، سەری شوشەکانی بە میسك داخراوە و، بۆن و تامی وەك میسك وایە.

﴿وَفِي ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ﴾ وە بۆ ئەو شتانەی لە ناو بەهەشتان دووایی پێویستە بۆلای پەرستنی خودا چاکە و خۆشی و بەهەشت پێش کەران پێش برکێ بکەن و پەلە بکەن، لەبەر ئەوەیش ئەو مەیە بێ‌ئازارەی بە میسك مۆرکراوەیان بدرێتێ. ئەیخۆنەوە.

﴿وَمِزَاجُهُ مِن تَسْنِيمٍ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا الْمُقَرَّبُونَ﴾ وە ئەو شتەی تێکەڵاوی ئەو مەیە ئەکرێ هەندێکە لە خوراوەیە ئەرژێ بەسەر ئەو مەیەدا، ئەو خوراوەیە بریتی‌یە لە کانیاوێ پیاوچاکان لە ئاوەکەی ئەخۆنەوە، چونکە لە پەرستنی خودا پەکیان ناخا، ئەو خواردن و خواردنەوانە ئادەمیزاد لە جیهاندا زۆری بۆ هەوڵ ئەدەن. بۆیە خودا باسیان ئەکات.

دوای ئەوەی خودا باسی پیاوچاکان و پیاوخراپانی کرد، باسی پاداشت و تۆڵەیشی کردن، باسی پیاوچاکانی جیهان و پیاوخراپانی جیهان ئەکا و ئەفەرموێ:

﴿إِنَّ الَّذِينَ أَجْرَمُوا كَانُوا مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا يَضْحَكُونَ﴾ بە ڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ بێ‌باوەڕ و تاوانبارن پێ‌ئەکەنن لە جیهاندا بە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە و، گاڵتەیان پێ‌ئەکەن؛ چونکە هەژارن.

﴿وَإِذَا مَرُّوا بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ وَإِذَا انقَلَبُوا إِلَىٰ أَهْلِهِمُ انقَلَبُوا فَكِهِينَ﴾ وە هەرکاتێ هەژارە باوڕدارەکان بڕۆشتانایە بەلای بێ‌باوەڕە تاوانبارەکاندا، بێ‌باوەڕان بە پێڵو بڕۆی چاویان ئاماژەیان ئەکرد بۆ لای باوەڕداران بە گاڵتە کردنەوە و، هەرکاتێ بێ‌باوەڕان بچوونایەتەوە بۆلای خێزانەکانی خۆیان ئەگەڕانەوە بۆلایان، بە خۆش حاڵی و پێ‌کەنینەوە، بێ‌باوەڕی بت پەرستی خۆیانیان پێ چاکبوو.

﴿وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوا إِنَّ هَؤُلَاءِ لَضَالُّونَ﴾ وە هەرکاتێ بێ‌باوەڕان موسـڵمانانیان ئـەبینی ئـەیان ووت: ئەو کەسانە لـە ڕێگەی باوباپیری خۆیان لایانداوە و ڕێگەی ڕاستی‌یان وون کردووە.

﴿وَمَا أُرْسِلُوا عَلَيْهِمْ حَافِظِينَ﴾ وە بێ‌باوەڕان نەنێراون بۆ سەر موسڵمانەکان، ئاگایان لـەوانبێ و، چاودێری کردەوەی باوەڕداران بکەن. بەڵکو پێویستە بێ‌باوەڕان خـەریکی چـاك کردنـی خۆیانبن.

ئەوەی باسکرا کردەوەی بێ‌باوەڕان بوو لـەگەڵ باوەڕداران لـە جیهاندا، خودای مەزن باسی کردەوەی باوەڕداران ئەکا لـەگەڵ بێ‌باوەڕان لـە ڕۆژی دواییدا، ئەفەرموێ:

﴿فَالْيَوْمَ الَّذِينَ آمَنُوا مِنَ الْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ عَلَى الْأَرَائِكِ يَنظُرُونَ﴾ دووایـی ئـەم ڕۆژەی دوواییی، کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێنا پێ ئەکەنن بە بێ‌باوەڕان و گاڵتەیان پێ ئەکەن. هەر بەو جۆرەی ئەوان لـە جیهاندا بە باوەڕداران پێ‌ئەکەنن. باوەڕداران دانیشتوون بەسەر کورسی‌یەکانی بەهەشتەوە، تەماشای بێ‌باوەڕان ئەکەن لـە دۆزەخدا.

﴿هَلْ ثُوِّبَ الْكُفَّارُ مَا كَانُوا يَفْعَلُونَ﴾ ئایا بێ‌باوەڕان تۆڵـەیان لێ ناکرێتـەوە بـە شـتێ خۆیـان ئەیکەن لـە جیهاندا بە پێکەنینیان و گاڵتە پێ‌کردنیان بە باوەڕداران. بێگومان لـە هەموو کـات و لـە هەموو جێگەیە پیاوانی تاوانبـار و سەرسـەری گاڵتـە بـە پیـاوانی هـەژار و چـاك ئەکـەن و سەرەڕێیان لێ ئەگرن و تاوانجی‌یان تێ ئەگرن. بە ڕاستی ئەو ئایەتانە بۆ هەموو کاتێ هاتوونەتـە خوارەوە.

**بە یاریدەی خودا کۆتایی پێ‌هات**

**٣/١٠/٢٠٠٠ی زایینی**

# ﴿ سورەتی ئەلئینشیقاق ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٢٥) ئایەتن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ (١) وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ (٢) وَإِذَا ٱلۡأَرۡضُ مُدَّتۡ
(٣) وَأَلۡقَتۡ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتۡ (٤) وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ (٥) يَٰٓأَيُّهَا
ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ (٦) فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ
كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ (٧) فَسَوۡفَ يُحَاسَبُ حِسَابٗا يَسِيرٗا (٨) وَيَنقَلِبُ
إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورٗا (٩) وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهۡرِهِۦ (١٠) فَسَوۡفَ
يَدۡعُواْ ثُبُورٗا (١١) وَيَصۡلَىٰ سَعِيرًا (١٢) إِنَّهُۥ كَانَ فِيٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورًا (١٣)
إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ (١٤) بَلَىٰٓ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرٗا (١٥)

ئەم سورەتە و سورەتی تەکویر و ئینفیتار، سامناکی ڕۆژی دووایی ڕوون ئەکەنەوە و، ئادەمیزاد لە ڕۆژی دووایی‌دا ئەبن بە دوو بەش: بەشێکی‌یان لە ناو بەهەشتان، بەشێ تری‌یان لە ناو دۆزەخدان، ئەفەرموێ:

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿إِذَا السَّمَاء انشَقَّتْ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە ئاسمان پارچە پارچە ئەبێ، پەیڕەو و پرۆگرامی زەوی و ئاسمان تێك ئەچێ، کاتێ خودا بیەوێ وێرانی‌یان بکا و، ئاسمان گوێڕایەڵی پەروەدگاری خۆیەتی و، مل کەچ ئەبێ و، شایستەیشە و پێویستە مل کەچی بێ؛ چونکە درووستکراوی پەروەردگاری خۆیەتی و ساڵەهای ساڵ ڕای گرتووە، ئێستا نۆرەی ڕووخانیەتی و هەموو شتێ ئەبێ لە ناو بچێ جگە لە خودای درووست کەری هەموو بوونەوەران.

﴿وَإِذَا الْأَرْضُ مُدَّتْ وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ﴾ وە تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە کاتێ زەوی لە ناو ئەچێ و کێشی نامێنێ و کێوەکانی ئەبن بە تۆز و، زەوی فڕە ئەداتە

دەرەوە ئەو شتانەی لە ناوی‌دایە: لە مردووەکان جگەی مردووەکان و، ناوەکەی بە چۆڵی ئەمێنێتەوە و، فەرمانبەرداری پەروەدگاری خۆیەتی و پێویستە فەرمانبەردار بێ بە وێنەی ئاسمان؛ چونکە چونکە درووستکراوی ئەوە و ئەبێ مل کەچی بێ، دووایی لەو کاتانەدا، تۆ و ھەموو ئادەمیزاد و جنۆکە ئەگەن بە پاداشتی پەروەردگاری خۆتان.

﴿يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَى رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَاقِيهِ﴾ ئەی ئادەمیزاد: بە ڕاستی تۆ لەم جیھانەدا خۆت ماندوو ئەکەی و ڕەنج ئەدەی بۆ بەدەستھێنانی کارێ بۆخۆت چاکبێ یا خراپ و، تۆ لەم جیھانەدا بەردەوام نابی و، بەرەبەرە بەرەو مردن ئەڕۆی و، بۆلای پەروەردگاری خۆت ئەڕۆی، دووایی تووشی کارەکانی خۆت ئەبی لە چاك و لە خراپ و، کەواتە ھەتا زووە واز لە کاری خراپ و ستەم کاری بھێنە، خەریکی پەیداکردنی کاری چاکبە و خزمەت بە مرۆڤایەتی و ھەژاران بکە و، فەرمانبەرداری فەرموودەی خودایە.

﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا وَيَنقَلِبُ إِلَى أَهْلِهِ مَسْرُورًا﴾ دووایی ھەرکەسێ باوەڕی ھێنابێ و کردەوەی چاکی کردبێ و، نامەی کرداری ئەدرێ بە دەستی ڕاستی‌یەوە، دووایی پرسیاری لێ ئەکرێ بە پرسیارێکی زۆر ئاسان و، ئەڕواتەوە بۆلای خێزان و خزمانی بە کەیف و خۆشی و ڕووی گەشەوە.

﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ وَرَاءَ ظَهْرِهِ فَسَوْفَ يَدْعُو ثُبُورًا﴾ وە ھەرکەسێ نامەی کرداری لە لای پشتی‌یەوە بدرێتێ، دووایی ئەو کەسە داوای لە ناچوونی خۆی ئەکا و، ئەڵێ: ئەی ھاوار و نەمان و بەدبەختی بۆ من.

﴿وَيَصْلَى سَعِيرًا إِنَّهُ كَانَ فِي أَهْلِهِ مَسْرُورًا﴾ وە ئەچێتە ناو دۆزەخ لەبەر ئەوەی ئەو کەسە لە جیھاندا لە ناو خێزان و خزمانی‌دا دڵخۆش بووە و، ڕای‌ئەبوارد و بیری لە پرسیار و پاداشتی ڕۆژی دووایی نە ئەکردەوە.

﴿إِنَّهُ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ بَلَى إِنَّ رَبَّهُ كَانَ بِهِ بَصِيرًا﴾ لەبەر ئەوەی بە ڕاستی گومانی وابوو کە ناگەڕێتەوە بۆلای ئێمە و زیندوو ناکرێتەوە و، پرسیاری لێ ناکرێ. بەڵێ بەبێ گومان ئەگەڕێتەوە و پرسیاری لێ ئەکرێ. بە ڕاستی پەروەدگاری ئەو کەسە ئاگای لە کردەوەی ئەو کەسە ھەیە، بەرپرسارە لە سەری چاکبێ یا خراپ.

پرسیار: خودا لە ئایەتی (٢٥) ئەلحاقەدا ئەفەرموێ: تاوانبار نامەی ئەدرێ بە دەستی چەپی‌یەوە، لێرەدا ئەفەرموێ: نامەی کرداری ئەدرێتێ لە پشتی‌یەوە، چۆن کۆ ئەکرێنەوە بە یەکەوە؟

وەڵام: زانایان ئەڵێن: تاوانباران دەستی ڕاستی‌یان لە ڕۆژی دووایدا ئەبەسترێ بە ملی‌یانەوە، دەستی ئەبرێتەوە بۆلای پشتی، دوایی نامەکەی ئەدرێ بە دەستی چەپی‌یەوە.

فَلَآ أُقۡسِمُ
بِٱلشَّفَقِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيۡلِ وَمَا وَسَقَ ﴿١٧﴾ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ﴿١٨﴾
لَتَرۡكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٖ ﴿١٩﴾ فَمَا لَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قُرِئَ
عَلَيۡهِمُ ٱلۡقُرۡءَانُ لَا يَسۡجُدُونَ ۩ ﴿٢١﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُكَذِّبُونَ
﴿٢٢﴾ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يُوعُونَ ﴿٢٣﴾ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٤﴾
إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونِۭ ﴿٢٥﴾

﴿فَلَا اُقْسِمُ بِالشَّفَقِ وَاللَّيْلِ وَمَا وَسَقَ﴾ دووایی بە ڕاستی من سوێند ئـەخۆم بـەو سـورای‌یەی شەو کە ماوەتەوە بە کەنار ئاسۆی ئاسمانەوە دوای ئاوابوونی خۆر و، سوێند ئەخۆم بـە شـەو و، بەو شتەی کۆی ئەکاتەوە لە دوای بڵاوبوونەوەی لە ڕۆژدا.

﴿وَالْقَمَرِ إِذَا اتَّسَقَ لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ﴾ وە من سوێند ئەخۆم بە مانگ کاتێ ڕووناکیەکەی تەواو ئەبێ لە شەوانی (١٣-١٤-١٥-١٦)ی مانگدا، سوێندم بەوانە هەموو، بە ڕاستی ئێـوە لە کاتی درووستبوونتانەوە هەتا ڕۆژی دووایی تێ ئەپەڕن پلە بە پلە: لە دڵۆپێ ئـاوەوە بـۆلای بێچوولەیە لە منداڵدانا، لەویشەوە بۆلای منالێ، بۆلای لاوی، بۆلای پـیری، بـۆلای مـردن، بۆلای زیندووبوونەوە، لە لەش ساغی‌یەوە بۆلای نەخۆشی، لە ساماندارییەوە بۆلای هـەژاری، لە هەڵسان و دانیشتنتان لەگەڵ یەکتری بە چاك و بە خراپ، دوایی بۆلای وەسـتان لـەبـەردەم خودادا.

﴿فَمَا لَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ دوای ئەو هەموو بەڵگانە چ شتێکە ڕێگەی لە ئێوە گرتووە باوەڕ بـە خودا نەیەرن؟ جگە لەوانە بەڵگە و هـۆی تـر زۆرن، بـۆ بـڕوا بـە زیندووبوونـەوە و پاداشـت نایەرن؟

﴿وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنُ لَا يَسْـجُدُونَ﴾ وە هـەرکاتێ ئەخوێنرێتـەوە بەسـەر بێ‌بـاوەڕاندا قورئان لە لایەن موحەممەدەوە سوژدە بۆ خودا نابەن و بڕوا بە قورئان نایەرن و موسڵمان نابن.

﴿بَلِ الَّذِينَ كَفَرُواْ يُكَذِّبُونَ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُوعُونَ﴾ بەڵکو ئـەو کەسـانە باوەڕیـان نـەهێناوە ڕاستی بە درۆئەخەنەوە، خۆیان بە گەورە دائەنێن لە ئاستی ڕاسـتی و، خـودا زانـاترە بـە شـتێ ئەوان ئەیشارنەوە لە دڵیانا لە نیشانە و مەبەستەکانیان، مەبەستی ئەوان هەر پایەداربوونی پلـەو پایە و دەستکەوتی خۆیانە لە جیهاندا.

﴿فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ دووایـی تـۆ موژدە بدە بەو بێ‌باوەڕانە بە سزایەکی زۆر خاوەن ئازار لە پاشەڕۆژدا، جگە لە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە بە خودا و بە ڕۆژی دووایی و کردەوە چاکەکانیان کردووە، بـۆ ئـەو کەسـانە هەیە پاداشتێکی بەردەوام و نەبڕاوە و بێ کۆتایی.

# ﴿ سورەتی ئەلبروج ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٢٢) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ (١) وَالْيَوْمِ الْمَوْعُودِ (٢) وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ
(٣) قُتِلَ أَصْحَابُ الْأُخْدُودِ (٤) النَّارِ ذَاتِ الْوَقُودِ (٥) إِذْ هُمْ عَلَيْهَا
قُعُودٌ (٦) وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِالْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ (٧) وَمَا نَقَمُوا
مِنْهُمْ إِلَّا أَن يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ (٨) الَّذِي لَهُ مُلْكُ
السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (٩) إِنَّ الَّذِينَ
فَتَنُوا الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ
عَذَابُ الْحَرِيقِ (١٠) إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ
جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ۚ ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْكَبِيرُ (١١) إِنَّ بَطْشَ
رَبِّكَ لَشَدِيدٌ (١٢) إِنَّهُ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ (١٣) وَهُوَ الْغَفُورُ الْوَدُودُ (١٤)
ذُو الْعَرْشِ الْمَجِيدُ (١٥) فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ (١٦) هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْجُنُودِ
(١٧) فِرْعَوْنَ وَثَمُودَ (١٨) بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي تَكْذِيبٍ (١٩) وَاللَّهُ مِن
وَرَائِهِم مُّحِيطٌ (٢٠) بَلْ هُوَ قُرْآنٌ مَّجِيدٌ (٢١) فِي لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ (٢٢)

مێژووی مرۆڤایەتی لە کۆندا، خراپترین و ناڕەواترین و سەختترین چەوسانەوەی بەخۆیەوە نەدیوە خراپتربێ لە چەوسانەوەی باوەڕداران، هۆکەیشی ڕەگەزپەرستی کوێرانەبوو، وەك قورئان بۆمانی ئەگێڕێتەوە، لە هەواڵی چەوسانەوەی ئایین پەروەران بەر لە ئایینی ئیسلام:

١- (زونەواس)ی پادشای (حومەیری‌یەکان) لەسەر ئایینی یەهودی بوون، کاتێ بیستی ئایینی عیسا بڵاو بووەتەوە لە (نەجراندا) زۆری لا خراپ بوو، سوپایەکی لە حومەیری‌یەکان و، هۆزەکانی یەمەنی بردە سەریانە و، کۆی کردنەوە، داوای لێکردن ببن بە جوولەکە، ئەگەر

نەبن ئەبێ بکوژرێن، ئەوانیش کوشتنیان بۆخۆیان هەڵبژارد، ئەو پادشایە فەرمانیدا چاڵێکی بۆ هەڵبکەنن و پڕی بکەن لە ئاگر، هەندێکی سوتاندن و، هەندێ تری لێکوشتن، ژمارەی کوژراوەکانیان گەیشتە نزیکەی بیست هەزار کەس.

٢- پاشایە لەمەوبەر هەبووە، جادووگەرێکی بووە پیر بووە، بە پاشای ووت: من پیر بووم، منالێکم لادابنێ فێری جادووی بکەم، کوڕێکی منالیان ناردە لای ئەو جادووگەرە فێری جادووی بکات، لەسەرە ڕێگەی هاتوچۆی ئەو کوڕەدا خوداپەرستێ هەبوو، ئەو کوڕە لای دائەنیشت و گوێی لە گفتوگۆکانی ئەگرت، زۆر لای چاکبوون، هەموو کاتێ لە چوونیا و لە گەڕانەوەیدا لای ئەو خوداپەرستە دائەنیشت و گوێی لێ ئەگرت، بەو بۆنەوە چوون و هاتنەوەی دوائەکەوت و، جادوگەر و کەس و کاری لێیان ئەدا، هانای بردە لای ئەو خوداپەرستە و فەرمووی: لای جادوگەر بڵێ: کەس و کارم دوام ئەخەن، لای ئەوانیش بڵێ جادوگەر دوام ئەخات. ماوەیە بەسەردا تێپەڕی، ڕۆژێ گیاندارێکی دڕندە ڕێگەی هاتوچۆی بەستبوو لە دانیشتووان، کوڕەکە ووتی: ئەمڕۆ بۆم دەرئەکەوێ خودا پەرست یا جادوگەر ڕاستە. بەردێکی هەڵگرت و ووتی: خودایە ئەگەر تۆ کار و کردەوەی ئەو خودا پەرستەت لا چاکە، بەم بەردە ئەو گیاندارە بکوژم هەتا دانیشتووان ڕزگاریان بێ، بەردەکەی فڕێدا و گیاندارەکەی کوشت.

ئەو ڕووداوەی گێڕایەوە بۆ ئەو خوداپەرستە فەرمووی: کوڕی خۆم پلەی تۆ لە پلەی من گەورەترە، ئەگەر تۆ گیرۆدە بووی باسی من مەکە، کوڕەکە وای لێهات کوێر و بەڵەکاوی چاك ئەکردەوە، دانیشتووانی لە زۆر نەخۆشی ڕزگار ئەکرد، هاوڕێیەکی پادشا کوێربوو، ئەو دەنگ و باسەی لەو کوڕەوە بیست، دیارییەکی زۆری بۆ برد، ووتی ئەگەر چاوم چاك بوویەوە ئەم هەموو دیارییەت ئەدەمێ.

کوڕەکە ووتی: خودا هەموو کەس چاك ئەکاتەوە، ئەگەر باوەڕ بە خودا بهێنی، من ئەپاڕێمەوە لە خودا چاکت بکاتەوە، وەزیرەکە باوەڕی هێنا و چاك بوویەوە. کاتێ پادشا چاوی بە وەزیر کەوت چاکبووەتەوە، ووتی: چ کەسێکە ئەو چاوەی داوە بە تۆ، ووتی پەروەردگاری من، پادشا ووتی: جگەی من تۆ پەروەدگاری ترت هەیە، وەزیرەکە ووتی: بەڵێ. پەروەردگاری من و تۆیش، پادشا وەزیرەی گرت و سزای زۆری دا، هەتا ناوی کوڕەکەی پێ ووت، کوڕەکەیان بانگ کرد بۆلای پادشا و ووتی: کوڕی خۆم، بەهۆی جادووگەرییەوە گەیشتوویتەتە ئەو پلەیەی کوێر و بەڵەکاوی چاك بکەیتەوە، کەچی کاری بەو جۆرە ئەکەی، کوڕەکە ووتی: من هیچ کەسێ چاك ناکەمەوە، خودای مەزن هەموویان چاك ئەکاتەوە، دووایی ئازاری زۆریاندا، هەتا ناوی خودا پەرستی ووت و هێنایان، پێیان ووت: لەو ئایینەی خۆت

پەشیمان ببەرەوە، پەشیمان نەبوویەوە، بەو بۆنەوە، مشارێکی‌یان هێنا و خستیانە سەر تەوقی سەری و کردیان بە دوو لەتەوە، هەر بەو جۆرە پیاوەکەی پادشایشیان کرد بە دوو پارچە، دووایی بە کورەکەیشی‌یان ووت: پەشیمان ببەرەوە، پەشیمان نەبوویەوە، دایانە دەستی چەن کەسێ پێیان ووتن: بیبەنە سەر ئەو کێوە، ئەگەر پەشیمان نەبوویەوە، فرەی بدەنە خوارەوە، کورەکە ووتی: خودایە رزگارم بکە بەهەر جۆرێ خۆت ئارەزۆ ئەکەیت، کێوەکە هاتە لەرزین و هەموویان کەوتنە خوارەوە. کورەکە بە بێ ئازار رزگاری بوو و هاتەوە لای پادشا، پادشا پێی ووت: پیاوەکان: چی‌یان بەسەرهات، کورەکە ووتی: خودا هەموویانی لەناوبردن، پادشا ووتی: سواری بەلەمێکی بکەن و بیبەنە ناوەراستی ئەو دەریایەوە، ئەگەر پەشیمان نەبوویەوە فرەی بدەنە ناو ئاوی ئەو دەریایەوە، کورەکەیان برد و ووتی: ئەی خودایە، لەناویان بدە، بەلەمەکە ژێراو ژوور بوو هەموویان خنکان، کورەکە هاتەوە بۆلای پادشا، ووتی: پیاوەکان کوان، کورەکە ووتی: خودا لە ناوی بردن.

دووایی کورەکە بە پادشای ووت تۆ ناتوانی من بکوژی، بە جۆرێ نەبێ من فەرمانت پێ بدەم، پادشا ووتی چۆن ئەبێ: کورەکە ووتی: هەموو دانیشتووان لە دەشتێکا کۆ بکەرەوە، دووایی تۆ تیرێ لە تریدانەکەی من دەربهێنە و بیخەرە ناو کەوانەکەوە، لە پاشانا بڵێ: بە ناوی پەروەدگاری ئەم کورەوە، تیرەکە بهاوێژە بۆ سەری من ئەو کاتە تۆ من ئەکوژی، پادشا دانیشتووانی کۆکردەوە لە دەشتێکا، تیرێکی لە تیردانەکەی دەرهێنا و خستی‌یە سەر کەوانەکەی و هاویشتی و ووتی: بە ناوی خودای پەروەدگاری ئەم کورەوە، دەستی نایە سەر تەوێڵی خۆی، تیرەکە دای لە دەست و لە تەوێڵی کورەکە کوژرا، ، دانیشتووان سێ جار لەسەر یەك هەموویان ووتیان: باوەڕمان هێنا بە خودای ئەو کورە، لە پاشا بە پادشا بێژرا ئاگاداری چ شتێکت بەسەر هات، پادشا فەرمانی‌دا: چاڵێکی‌یان هەڵکەند و پڕیان کرد لە ئاگر، دانیشتووانیان هێنا و هەرکەسێ لە ئایین وەرنەگەرایە ئەیان خستە ناو ئەو ئاگرەوە، دواجار ژنێ هات و منالێکی بە باوەشەوە بوو، ژنەکە ویستی بگەرێتەوە، منالەکە ووتی: دایکە تۆ برۆ و لەسەر راستیت، بێباوەڕان لەم لاو لای چاڵەکەوە دانیشتبوون سەیری باوەڕداران و سووتانی ئەوانیان ئەکرد.

زانایان ئەڵێن: هۆی هاتنەخوارەوەی ئەو سوورەتە ئەو رووداوەیە. بە چەن جۆرێ تر هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو سوورەتە گێردراوەتەوە، هەرچۆنێ بێ ئەو رووداوە پەیدا بووە.

٣- هەواڵی تری چەوسانەوەی ئایین پەرستان لە یەکەم جاری پەیدابوونی ئایینی ئیسلام، زۆر لە موسڵمانان تووشی ئازاری زۆر و ئەشکەنجە بوون، لەوانە بیلالی کوری رەباح بەندەی ئومەیە کوری خەڵەف، عەماری کوری یاسیر و دایکی و باوکی، زۆرتر لە هاورێکانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾، بۆ رونکردنەوەی رووداوی (ئەصحابول ئوخدود) خودا ئەفەرموێ:

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

به ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان

﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ وَالْيَوْمِ الْمَوْعُودِ﴾ وە من سوێند ئەخۆم بە ئەو ئاسمانەی خاوەنی ئەو ئەستێرە گەورانەی ئەوتۆن نایەنە ژمارە، زانایانی ئەم سەردەمە تازەیە ئەڵێن: ئەگەنە سەدان ملیۆنە ئەستێرە، ئەستێرەی وا هەیە بە یەك ملیۆن ساڵ ڕووناکی‌یەکەی‌ئەگاتە سەرزەوە.

زانایان بە چەن جۆرێ مانای بورجیان کردووە: هاتووە بە مانای ئەو ئەستێرە گەورانە هەر یەکەیان وەك قەڵایەکی گەورە دەرئەکەون و، هەندێ تریان ئەڵێن: بریتیین لە (١٢) جێگە عەرەبەکان ئەیانناسن، جێگەی خۆرن لە ساڵێکا ئەیانبڕێ، حەمەل و سەورو جەوزا، سێ مانگەی بەهار. سەرەتان و ئەسەد و سونبولە، سێ مانگەی هاوین، میزان و عەقرەب و قەوس سێ مانگەی پایزن، جەدی و دەلو حووت سێ مانگەی زستانن. مەبەست لە باسی بروج ئەوەیە: ئێمە ئەو ئەستێرە گەورە سەرسوڕێنەرانە بکەین بە بەڵگە لەسەر گەورەیی و توانای خودای مەزن و، سوێند ئەخۆم بەو ڕۆژەی بەڵێنی پێدراوە لە لایەن خوداوە کە بریتی‌یە لە لە ڕۆژی دووایی، هەموو کەسێ پاداشتی کردەوەی خۆی وەرئەگرێ.

﴿وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ﴾ وە من سوێند ئەخۆم بەو کەسەی ئاگاداری هەموو شتێکە و هەموو شتێ ئەزانێ و، سوێندم بەو ئادەمیزادەی لە ڕۆژی دووایدا ئەندامەکانی شایەتی لەسەر ئەدەن. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: مانای بەم جۆرەیە: من سوێند ئەخۆم بەو فریشتانە شایەتی ئەدەن لەسەر ئادەمیزاد، سوێند ئەخۆم بە موحەممەد شایەتی ئەدا لە سەر ئۆمەتی خۆی، سوێند ئەخۆم بە ئۆمەتی موحەممەد شایەتی ئەدەن لەسەر نەتەوەکانی تر. زانایان بیریان جیاوازە لە ماناکردنی ئەو ڕستانە لە ماناکردنیانا (٤٨) بیروبۆچوونیان هەیە، (١٦) شازدەیان لە مانای (شاهد) (٣٢)یان لە مانای (مشهود). موحەممەد عەبدە ئەفەرموێ: مەبەست لە شاهید هەموو کەسێکە خاوەنی هەستێکی وابێ شتێ ببینێ، مەبەست لە مەشهود شتێکە بەهۆی هەستێکەوە بزانرێ.

﴿قُتِلَ أَصْحَابُ الْأُخْدُودِ﴾ سوێندم بەوانەی باسکران بێباوەڕانی مەککە بێ بەشن لە بەزەیی و میهرەبانی خودا بە وێنەی خاوەن و دانیشتووانی لای چاڵی پڕ لە ئاگرە، یانێ دانیشتووانی سەر ئەو چاڵە بێ‌بەشن لە سزای خودا.

﴿النَّارِ ذَاتِ الْوَقُودِ﴾ ئوخدود بریتیە لە چاڵێ پڕە لە ئاگرێ خاوەنی سوتەمەنی گڕداری زۆر سەختە، ڕەبیعی کوڕی ئەنەس ئەڵێ خودا باوەڕدارانی ڕزگارکرد لە ئازاری سوتان بە گیان کێشانیان بەر لەوەی ئاگر تووشیان بێ و، ئاگرەکە دەرئەچوو لە لێواری ئەو چاڵە و ئەیدا لە بێباوەڕن ئەیسوتاندن.

﴿إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ وَهُمْ عَلَى مَا يَفْعَلُونَ بِالْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ﴾ بێبەشبوون لە بەزەیی خودا و لە ناوچوون، بۆئەو بێباوەڕانە کاتێ دانیشتبوون لەسەر لێواری ئەو چاڵە پڕ لە ئاگرە و، ئاگاداری شتێ بوون ئەیکەن بە باوەڕداران و، بەبێ بەزەیی‌یانە ئەیانخستنە ئەو ناو ئەو چاڵە پڕ لە ئاگرە.

﴿وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلَّا أَن يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ وە بێباوەڕان هیچ شتێکی باوەڕدارانیان پێ ناخۆش نەبوو، هیچ خراپەیەکی‌یان لێ نەئەگرتن جگە لەوەی ئەو کەسانە باوەڕیان هەبوو بە خودایەکی زۆر گەورە و بە دەستەلات، زۆر شایستەیە بۆ ئەوەی سوپاسی بکرێ، بێباوەڕان دەرچوونیان بۆ نی‌یە، لە دەستەلات و سزای خودا..

دوای ئەوەی خودا ئاماژەی بۆ خراپەی خاوەنی چاڵە پڕ لە ئاگرەکە کرد هەڕەشە لە بت پەرستانی مەککە ئەکات کە ئازاری باوەڕداران ئەدەن و، ئەفەرموێ:

﴿الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ خودایەکی ئەوتۆیە، هەر بۆ ئەوە خاوەنی و پادشایەتی ئاسمانەکان و زەوی و، خودا ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکا.

﴿إِنَّ الَّذِينَ فَتَنُوا الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ الْحَرِيقِ﴾ بە ڕاستی کە سانێکی ئەوتۆ سزای پیاوانی باوەڕدار و ژنانی باوەڕدار ئەدەن، لە پاشانا پەشیمان نەبوونەتەوە لەو تاوانەی خۆیان، دووایی بۆ ئەوان هەیە سزای دۆزەخ لەبەر بێباوەڕی‌یان و، سزای زۆرتر بە هۆی سووتانی باوەڕدارانەوە سزای گرانی ئاگر بەهۆی سووتانی ئەوانەوە زۆر بە سەختی تر. وێنەی تاوانبارانی پێشوو، سزای ئوبەی کوڕی خەلەف و ئەبوجەهل و ئەبولەهەب ئەدرێ کە سزای بیلال و عەمار و یاسیر و باوک و دایکی یاسریان ئەدا.

﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْكَبِيرُ﴾ بە ڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە و، کردەوە چاکەکانیان کردووە، بۆ ئەوان هەیە چەن بەهەشتێ ئەڕوا بە ژێر درەختەکانیا و بەم لاولای کۆشکەکانیان چەند ڕووباری ئاوی شیرین و بە تام، ئەو چوونەی ناو بەهەشت سەرکەوتن و بەختیاری زۆر گەورەیە.

﴿إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ إِنَّهُ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ﴾ بە ڕاستی هەڵمەت و دەست وەشاندنی پەروەدگاری تۆ زۆر سەختە، بە ڕاستی هەر پەروەدگاری تۆیە یەکەم جار بوونەوەرانی درووست کردووە، هەر ئەوە دوای مردنیان زیندوویان ئەکاتەوە، بۆ پرسیار و پاداشت.

﴿وَهُوَ الْغَفُورُ الْوَدُودُ ذُو الْعَرْشِ الْمَجِيدُ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ﴾ وە هەر خودایە خۆش ئەبێ لەو کەسانەی پەشیمان ئەبنەوە، خاوەنی تەخت و بارەگا و بوونەوەرانی گەورەیە، ئەو شتەی خودا بیەوێ زۆر بە تواناوە ئەیکا، لە یاریدانی پیاوچاکان و، لە ناوبردنی تاوانباران.

﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْجُنُودِ فِرْعَوْنَ وَثَمُودَ بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي تَكْذِيبٍ وَاللَّهُ مِن وَرَائِهِم مُّحِيطٌ﴾ ئایا نەگەیشتووە بە تۆ هەواڵ و داستانی سوپاکان و تاوانباران، سوپای فیرعەون و،

سوپای سەمود و، درێژەیان دابوو بە ستەم و تاوان. بەڵکو کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نـەهێناوە، هەموو کاتێ لـە بەدرۆخستنەوەی تۆ و قورئانداندان، بە وێنەی نەتەوەکانی ڕابردوو و پێغەمەرەکانی خۆیان و، نامەکانیان بە درۆئەخستنەوە و، خودا لـە پشتی‌یانەوەیە ئاگای لـە هـەموویان هەیـە و، کەسی لـە دەست دەرناچێ.

﴿بَلْ هُوَ قُرْآنٌ مَّجِيدٌ فِي لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ﴾ بەڵکو ئەو قورئانەی بت پەرستانی مەککـە بـاوەڕی پێ نایەنن، بە درۆی ئەخەنـەوە قورئـانێکی زۆر بـەڕێز و گەورەیـە، لـە پـاراویدا بـێ هاوتایـە، هەڵگیراوە و، دانراوە لـە ناو تەختەیەکی پارێزراو کە دەسـتکاری و گۆڕانکـای تێـدا نـاکرێت، ئێمە نازانین ئەو تەختەیە چۆنە. بەڵام پێویستە باوەڕمان بەوە هەبێ قورئانی تێدا دانراوە.

# ﴿ سورەتی تاریق ﴾

لـە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (١٧) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ ﴿١﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الطَّارِقُ ﴿٢﴾ النَّجْمُ الثَّاقِبُ ﴿٣﴾ إِن كُلُّ
نَفْسٍ لَّمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ ﴿٤﴾ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّاءٍ
دَافِقٍ ﴿٦﴾ يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ ﴿٧﴾ إِنَّهُ عَلَىٰ رَجْعِهِ لَقَادِرٌ ﴿٨﴾
يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ ﴿٩﴾ فَمَا لَهُ مِن قُوَّةٍ وَلَا نَاصِرٍ ﴿١٠﴾ وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ ﴿١١﴾
وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ ﴿١٢﴾ إِنَّهُ لَقَوْلٌ فَصْلٌ ﴿١٣﴾ وَمَا هُوَ بِالْهَزْلِ ﴿١٤﴾ إِنَّهُمْ
يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴿١٥﴾ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴿١٦﴾ فَمَهِّلِ الْكَافِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًا ﴿١٧﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان**

﴿وَالسَّمَاء وَالطَّارِقِ﴾ وە من سوێند ئەخۆم بە ئاسمان: بە هەموو شتێ لە لای سەرەوەیە. لـە خۆر و لـە مانگ و لـە ئەستێرەکان کە ژمارەیان زۆر زۆرە و، من سوێند ئەخۆم بـەو شـتەی لـە شەودا دەرئەکەوێ.

﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا الطَّارِقُ النَّجْمُ الثَّاقِبُ﴾ وە چ شتێکی سەرسوڕێنەرە بە تۆی بناسێنێ و بزانـی تاریق چ شتێکە؟ ئەو جۆرە پرسیارانە لە قورئـاندا زۆرن. ئـەوە ئەگەیـەنێ پرسـیار لێکراوەکـە شتێکی گرنگە، تاریق ئەستێرەیەکە بە ڕووناکی خۆی تاریکی شەو کەم ئەکاتەوە و، کونی ئەکا. ئیتر هەر ئەستێرەیە بێ گرنگ نی‌یە.

﴿إِن كُلُّ نَفْسٍ لَّمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ﴾ سوێندم بەوانەی باسکران: هەموو کەسێ نی‌یە لە ئادەمیزاد خودا دروو‌ستی‌کردبێ مەگـەر دانـراوە بەسـەری‌یەوە پاسـەوانێ لـە فریشتەکان، گفتوگـۆ و کردار‌یان ئەپارێزێ و، هەڵسان و جموجووڵ و نهێنی‌یـەکان ئەنووسـن لـە چـاك و لـە خـراپ، سەرەڕای ئەوانەیش خودا ئاگاداری هەموو بوونەوەران و بەسەرهاتیانە.

﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ خُلِقَ مِن مَّاء دَافِقٍ يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ﴾ دووایی با ئادەمیزاد تەماشا بکا و بیر بکاتەوە لە شتێ درووست کراوە؟ درووست کراوە لە ئاوێ دێتە دەرەوە لە نێوان برِبرِەی پشتی پیاوان و لە ئێسکی سنگی ژنان. کەواتە ئەی ئادەمیزاد: تۆ خۆت بناسە کە یەکەمین جار تۆ لەو ئاوە بێ نرخە پەیدا بووی، بە هۆی توانای خوداوە بووی بەم پیاوە خاوەن هەست و زانستە. دوایی تۆ ئەمرێنێ.

﴿إِنَّهُ عَلَى رَجْعِهِ لَقَادِرٌ يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ﴾ بە ڕاستی درووستکەری تۆ ئەی ئادەمیزاد یەکەمین جار، توانای هەیە تۆ بگێرِێتەوە بۆلای خۆی بە زیندوویی دوای مردنت لە ڕۆژێکا هەموو نهێنییەکانی دەروونی ئادەمیزاد دەرئەکەوێ بە بێ پەردە و شاراوەکان هەموویان ئاشکرا ئەبن. چاك و خراپ جوێ ئەبنەوە، ڕێگە قاڵە قاڵ و بەهانە نامێنێ هەموو کەسێ چاوەڕِانی فەرمانی خودایە. یا بۆلای بەهەشت یا بۆلای دۆزەخ.

﴿فَمَا لَهُ مِن قُوَّةٍ وَلَا نَاصِرٍ﴾ دووایی ئەو ڕۆژە هیچ هێز و هیچ یارمەتی دەرێ بۆ هیچ کەسێ نییە، جگە لە باوەڕ و کرداری چاك لە جیهاندا کردبێتی.

﴿وَالسَّمَاء ذَاتِ الرَّجْعِ وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ إِنَّهُ لَقَوْلٌ فَصْلٌ وَمَا هُوَ بِالْهَزْلِ﴾ وە من سوێند ئەخۆم بەو ئاسمانەی خاوەنی ئەو بارانەیە، بە گوێرەی پێویست ئەبارێ بەهۆی دەستووری خوداوە و، لە زەویدا خواردەمەنی و هۆی ژیان و بۆ ئێوە مسۆگەر ئەکا و، سوێندم بەو زەوییە خاوەنی قلێشان و درزە بەهۆی هەموو درەخت و گژ و گیاوە زەوی ئەقلێشێن بە فەرمانی خودا. لە ناو زەوییەوە سەر ئەهێننە دەرەوە، نەك بە هێزی خۆیان و بەو نەرمی و بارێکەوە، سوێندم بەوانە قورئان گفتوگۆیەکە ڕاست و پوچ لە یەك جوێ ئەکاتەوە و، قورئان گاڵتە و کاری بێ مانا و پووچ نییە.

﴿إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا وَأَكِيدُ كَيْدًا فَمَهِّلِ الْكَافِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًا﴾ بە ڕاستی بێباوەڕانی قورەیش پیلان لە دژی پێغەمەر و باوەڕداران ساختە ئەهێنن و، ئێمە پیلانەکەیان پووچ ئەکەینەوە و تۆڵەیان لێ ئەسێنین، دووایی پەلە مەکە و مۆڵەتی بێباوەڕان بدە و وازیان لێ بهێنە، تۆ وازیان لێبهێنە بە وازهێنانێکی زۆر کەم، ئێمە تۆ و ئایینی ئیسلام سەرئەخەین و، دوژمنانی تۆ لە ناو ئەبەم و ڕسوای هەردوو جیهانییان ئەکەم.

# ﴿ سورەتی ئەلئەعلا ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (١٩) ئایەتن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ١ ٱلَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ٢ وَٱلَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ
٣ وَٱلَّذِيٓ أَخۡرَجَ ٱلۡمَرۡعَىٰ ٤ فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحۡوَىٰ ٥ سَنُقۡرِئُكَ
فَلَا تَنسَىٰٓ ٦ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلۡجَهۡرَ وَمَا يَخۡفَىٰ ٧ وَنُيَسِّرُكَ
لِلۡيُسۡرَىٰ ٨ فَذَكِّرۡ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكۡرَىٰ ٩ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخۡشَىٰ ١٠
وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلۡأَشۡقَى ١١ ٱلَّذِي يَصۡلَى ٱلنَّارَ ٱلۡكُبۡرَىٰ ١٢ ثُمَّ لَا يَمُوتُ
فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ ١٣ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ١٤ وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ١٥
بَلۡ تُؤۡثِرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ١٦ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ١٧ إِنَّ
هَٰذَا لَفِي ٱلصُّحُفِ ٱلۡأُولَىٰ ١٨ صُحُفِ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ١٩

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان**

﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى﴾ تۆ ناوی پەروەدگاری پایە بەرزی خۆت بە پاك و خاوێنی ڕابگرە و، دووری بخەرەوە لەو شتەی شایستەی ئەو نی‌یە، وەك هاوبەشدانان و هاودەم و منداڵ بۆی، خودا زانایە بە هەموو شتێ. پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە فەرمووی: (سبحان ربي الأعلى)، بۆیە فەرمانی پێدرا لە سوژدەی نوێژدا بیبێژرێ.

﴿الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى﴾ پەروەدگارێکی ئەوتۆیە هەموو شتێکی درووست کردووە، دووایی ڕێکی خستوون لەسەر دیمەن و شێوازێکی واشایستەی ئەوانبێ و، پەروەردگارێکی ئەوتۆیە هەموو سوودێکی دیاری کردووە بۆ هەموو شتێ و ئامادە و ئاسان کردووە، دووایی ئەوانی فێرکردووە ڕێگەیە چاکبێ بۆئەوان، بە جۆرێ باڵندەی فێری گەرمیان

و کوێستان کردووە، مێروو لەو مێش هەنگی فێری هۆی ژیان کردوون بە شێوەیە ئەندازیاری پسپۆڕ رێگەی پێ نابا، هەروەها هەموو گیاندارانی تر هەریەکەیان بە جۆری شیاوی خۆیانبێ.

﴿وَالَّذِي أَخْرَجَ الْمَرْعَى فَجَعَلَهُ غُثَاءً أَحْوَى﴾ وە پەروەردگارێکی ئەوتۆیە هەموو جۆرە رووەك و لەوەری درووست کردووە بۆ ئێوە و، لە زەوی دەری هێناوە بۆ خواردن و ڕابواردنی خۆتان و، بۆ ئالفی ئاژاڵەکانتان، دووایی ئەو سەوزایی‌یە تەڕ ئەکات بە پووش و ووشکی ئەکات، دوای ووشکبوونی کاتی وا هەیە شایستەیە بۆ خواردنی خۆتان وبۆ ئالفی ئاژاڵەکانتان و، ئەوەیش ئاماژەیە هەموو شتێ بەرەو نەمانە.

﴿سَنُقْرِئُكَ فَلا تَنسَى إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ إِنَّهُ يَعْلَمُ الْجَهْرَ وَمَا يَخْفَى﴾ دووایی ئێمە فەرمان ئەدەین بە جبرەئیل چەند جاری قورئان بخوێنێتەوە بەسەر تۆدا هەتا تۆ لەبەری بکەیی و، دوایی تۆ ئەو قورئانەت لە بیر ناچێتەوە مەگەر ئێمە ویستبێتمان هەندێکی لە بیری تۆی ببەینەوە یا ماناکەی بگۆڕین بە جۆرێ تر. بە ڕاستی خودا بە هەموو شتێکی ئاشکرا و بە هەموو شتێکی نهێنی ئەزانێ، ئێمە ئەزانین تۆ شتێکت لە کیس بچێ لە قورئان، ئێمە نایەڵین لە کیست بچێ.

ئەو ئایەتە موژدەیە گەورەیە لە لایەن خوداوە بۆ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەوەی خودا قورئان ئەنێرێتە سەر دڵی پێغەمەر و جێگەی خۆی ئەگرێ و لە بیری ناچێ.

﴿وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَى فَذَكِّرْ إِنْ نَفَعَتِ الذِّكْرَى﴾ وە ئێمە یاسایەکی ئاسان و ڕەوانمان ئامادە کردووە بۆ تۆ کە ئایینی ئیسلامە، بەهۆی ئایەتەکان و فەرمانەکانی قورئانەوە، هەتا تۆ بیپارێزی و لەبەری بکەیی و، ڕای‌بگەیەنی بە ئادەمیزاد و، کاری پێ‌بکەی بە جۆرەی خودای مەزن ئەیەوێ، دووایی تۆ ئامۆژگاری ئادەمیزاد بکە بۆ کردنی کاری چاك و باوەڕهێنان و، بیانگێڕەوە لە کردنی کاری خراپ، ئەگەر ئەتزانی ئامۆژگاری سوود ئەبەخشێ.

بۆ زانین: پێغەمەری خودا زۆر جاران ئامۆژگاری بێ‌باوەڕانی ئەکرد و بێ سوود بوو، دووایی پێغەمەر ئومێدی بڕی لەوەی هەندێکیان باوەڕ بهێنن، خودای گەورەو وشەی (إن) یانی ئەگەری بەکارهێنا بۆ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، هەتا خۆی ماندوو نەکا و خەفەت نەخوا، کەواتە مانای )إن) دوورە لە مانای خۆی، چونکە ئامۆژگاری کردن پێویستە سوودی ببێ یا نە، هەتا بێ‌باوەڕان بیانوویان نەمێنێ، بە هەرجۆرێ بێ، سوودی ئەبێ بۆ هەندێ کەسی لە خودا ترس، وەك خودا فەرمووی:

﴿سَيَذَّكَّرُ مَنْ يَخْشَى وَيَتَجَنَّبُهَا الْأَشْقَى الَّذِي يَصْلَى النَّارَ الْكُبْرَى﴾ بە بێ گومان هەرکەسێ لە خودا بترسێ و بیر لە پەند و ئامۆژگاری کردن بگرێ سوود لە ئامۆژگاری وەرئەگرێ و، ئادەمیزادی بەدکار و خراپ خۆی دوور ئەخاتەوە لە ئامۆژگاری و یاسای ئیسلام، سوود لە ئامۆژگاری وەرناگرێ و، ئەو کەسەی ئەوتۆیە ئەچێتە ناو ئاگری گەورەی دۆزەخەوە کە زۆر سەختتر و گەورە ترە سزاکەی لە ئاگری جیهان.

﴿ثُمَّ لا يَمُوتُ فِيهَا وَلا يَحْيَى﴾ لە پاش چوونی بۆ ناو دۆزەخ نامرێ لە ناو دۆزەخدا، هەتا پشوێ بدا و، زیندوو ناکرێ بە جۆرە زیندووبوونەوەیە سوودی پێ ببەخشێ، کەواتە پێویستە ئێمە بە گفتوگۆی هەندێ کەس نەخلەتێین کە ئەڵێن: پێویست نییە لەسەرمان ئامۆژگاری کردن، چونکە سودێ نابەخشێ.

﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ تَزَكَّى وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّى﴾ بە ڕاستی ڕزگاری بووە و سەرکەوتووە ئەو کەسەی خۆی پاککردووەتەوە لە پیسی و بێباوڕی و سوودی وەرگرتووە لە ئامۆژگاری و، یادی ناوی پاکی پەروەدگاری خۆی کردووە بە هەموو کارێکی شایستە بۆی و دووایی نوێژەکانی کردوو لەبەر ترسی خودا.

﴿بَلْ تُؤْثِرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَى﴾ بەڵکو ئێوە ژیان و گوزەرانی جیهان بۆ خۆتان هەڵئەبژێرن و ڕێزی ئەدەن بەسەر پاداشتی پاشەڕۆژدا و، ژیان و پاداشتی دووارِۆژ چاکتر و خۆشترە و بەردەوامترە و کۆتایی پێ نایە.

﴿إِنَّ هَذَا لَفِي الصُّحُفِ الْأُولَى صُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى﴾ بە ڕاستی ئەوەی باسکرا لەو سوورەتەدا و، لە هەموو قورئاندا، خودا فەرموویەتی لە ناو نامەکانی پێغەمەرەکانی پێشوودا، نامەکانی ئیبراهیم و موسا، سەرچاوەی داواکاری هەموو پێغەمەران لە بارەی بیر و باوەڕ یەکن و، خودایەکی تەنها ڕەوانەی کردوون، گوڕانی هەندێ لە یاسای قورئان بەرەوپێش ڕۆیشتنی کاتە و، گۆڕانی پێویستی کۆمەڵگای ئادەمیزادە و، سەرچاوەی بیروباوەڕ هەر یەکە و ناگۆڕێ.

**بە یاریدەی خودا تەواو بوو**

## ﴿ سورەتی ئەلغاشیە ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٢٦) ئایەتن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ﴿١﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَٰشِعَةٌ ﴿٢﴾
عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴿٣﴾ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ﴿٤﴾ تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ ءَانِيَةٍ ﴿٥﴾
لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ ﴿٦﴾ لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِن جُوعٍ ﴿٧﴾
وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ﴿٨﴾ لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ ﴿٩﴾ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿١٠﴾
لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَٰغِيَةً ﴿١١﴾ فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ ﴿١٢﴾ فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ ﴿١٣﴾
وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ ﴿١٤﴾ وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ ﴿١٥﴾ وَزَرَابِيُّ مَبْثُوثَةٌ ﴿١٦﴾
أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ
رُفِعَتْ ﴿١٨﴾ وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ﴿١٩﴾ وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ
سُطِحَتْ ﴿٢٠﴾ فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم
بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴿٢٣﴾ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ
ٱلْأَكْبَرَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴿٢٦﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان**

﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ﴾ ئایا بە ڕاستی هاتووە بۆلای تۆ و، پێت نەگەیشتووە دەنگ و باس و هەواڵی ڕۆژێ ئادەمیزاد بە سەختی و بە ترس دائەپۆشێ کە بریتی‌یە لە ڕۆژی دوایی، ئەو دەنگ و باسە ئەبێ بیری لێ بکرێتەوە و، زۆر بە سامە و شایانی ئەوەیە باسی بکرێ بۆ ئادەمیزاد، لەو ڕۆژەدا ئادەمیزاد ئەکرێن بە دوو بەشەوە:

١ - ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَاشِعَةٌ عَامِلَةٌ نَاصِبَةٌ تَصْلَى نَاراً حَامِيَةً﴾ چەن خاوەن ڕومەتی هەن لەو ڕۆژەدا ڕسوا و شەرمەزارن، کاری زۆریان کردووە لە جیهاندا، خۆیانیان زۆر ماندووکردووە بۆ

جگەی خودا، بێباوەڕبوون، ئەچنە ناو ئاگرێکی زۆر گەرمەوە لەو دۆزەخەدا، بەو ئاگرە داخ ئەکرێن، ئازاری ئەچێژن.

﴿تُسْقَى مِنْ عَيْنٍ آنِيَةٍ لَيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِنْ ضَرِيعٍ لا يُسْمِنُ وَلا يُغْنِي مِنْ جُوعٍ﴾ ئاویان دەرخوارد ئەدرێ لە سەرچاوەی ئاوێکی زۆر گەرم، هیچ جۆرە خواردەمەنییە بۆ ئەوان نییە جگە لە گیایە هیچ گیانداری لەبەر خراپی ئەو گیایە نزیکی ناکەوێتەوە، خراپە لەوان ناگێڕێتەوە و، قەڵەویان ناکا و، برسێتی ناگێڕێتەوە و، سودێ بەوان نابەخشێ.

٢- ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاعِمَةٌ لِسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ﴾ چەن خاوەن ڕومەتی هەن لەو ڕۆژەدا، خاوەنی ڕووی گەش و شیرین و جوانن و نەرم و نۆڵن، لە پاداشتی کۆشش و کاری جیهانی خۆیان زۆر ڕازی و شادمانن، دانیشتووی ناو بەهەشتێکی بەرز و پایە باڵا و دڵگیر و نایابن.

﴿لا تَسْمَعُ فِيهَا لاغِيَةً فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ﴾ لە ناو بەهەشتا گفتوگۆی خراپ و بێ سوود و لاقرتی نابینن، لەبەر ئەوەی لە ناو بەهەشتا جگە لە گفتوگۆی چاك و بەسوود و لەگەڵ یەکتری ناکرێ، لە ناو بەهەشتا کانیاوی وا هەیە ئاوەکەی ئەڕوا بە ژێر درەختەکانیان.

﴿فِيهَا سُرُرٌ مَرْفُوعَةٌ وَأَكْوَابٌ مَوْضُوعَةٌ وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ وَزَرَابِيُّ مَبْثُوثَةٌ﴾ لە ناو ئەم بەهەشتەدا هەیە چەن جۆر کورسی و تەختێ بەرز کراونەتەوە لە زەوی بەهەشتا، بەم لاولای سەرچاوەی ئاوەکانەوە دانراون بۆ دانیشتن لە سەریان و، چەن جۆرەها پەرداخ و گلاس دانراون لەسەر مێزەکانی بەهەشت بۆ خواردنەوەی ئاو و مەی بێ ئازار و شیری پاك و پوختە، چەن جۆرە پشتی بە نرخ ڕیزکراون لەسەر کورسی و جێگەکانی تری بەهەشت پاڵیان پێوە بدەن و، چەن جۆر قاڵی و ڕاخەری زۆر نایاب ڕاخراون لە شوێنەکانی بەهەشتا بۆ دانیشتن لە سەریان و گەڕان بەسەرییانا.

﴿أَفَلا يَنْظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ﴾ ئایا دووایی ئەو تاقمەی تۆ بۆ ناڕوانن بۆلای هوشتر بە چ جۆر و شێوەیە درووست کراوە: مل بەرز و درێژ و کلك کۆڵ، خۆی ئەدا بە زەویدا هەتا سواری بن و باری بکەن، دواجار هەڵئەسێتە سەرپێ و، دیمەنێکی زۆر سەیری هەیە، بۆیە باسی هوشتر کراوە، لەبەر ئەوەی لە لای عەرەبەکان یە سوودترین و بەرێزترین ئاژاڵە لای عەرەبەکان، زۆر بە توانایە و بەهێزە کەچی سەرشۆڕ و ملکەچی ئادەمیزادە، زۆر خۆڕاگرە بۆ تینوێتی، زۆر تیژ ڕەوە و، لە هیچ دڕەندەیە ناترسێ و، سوودی زۆرتریشی هەیە لە شیر و گۆشت و کورگدا.

﴿وَإِلَى السَّمَاءِ كَيْفَ رُفِعَتْ وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ﴾ وە بۆ ئەوان ناڕوانن بۆلای ئاسمان چۆن بەرزکراوەتەوە لە زەوی، بەو هەموو ئەستێرە بە سوودانەوە هەیەتی و، بۆ ناڕوانن بۆلای ئەو کێوانە چۆن وەك مێخ داکوتراون بەسەر زەویدا، هەتا زەوی

نەجوولێ و، ئەگەر ئەو کێوانە نەبن زەوی بە دانیشتووانی سەری‌یەوە ئەجوولێن و لە جێگەی خۆیان نامێنن، بۆ ناڕوانن بۆلای زەوی چۆن ڕاخراوە و، هەرچەندە خڕە و، بەڵام خودای مەزن وای لە زەوی کردووە پابنێ بۆ ئەوەی ئادەمیزاد بە ئاسانی هاتوچۆی بەسەردا بکەن و سوودی لێ وەربگرن، خودای مەزن بۆیە باسی ئەو شتانەی کردووە، چونکە ئەو شتانە عەرەبەکان بە چاوی خۆیان ئەیان بینن.

﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنتَ مُذَكِّرٌ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ﴾ دووایی پەند و ئامۆژگاری ئادەمیزاد بکە، خودا و ڕۆژی دووایی بیری ئەوان بخەرەوە، دووایی بەڕاستی تۆ هەر ئامۆژگاری کەری ئەوانی و، خودا و ڕۆژی دووایی بیری ئەوان ئەخەیتەوە، تۆ دەستەڵاتت بەسەر ئەواندا نی‌یە، بە زۆر باوەڕ بەوان بهێنی و، بەڵام ئەو کەسەی پشت بکاتە پەند و ئامۆژگاری تۆ و، باوەڕ بە خودا و ڕۆژی دووایی نەیەرێ.

﴿فَيُعَذِّبُهُ اللَّهُ الْعَذَابَ الْأَكْبَرَ إِنَّ إِلَيْنَا إِيَابَهُمْ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم﴾ دووایی ئەوەی باوەڕی نەهێنا خودا سزای ئەو کەسە ئەدا بە سزایەکی زۆر گەورە و سەخت. بە ڕاستی گەڕانەوەی ئەوان لە ڕۆژی دووایدا بۆلای ئێمەیە، لە پاشانا پرسیاری کردەوەی ئەوان هەر لە سەر ئێمەیە و، تۆ خەفەت مەخۆ.

**بە یاریدەی خودا کۆتایی بە ماناکردنی ئەم سورەتە هات**

# ﴿ سورەتی ئەلفەجر ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٣٠) ئایەتن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلْفَجْرِ ﴿١﴾ وَلَيَالٍ عَشْرٍ ﴿٢﴾ وَٱلشَّفْعِ وَٱلْوَتْرِ ﴿٣﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا يَسْرِ
﴿٤﴾ هَلْ فِى ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِى حِجْرٍ ﴿٥﴾ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ
﴿٦﴾ إِرَمَ ذَاتِ ٱلْعِمَادِ ﴿٧﴾ ٱلَّتِى لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿٨﴾
وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ جَابُوا۟ ٱلصَّخْرَ بِٱلْوَادِ ﴿٩﴾ وَفِرْعَوْنَ ذِى ٱلْأَوْتَادِ ﴿١٠﴾
ٱلَّذِينَ طَغَوْا۟ فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿١١﴾ فَأَكْثَرُوا۟ فِيهَا ٱلْفَسَادَ ﴿١٢﴾ فَصَبَّ
عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ ﴿١٣﴾ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلْمِرْصَادِ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا
ٱلْإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ
﴿١٥﴾ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَهَٰنَنِ ﴿١٦﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان**

﴿وَالْفَجْرِ وَلَيَالٍ عَشْرٍ﴾ وە من سوێند ئەخۆم بە بەیانیان هەموو ڕۆژێ کە جیهان ڕوون ئەکاتەوە و، تاریکی شەو نایەڵێ و، هەموو کەسێ ئەڕوا بەلای کاری خۆیەوە و، من سوێند ئەخۆم بەو شەوانەی بریتین لە (١٠) شەو، زانایان بیروبۆچوونیان زۆرە و لە یەك جیاوازن لە بارەی مەبەست لەو (١٠) شەوە: هەندێکیان ئەڵێن: بریتیە لە دە شەوی سەرەتای هەموو مانگێ، هەندێ تریان ئەڵێن: (١٠) شەوی دوای مانگی ڕەمەزانە، هەندێ تریان لایان وایە بریتی‌یە لە دە شەوی سەرەتای مانگی زیل حیجە، ئەوەی شایانی باسێ مەبەست لەو دە شەوە دیاری نەکراوە و، بەڵگەی بێگومانی لەسەر نی‌یە، چاك وایە هەواڵەی لای خودای بکەین.

﴿وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ﴾ وە من سوێند ئەخۆم بە هەموو ژمارەیەکی جووت و، بە هەموو ژمارەیەکی تاك، سوودی ژمارە بە شێوەی گشتی سوودی زۆرە بۆ ئادەمیزاد: ئەندازەی هەموو

شتێکی پێ دیاری ئەکرێ، سەرچاوەی گەڵێ زانیاری‌یە، ئاماژە ئەکا بۆ ئەوەی چۆن ژمارە دوایی نایە، هەروایش پاشەڕۆژ کۆتایی پێ نایە، بوونەوەران بۆمانەوەی ڕەگەزیان ئەبێ جووتبێ، هەندێ لە زانایان ئەڵێن: وەتر بریتی‌یە لە خودا، هەندێ ئەڵێن: جوت و تاك بریتین لە نوێژەکان، هەندێکیان جوتن و هەندێ تاکن.

﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَسْرِ هَلْ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِذِي حِجْرٍ﴾ وە من سوێند ئەخۆم بەو شەوەی دێت و ئەڕوا و سوێندم بەوانەی باسکران سزای بێباوەڕان ئەدرێ. ئایا لەوانەی من سوێندم پێ خواردن بەڵگەی تەواو هەیە لەسەر بوونی خودا و توانای زانستی خودا بۆ کەسێ خاوەنی ئەقڵە، بێگومان بەڵگەی زۆر بەهێزن لە سەر دەستەڵاتی خودا، بە وێنەی سەوزبوونی گیا بەڵگەیە لەسەر چێنەرەکەی.

﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ﴾ ئایا تۆ نەتزانیوە پەروەدگاری تۆ چۆنی کرد بە نەوەکانی عادی تاقمی هود کە لە ناوی بردن، عاد کوڕی عەوسی کوڕی ئیرەمی کوڕی سامی کوڕی نوح دانیشتووی نێوان عومان و حەزرەمەتە نەژادیان عەرەب بووە، عاد بریتی‌یە لە هۆزی ئیرەم، خاوەنی کۆشکێکی ئەوتۆبوون وێنەی ئەو کۆشکە درووست نەکرابوو لە ناو شاران بەر لەوان، ئەو هۆزە خاوەنی هێز و پیشەسازی‌یەکی وایشبوون وێنەیان نەدرابوو بە هێزی تری پێش خۆیان. لە بارەی ئەو کۆشکە و ئەو شارەی ئیرەم شتی جۆری وا باسکراوە شایستەی ئەوەیە باسیان نەکرێ کە گوایا ئەو شارە لە سەردەمی معاوی‌یەدا بینراوە.

﴿وَثَمُودَ الَّذِينَ جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ﴾ وە تۆ نەتزانیوە پەروەدگاری تۆ چۆنی کردووە بە هۆزی سەمودی تاقمی ساڵح پێغەمەر کەسانێکی ئەوتۆبوون لە شیوەکاندا بەردیان ئەبڕی و ئەیان تاشین بۆ خۆیان، ئەو هۆزە عەرەب بوون و دانیشتووی نێوان شام و حیجاز بوون، لە نەتەوەی کاسیری کوڕی ئیرەمی کوڕی سامی کوڕی نوحبوون. خودای مەزن لە ناوی بردن بە سزای سەخت.

﴿وَفِرْعَوْنَ ذِي الْأَوْتَادِ الَّذِينَ طَغَوْا فِي الْبِلَادِ﴾ وە ئایا تۆ نەتزانیوە پەروەدگاری تۆ چ شتێکی کردووە بە فیرعەون و تاقمەکەی فیرعەونی پادشای میسری خاوەن کۆشکی گەورەی دانراوی نەجولاو وێنەی ئەهرامەکان وەك مێخ چەقابوون بە زەوی‌دا، فیرعەون و تاقمەکەی کەسانێکی ئەوتۆبوون لە ناو شارەکانی خۆیانا لە خودا یاخی بوبون و، لە سنوور و ڕێگەی ڕاست دەرچووبوون.

﴿فَأَكْثَرُوا فِيهَا الْفَسَادَ فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ﴾ دووایی فیرعەون و تاقمەکەی خراپەیە زۆریان لە ناو شارەکاندا دەست پێکردبوو لە کوشتن و لە ستەم و لە بێباوەڕی.

دووایی پەروەدگاری تۆ ڕژاندی بە سەریانا سزای زۆر سەخت و بە ئاو خنکـاندنی و لـە نـاوی بردن.

﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ﴾ بە ڕاستی پەروەدگاری تۆ لـە چاودێری و کەمیندایە بۆ ستەمکاران و بێباوەڕان. پاداشتی هەموو ئادەمیزادێ ئەداتەوە بە گوێرەی کردەوەی خۆیان.

دووایی ئەگەر بتەوێ ئادەمیزاد بناسی بەرانبەر ئەو هەمووە چاکانە خودا لـەگەڵیان، کـەچی بەرانبەر بەو چاکانە هەریەکەیان بە جۆرێکی نارەوا تەماشای خودا ئەکەن، وەك ئەفەرموێ:

﴿فَأَمَّا الْإِنْسَانُ إِذَا مَا ابْتَلَاهُ رَبُّهُ فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَكْرَمَنِ﴾ دووایی هەرکاتێ ئادەمیزاد پەروەدگاری خۆی ئەوی تاقی کردبێتەوە هەتا بزانرێ سوپاسی خودا ئەکا یا نای کا، ئەوچاکە و سامانەی بەوی بەخشیوە لە خزمەتی هـەژاران و بـەرزی ئیسلامدا بـەکاری ئـەهێنێ، دووایـی پەروەردگاری خۆی ڕێزی گرت و شادمان و بەهرەمەندی کرد، دووایی لـە خـۆی ئـەگۆڕێ و یاخی ئەبێ و ئەڵێ: پەروەدگار ڕێزی منی گرتووە، پلەو پایە و سامانی زۆری داومـەوتێ و، لـە ڕابواردن و خۆشی خۆمدا بەکاری بهێنم، هەرکەسێ خودا ڕێزی گرت خراپەی لـەگەڵ ناکا.

﴿وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلَاهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَهَانَنِ﴾ وە ئەگەر هەرکاتێ پـەروەدگاری تـۆ ئەو کەسەی تاقی کردەوە و ڕۆزی و دارایی لێ گرتەوە کەمێ، هەتا بزانرێ بەندەیەکی خۆڕاگرە و بە کاری خودا ڕازیە، دووایی هەندی لـەو کەسانە ئەڵێن: پەروەدگاری من منی بـە بـێنرخ داناوە و ڕسوای کردووم و، هەژاری کردووم، خودای مەزن هەموو شتێ لـە جێگـای شیاوی خۆیا دائەنێ، کەواتە ئادەمیزاد واز لـەو گومانانەی خۆی بهێنێ، ڕێز و پەستی ئادەمیزاد بەبۆنەی هەژاری و سامانداریەوە نییە، وەك خودای گەورە ئەفەرموێ:

كَلَّا بَل لَّا تُكْرِمُونَ الْيَتِيمَ ﴿١٧﴾ وَلَا تَحَاضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ
الْمِسْكِينِ ﴿١٨﴾ وَتَأْكُلُونَ التُّرَاثَ أَكْلًا لَّمًّا ﴿١٩﴾
وَتُحِبُّونَ الْمَالَ حُبًّا جَمًّا ﴿٢٠﴾ كَلَّا إِذَا دُكَّتِ الْأَرْضُ دَكًّا
دَكًّا ﴿٢١﴾ وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ﴿٢٢﴾ وَجِيءَ يَوْمَئِذٍ
بِجَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ الْإِنسَانُ وَأَنَّىٰ لَهُ الذِّكْرَىٰ ﴿٢٣﴾
يَقُولُ يَا لَيْتَنِي قَدَّمْتُ لِحَيَاتِي ﴿٢٤﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُ أَحَدٌ ﴿٢٥﴾
وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُ أَحَدٌ ﴿٢٦﴾ يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ارْجِعِي
إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ فَادْخُلِي فِي عِبَادِي ﴿٢٩﴾ وَادْخُلِي جَنَّتِي ﴿٣٠﴾

﴿كَلَّا بَل لَا تُكْرِمُونَ الْيَتِيمَ وَلَا تَحَاضُّونَ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ﴾ ڕێـزی ئـادەمیزاد لای خـودا بـه دارایی نی‌یه. بەڵکو به خۆپاراستنه لـه بێ فەرمانی خودا، بێ نرخی بـه بۆنـەی هەژاری‌یـەوه نی‌یـه. بەڵکو بەهۆی نیاز و کردەوەی خراپه. بەڵکو ئێوه خراپترینی ئادەمیزادن لەبەر ئەمانەی دووایی:

١- ئێوه ڕێزی هەتیوی دەربەدەر کراو ناگرن هیچ کەسێ نی‌یه بیانپـارێزێ و بـەخێویان بکـا و ئاگای لێیان بێ وچاودێریان بکا. نه کاربەدەستان و نه خزم و نه ساماندار.

٢- وه ئێوه هەندێکتان هـانی هـەندێ ترتـان نـادەن لـەسـەر خواردەمـەنی دان بـه هـەژاران و لێقەوماوان و، کاروباریان چاك بکەن و دەست گیرۆی‌یان بکرێ.

٣- ﴿وَتَأْكُلُونَ التُّرَاثَ أَكْـلاً لَمّـاً﴾ وه ئێـوه کەلـەپور و پاشماوەی دارایـی مـردووان ئـەخۆن بەخواردنێکی سەخت و ناڕەوا و، نایدەن به خاوەنه ڕاستی‌یەکەی خۆیان، به تایبەتی ئەوانـەی ژن و منداڵن.

٤- ﴿وَتُحِبُّونَ الْمَالَ حُبّاً جَمّاً﴾ وه ئێوه دارایتان خۆش ئـەوێ بـه خۆشـبوونێکی زۆر، مـیراتی هەتیوانبێ یا جگەی هەتیوانبێ، ئەو دارایی‌یه ڕەوابێ یا ناڕەوا.

﴿كَلَّا إِذَا دُكَّتِ الْأَرْضُ دَكّاً دَكّاً﴾ نابێ ئادەمیزاد چروك و ڕژد بێ بۆ بەخشینی دارایی خۆیان لـه ڕێگەی ئایینی خودادا، چونکه ئێوه پەشیمان ئەبنەوه کاتێ زەوی هـەموو پارچـەکانی بـه بـەرزی و نزمـی کێوەکـانی کێشـیان نامێنـێ، ئـەدرێن لـه یـەك لـه دوای لێـدان، زەوی و هـــەموو شـتێ بەسەری‌یەوەیەتی نامێنن.

﴿وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفّـاً صَفّـاً﴾ وه کاتـێ فـەرمانی پـەروەدگاری تـۆ دەسـتەڵات و سـامی دەرکەوت و، فریشتەکان لـه ئاسمان هاتنه خوارەوه پۆل به پۆل ڕیز ئەبن ڕیز لـه دوای ڕیز.

﴿وَجِيءَ يَوْمَئِذٍ بِجَهَنَّمَ﴾ وه لـەو ڕۆژەدا دۆزەخ دەرخرا بۆ تەماشا کەران و، بو به بوونەوەرێکی دەرکەوتوو، دوای ئەوەی لـەو شتانه بوو نادیاری بوون و، نه ئەبینرا.

﴿يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ الْإِنسَانُ وَأَنَّى لَهُ الذِّكْرَى﴾ لەو ڕۆژەدا ئادەمیزاد بیری ئەکەوێتـەوه ئـەو شتەی کردوویەتی لـه جیـهاندا و، چ کاتـێ بـیر کردنـەوه سـوودی ئـەبێ، لـەو کاتـەدا ئامۆژگـاری و بیرکردنەوه سودێ بەو نابەخشێ. دووایی به دڵێکی خەفـەتبارەوه کـه جێگـەی خـۆی ئـەبینێ لـه دۆزەخدا.

﴿يَقُولُ يَا لَيْتَنِي قَدَّمْتُ لِحَيَاتِي﴾ ئەو ئادەمیزاده ئەڵێ: خۆزگایه من لـه جیهاندا کردەوەی چـاکم پێش بخستایه بۆ ژیانی ئەم ڕۆژەی دووایی خۆم که مردنی تێدا نی‌یه لـەمەودوا.

﴿فَيَوْمَئِذٍ لَا يُعَذِّبُ عَذَابَهُ أَحَدٌ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُ أَحَدٌ﴾ دووایـی لـەو ڕۆژەدا هیـچ کەسـێ سـزای ساماندارێ یاخی و هەژارانی تاوانبار نادا به وێنەی سزای خودا و، هیچ کەسێ پێون و کەلـەپچـەی ئەوان ناکا و توندی ناکا به وێنەی پێون و کەلـەپچەی خودا لـه توندیدا.

دوای ئەوەی خودای مەزن باسی ساماندارانی ڕژد و چروك و، هەژارانی خۆنەگر و خرابی کرد و، باسی سزادانی کردن، دووایی باسـی ئـەو کەسـانه ئـەکا خۆڕاگـرن لـەسـەر فـەرمانی خـودا و ئەفەرموێ:

﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً فَادْخُلِي فِي عِبَـادِي وَادْخُلِي جَنَّتِـي﴾ ئەی ئەو دەروونەی ڕوتی لـه خراپه و ئاسوودەیی و ناترسی و به یادی خودا ئـارامت گرتـووه، تـۆ بگەڕێرەوه بۆلای شتێ خودا بەڵێنی پێداوی لـه پاداشتی چاك، پەسەندی بکـه ئـەو پاداشـته بـه تـۆ دراوه، پەسەند کراوه کردارەکانی تۆ، دووایی تۆ تێکەڵاوی ناوبەنده چاکەکانی من ببـه و، بـڕۆره ناو بەهەشتی منەوه به بەردەوامی.

# ﴿ سورەتی ئەلبەلەد ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٢٠) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
لَا أُقْسِمُ بِهَٰذَا الْبَلَدِ ﴿١﴾ وَأَنتَ حِلٌّ بِهَٰذَا الْبَلَدِ ﴿٢﴾ وَوَالِدٍ وَمَا وَلَدَ
﴿٣﴾ لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي كَبَدٍ ﴿٤﴾ أَيَحْسَبُ أَن لَّن يَقْدِرَ عَلَيْهِ
أَحَدٌ ﴿٥﴾ يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالًا لُّبَدًا ﴿٦﴾ أَيَحْسَبُ أَن لَّمْ يَرَهُ أَحَدٌ
﴿٧﴾ أَلَمْ نَجْعَل لَّهُ عَيْنَيْنِ ﴿٨﴾ وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ ﴿٩﴾ وَهَدَيْنَاهُ
النَّجْدَيْنِ ﴿١٠﴾ فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ ﴿١٢﴾
فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ أَوْ إِطْعَامٌ فِي يَوْمٍ ذِي مَسْغَبَةٍ ﴿١٤﴾ يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ
﴿١٥﴾ أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ ﴿١٦﴾ ثُمَّ كَانَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَتَوَاصَوْا
بِالصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا بِالْمَرْحَمَةِ ﴿١٧﴾ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ ﴿١٨﴾ وَالَّذِينَ
كَفَرُوا بِآيَاتِنَا هُمْ أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ ﴿١٩﴾ عَلَيْهِمْ نَارٌ مُّؤْصَدَةٌ ﴿٢٠﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان**

﴿لا أُقْسِمُ بِهَذَا الْبَلَدِ﴾ بە ڕاستی من سوێند ئەخۆم بەو شارە پیرۆزەی مەککە کە دروستکراوە بە پیرۆزی کراوە بە ڕوانگە بۆ پەرستنی خودا و، گەورەترین پێغەمەری تێدا لە دایك بووە و، نێردراوە بە چاکە بۆ بوونەوەران.

﴿وَأَنْتَ حِلٌّ بِهَذَا الْبَلَدِ﴾ وە لە کاتێکا تۆ دانیشتووی لەو شارەدا، بۆیە پلەوپایەی بەرزی دراوەتێ بە لە دایکبوونی تۆ و دانیشتنی تۆ لەو شارەدا.

﴿وَوَالِدٍ وَمَا وَلَدَ لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ فِي كَبَدٍ﴾ وە من سوێند ئەخۆم بە هەموو باوکەکان ئادەمیزادبێ یا گیانداری تر یا درەخت و ڕووەك بێ و، سوێند بە شتەی لەوان پەیدا ئەبێ، سوێندم بەوانەی باسکران. بە ڕاستی ئێمە ئادەمیزادمان درووست کردووە لە ناو ئازار و

ڕەنجدا، خۆی ماندوو ئەکا بۆ پەیداکردنی ئارەزۆی خۆی لە جیهاندا، دووایی لەگەڵ ئەو ژیانە سەختە تووشی ئازاری سەرەمەرگ و ئازاری تاریکی گۆڕ و گرانی ڕۆژی دووایی و، بە خزمەت گەیشتنی خودا و پرسیار و وولاّم ئەبێ، لە شتێ ووتوویەتی و کردوویەتی.

هەندێ لە زانایان ئەڵێن: مەبەست لە (والد) ئادەمە و لە (مولود) لە منالّ و نەوەکانی‌یەتی.

﴿أَيَحْسَبُ أَنْ لَنْ يَقْدِرَ عَلَيْهِ أَحَدٌ﴾ ئایا ئادەمیزاد گومان ئەبا هیچ کەسێ توانای بەسەریانا، بە هێز و توانا و سامانی جیهانەوە ئەنازرێ، لە بیری چووەتەوە و خودا درووستی کردووە و لاواز و بێ دەستەلاّتە.

﴿يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالاً لُبَداً أَيَحْسَبُ أَنْ لَمْ يَرَهُ أَحَدٌ﴾ کاتێ بە ئادەمیزادە سامانداره‌کان بێژرێ بۆچی دارایی خۆت نابەخشی لە ڕێگەی ئایینی خودا؟ ئەڵێ: من دارایی زۆرم لە ناو داوە، بە جۆرێ نزیکە هیچ داراییم نەمێنێ، ئایا ئەو ئادەمیزادە ساماندارە چرووکە گومان ئەبا هیچ کەسێ ئاگای لەو کەسە و لە کردار و نیازی ئەو نی‌یە، خودا ئاگای لە نهێنی و ئاشکرای هەموو کەسێ هەیە.

﴿أَلَمْ نَجْعَلْ لَهُ عَيْنَيْنِ وَلِسَاناً وَشَفَتَيْنِ وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ﴾ ئایا ئێمە دووچاومان نەداوە بەو کەسەی ئەڵێ: من دارایی زۆرم لە ناو داوە چاك و خراپی پێ ببینێ و، زمانێك و دوو لێومان نەداوەتێ گفتوگۆی پێ بکا و، ڕێگەی چاك و خراپمان بەو نیشان نەداوە و، ئەقڵی خۆی بخاتە کار و ڕێگەی چاك بگرێ و کاری سوود بەخش ببینێ و گفتوگۆی چاك بکا، ئیتر چۆن ئەڵێ چ کەسێ هەیە پرسیار لە من بکا، ئایا من دارایی خۆم ئەبەخشم یا نای بەخشم؟

﴿فَلا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ﴾ دووایی ئەو کەسە پەلاماری کاری سەخت و گرانی نەداوە و، دارایی خۆی نابەخشێ بەو کەسانە ئازار ئەچێژن، سوپاسی خودا ناکا و چ شتێکە بە تۆی بناسێنێ کاری سەخت و گران بە تۆی بناسێنێ.

﴿فَكُّ رَقَبَةٍ أَوْ إِطْعَامٌ فِي يَوْمٍ ذِي مَسْغَبَةٍ يَتِيماً ذَا مَقْرَبَةٍ أَوْ مِسْكِيناً ذَا مَتْرَبَةٍ﴾ کاری سەخت ئەمانەن: ئازادکردنی بەندەیە، یا خواردەمەنی‌دان بە هەژاری برسی لە ڕۆژی گرانیدا بە هەتیوێکی خزم یا هەژارێکی بێ دەرامەت و پەك کەوتە. لە جێگەیە بەندکردنی تاکە کەسێ لای خودا زۆر ناڕەوابێ و، ئازادکردنی ئەوەندە چاکبێ، ئەبێ داگیرکردنی کۆمەڵێ چەندە خراپ بێ و، ڕزگارکردنیان لە ئازار و سەختی ئەبێ چەندە چاکبێ؟

﴿ثُمَّ كَانَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا بِالْمَرْحَمَةِ أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ﴾ لە پاش ئەوەی بەندە ئازاد بکا و، خواردن بدا بە هەژاران، پێویستە لەو کەسانەی ئەوتۆشبێ باوەڕی بێگومانی هێناوە و، ئامۆژگاری یەکتری بکەن و ڕاسپێرێ ئارام بگرن لەسەر ئازار و،

هەوڵدان لەسەر چاکە و، بە دانیشتووان ڕاسپێرێ و ئامۆژگاری‌یان بکا بـەزەیی‌یان بـە یـەکتردا بێتەوە و میهرەبانبن لەگەڵ یەکتری، ئەو کەسانە خاوەنی بەختیارین و نامەی کرداری‌یان ئەدرێ بە دەستی ڕاستیانەوە لە ڕۆژی دوواییدا.

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا هُمْ أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ عَلَيْهِمْ نَارٌ مُؤْصَدَةٌ﴾ وە کەسانێکی ئـەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە بە ئایەتەکانی نامەی ئێمە و، بەو شتانەی بەڵگەن لەسەر تەنـهایی ئێمـە، ئـەو کەسانە یار و خاوەنی بەدبەختی و ڕسواین و، نامەی کرداریان ئەدرێ بە دەسـتی چەپی‌یانـەوە، ئاگری دۆزەخ کۆ ئەبێتەوە لەسەریان هەتا هەتایە.

# ﴿ سورەتی شەمس ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (١٥) ئایەتن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا ﴿١﴾ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا ﴿٢﴾ وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا ﴿٣﴾
وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰهَا ﴿٤﴾ وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ﴿٥﴾ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا طَحَىٰهَا
﴿٦﴾ وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدۡ
أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾ كَذَّبَتۡ ثَمُودُ
بِطَغۡوَىٰهَآ ﴿١١﴾ إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشۡقَىٰهَا ﴿١٢﴾ فَقَالَ لَهُمۡ رَسُولُ ٱللَّهِ
نَاقَةَ ٱللَّهِ وَسُقۡيَٰهَا ﴿١٣﴾ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمۡدَمَ
عَلَيۡهِمۡ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمۡ فَسَوَّىٰهَا ﴿١٤﴾ وَلَا يَخَافُ عُقۡبَٰهَا ﴿١٥﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان**

خودای مەزن لەم سورەتەدا سوێندی خواردووە بە ڕووناکی و بە تاریکی و، بە ئەستێرەکان و کاری توند و تۆڵیان و، بە زەوی و بە ڕاخستنی و، بە گیانی ئادەمیزاد و ئامادەبوونی و، ڕوونی ئەکاتەوە ئەو کەسەی لە خودا بترسێ ڕزگاری ئەبێ و سەرکەوتووە، ئەو کەسەی تاوانبارە و لە خودا ناترسێ سەرشۆڕ و زیانۆمەندە و ئەفەرموێ:

﴿وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا وَالْقَمَرِ إِذَا تَلاهَا وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا﴾ وە من سوێند ئەخۆم بەو خۆرەی کە هۆی سەرەکی ژیانی بوونەوەرانە و، گەورەترین شتێکە لە سەرەوەی زەوی، سوێند ئەخۆم بە ڕووناکی خۆر لە کاتی چێشتەنگاودا و، سوێند ئەخۆم بەو مانگەی کاتێ دوای خۆر ئەکەوێ لە ڕووناکی‌دا و، ڕووناکی‌یەکەی بەهۆی ڕووناکی خۆرەوەیە، دوای خۆر ئەکەوێ، ئەگەر لە خۆرەوە نزیکبێ ڕووناکی‌یەکەی کەمە و ئەگەر دووربێ زۆرترە، بە تایبەتی لە نێوی مانگەکاندا.

﴿وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا﴾ وە من سوێند ئەخۆم بە ڕۆژ کاتێ خۆر ئاشکرای ئەکا و، دەری ئەخا بۆ تەماشاکەران و، وە من سوێند ئەخۆم بە شەو کاتێ خۆر دای ئەپۆشێ و، جیهان تاریك ئەبێ. کەواتە بەهۆی خۆرەوە ڕووناکی ڕۆژ و، ڕووناکی مانگ و زەوی پەیدا ئەبێ و، کاتێ زەوی بەخۆی و ئەو شتانەی بەسەری‌یەوەنە ئەگەڕێ بە دەوری زەوی‌دا.

﴿وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا وَالْأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا﴾ وە من سوێند ئەخۆم بە ئاسمان و بە درووستبوونی ئاسمان و، ئەو شتانەی بە ئاسمانەوەن: لەو ئەستێرانەی کە هەریەکەیان لە بازنەی تایبەتی خۆیاندا ئەسووڕێنەوە، هەندێکی‌یان بەهۆی کێشی هەندێکی‌یانەوە وەستاون و، من سوێند ئەخۆم بە زەوی و بە ڕاخستن و ئامادەکردنی بۆ دانیشتن و پشوودانی گیانداران.

﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا﴾ وە من سوێند ئەخۆم بە دەروونی ئادەمیزاد و بەڕێکخستنی، بە جۆرێ هێزێکی ئاشکرا و توانایەکی نهێنی‌مان داناوە لە دەروونیا و، دوودەست و دوو پێ و دوو چاو، دوو گوێ و ئەندامەکانی ترمان داونەتێ، ئەو دەروونەی خودا داوی‌یەتی بە ئادەمیزاد، ئێمە بە ڕاستی نایزانین، بە جگەی بیستن و بینین و جوولە و هەست بە ئازار و خۆشی نەبێ.

﴿فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴾ دووایی خودا بێ‌فەرمانی و پەرستنی خۆی فێری ئەو دەروونەی کردووە، ئامادەیی تەواوی تێدا درووست کردووە بۆ کردنی کاری چاك و خراپ بە یەکەوە، بە جۆرێ توانای لەسەرکردنی یەکێکیان یەکسانە بە لە سەرکردنی ئەوی تریان و، فەرمانی پێداوە چاکە بکا و خراپە نەکا.

﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا﴾ سوێندم بەوانە هەموو: ڕزگاری بووە لە سزای خودا کەسێ دەروونی خۆی پاك کردووەتەوە لە خراپە و بێ‌فەرمانی خودا و، بە ڕاستی بێ ئومێدە لە بەزەیی و لێبوردنی خودا کەسێ زیانی گەیاندبێ بە دەروونی خۆی. دەروونی ئادەمیزاد گوناه کەڵەکەی کردووە لەسەری، ڕوو وەرئەگێڕێ لە ڕاستی، وەك هۆزی سەمود.

﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَاهَا إِذِ انْبَعَثَ أَشْقَاهَا﴾ هۆزی سەمود بەهۆی یاخی بوون و لە سنوور دەرچوونیان ساڵحی پێغەمەری خۆیانیان بە درۆخستەوە کاتێ بە پەلە خراپترین کەسی ئەو هۆزە هەڵسا بە سەربڕینی ئەو هوشترە کە خودا کردبووی بە کاری پەك خەر بۆ ساڵح و بەڵگە لەسەر ڕاستی و پێغەمەرایەتی ئەو.

ئەو فەرموودەی خودایە لەوەوە هاتووە، خودای گەورە ساڵح پێغەمەری نارد بۆلای هۆزی سەمود، ئەوانیش داوای کارێکی پەکخەریان لێ‌کرد، خودای گەورە لەسەر داوای ئەوان هوشترێکی شیردەری کرد بە کاری پەکخەر بۆ ساڵح، بەو جۆرە وابوو کە ئەو هۆزە داوایان کردووە.

﴿فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ نَاقَةَ اللَّهِ وَسُقْيَاهَا﴾ دووایی خودا ئەو هوشترەی بۆنــاردن بـە وێنـەی داخوازییەکەی خۆیان نێردراوەکەی خودا ووتی بەان: ئێوە واز لە هوشــترە بـهێنن کـە خـودا کردوویەتی لەسەر ڕاستی پێغەمەرایەتی من با بۆخۆی بلەوەڕێ و ئــازای مـەدەن و، ئاگـاداری بەشە دیاریکراوەکەی لە ئاو خواردنەوەکەی بکەن و، دەست درێژ مەکەنە سـەری، هـەتا لـە نۆرەی خۆیا بەشە ئاوی خۆی بخوا، ئێوەیش بەشە ئاوی دیاریکراوی خۆتان بخۆنەوە.

﴿فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُمْ بِذَنبِهِمْ فَسَوَّاهَا وَلَا يَخَافُ عُقْبَاهَـا﴾ دوای ئـەوەی ســاڵح ئامۆژگاریئەو هۆزەکەی کرد، دووایی ئەو هۆزە پێغەمەرەکــەی خودایـان بـە درۆخســتۆتەوە، باوەڕیـان پـێ نـەهێنا، دواتریـش هوشــترەکەیان سـەربڕی، دووای بەدرۆخســتنەوەی ســاڵح و سەربڕینی ئەو هوشترە، پەروەدگاری ئەوان سزای زۆر سەختی نارده سەریان و بنـەبڕی کـردن، دووایی بە یەکسانی ئەو سزایە هەموویانی گرتەوە، بە گەورە و مناڵ و، بە خانوو ئاژاڵیانەوە و، خودا ناترسێ لە سزادانیان لە ڕۆژی دووایدا، ئەگەر ئەو پیاوە خراپە ئەو هوشترە سەربڕێ.

# ﴿ سورەتی لەیل ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٢١) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ ﴿١﴾ وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ﴿٢﴾ وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ ﴿٣﴾
إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّىٰ ﴿٤﴾ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾
فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ
﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾ وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُ إِذَا تَرَدَّىٰ ﴿١١﴾ إِنَّ عَلَيْنَا
لَلْهُدَىٰ ﴿١٢﴾ وَإِنَّ لَنَا لَلْآخِرَةَ وَالْأُولَىٰ ﴿١٣﴾ فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ﴿١٤﴾
لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى ﴿١٥﴾ الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٦﴾ وَسَيُجَنَّبُهَا
الْأَتْقَى ﴿١٧﴾ الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُ مِن
نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰ ﴿١٩﴾ إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الْأَعْلَىٰ ﴿٢٠﴾ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ ﴿٢١﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان**

﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّى﴾ وە من وسێند ئەخۆم بە شەو کاتێ بە تاریکی‌یەکەی ڕووناکی ڕۆژ هەموو شتێ دائەپۆشێ و، من سوێند ئەخۆم بە ڕۆژ کاتێ ڕووناك ئەبێتەوە و، تاریکی شەو لا ئەبا.

﴿وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى﴾ وە من سوێند ئەخۆم بە درووستبوونی نێر و مێ لە هەموو گیاندارێکا: ئادەمیزادبێ یا گیانداری تر، یا درەخت و ڕووەك بێ و، بەو هۆیەوە زاوزێ پەیدا ئەبێ و، مانەوەی گیانداران درێژە ئەکێشێ و زۆر ئەبن.

پرسیار: ئایا چ کەسێکی ئەوتۆیە گیانی لە بوونەوەرێکا داناوە و، لە بوونەوەرێ تردا گیانی دانەناوە، چ کەسێکی ئەوتۆیە گیاندارانی ئامادەکردووە و شایستە و شیاوی کردوون بۆ پیشەی زاوزێ و؟ بۆ جارێ ئەو منالّە نێر ئەبێ و جارێ مێ کەچی سەرچاوەکانیان هەریەك سەرچاوەیە؟

وەلآم: بێگومان ئەو کەسەی ئەو کارانەی کردووە خودایەکی زۆر زانا و بە توانایەکی ئەوتۆیە هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ و، پەیڕە و پرۆگرامێکی تەواوی داناوە بۆ هەموو شتێ. بە تایبەتی درووستکردنی گیانداران جارێ نێربێ و جارێ مێ، ئەگەر هەریەکێکیان بێ گیانداران بنەبڕ ئەبن. ڕێکەوتی کوێر نەزان چۆن ئەتوانێ بوونەوەران درووست بکا؟

﴿إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّى﴾ سوێندم بەوانە هەموو: کاروکردەوەی ئێوە جیاوازن، هەبانە چاکن و هەیانە خراپن، هەندێکی‌یان جوانن و هەندێ تریان ناشیرین، هەندێکی بەخشین و دەستگیرۆیبە، هەندێکی چرووکبە، هەندێکی باوەڕداری و هەندێکی بێ‌باوەڕی و، هەتا دێ وەك خودا ئەفەرموێ:

﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى﴾ دووایی هەرکەسێ دارایی خۆی ببەخشێ لە ڕێگەی ئایینی خودا و چاکەدا و، لە خودا بترسێ و خۆی لە بێ‌فەرمانی خودا بپارێزێ و، بڕوای بێگومانی بووبێ بەوەی کاری چاك و پاك شیرینترە لە کاری خراپ و، بڕوای بە بوونی بەهەشت و دۆزەخ بووبێ و، بە گوێرەی فەرمانی خودا کاری بۆ کردبن، دوایی ئێمە بۆ ئەو کەسە ئامادە ئەکەین ئاسانترین ڕێگە.

﴿وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى﴾ وە هەرکەسێ چروك و ڕژد بووبێ، بەبۆنەی پلەو پایە و سامانی خۆیەوە، ئومێد و نیازی بە یاریدانی خودا و، پاداشتی ڕۆژی دووایی نەمابێ، لەبەر ئەوانە بەزەی بە کەسانە ئەهاتو، هەر خۆی مەست بووبێ و، باوەڕی بە بەهەشت و دۆزەخ و کاری ڕەوا و نارەوا نەمابێ و، دووایی ئێمە ئامادە ئەکەین بۆ ئەو کەسە هەموو شتێ ڕاییکێشی بۆلای ئاگری دۆزەخ، چونکە گرانترین شت لای ئەو پەرستنی خودا و ڕێگەی چاکبووە و، ڕێگەی خراپی لا چاك بووە.

﴿وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُ إِذَا تَرَدَّى﴾ وە دارایی ئەو کەسە هیچ سوودێکی پێ نابەخشێ کاتێ مردو کەوتە ناو دۆزەخ و قوولآیی خراپە و کردەوەی خراپەی خۆی و، ئەوەی هەیبوو ڕزگاری ناکا و، بە سەربەستی خۆی وازی لە ڕێگەی چاك هێناوە و، ڕێگەی خراپی بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

چۆن خودای مەزن واز لە ئادەمیزادی خراپ ئەهێنێ و، ئەیداتە دەستی خۆی و ئارەزۆی خۆی، ئەگەر خودا ئەو کارە بکا دژی دادپەروەری خودایە جیاوازی لە نێوان چاك و خراپدا نابێ، بۆیە ئەفەرموێ:

﴿إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَى﴾ بە ڕاستی لەسەر ئێمەیە ڕێگەی چاك و خراپ بۆ بەندەکانی خۆمان ڕوون بکەینەوە، مژدەیان بدەینێ بە پاداشتی چاك و بیان ترسێنن لە سزای سەخت و، ئەقڵمان داونەتێ، خۆیان سەربەستن و خۆیان بەرپرسیارن، ئێمە زۆر لە کەس ناکەین و ناچاریان ناکەین بۆ کردنی هیچ کارێ.

﴿وَإِنَّ لَنَا لَلْآخِرَةَ وَالْأُولَى﴾ وە بە ڕاستی تەنها هەر بۆ ئێمەیە خاوەنداری هەموو شتێ لە پاشەڕۆژ و لە جیهاندا، پەرستنی هیچ کەسێ سوود بە ئێمە نابەخشێ و، بێفەرمانی ئەوان زیان لە ئێمە نادا، گوناهباران ڕێگەی ڕاکردنیان بۆ نییە، لە دەستەلاتی ئێمە دەرناچن.

﴿فَأَنْذَرْتُكُمْ نَاراً تَلَظَّى لا يَصْلاهَا إِلَّا الْأَشْقَى الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّى﴾ دوایی ئێمە ئێوەمان ترساندووە لە ئاگرێکی ئەوتۆ گڕ ئەسێنێ و کڵپەی دێ. بۆ ئەوەی کەسێ بێفەرمانی خودای کردووە پەشیمان ببێتەوە، سزای ئەو ئاگرە ناچێژێ مەگەر کەسێکی زۆر خراپی ئەوتۆ بڕوای بە پێغەمەران و بە ڕاستی نەهێنابێ و، وازی لە پەرستنی خودا هێنابێ.

﴿وَسَيُجَنَّبُهَا الْأَتْقَى الذي يؤتي مالَهُ يَتَزَكَّى﴾ وە خودا کەسێکی زۆر لە خواترسی ئەوتۆ لە ئاگری دۆزەخ دوور ئەخاتەوە دارایی خۆی ببەخشێ لە ڕێگەی چاکەدا بۆ ئەوەی دەروونی خۆی لە چروکی ڕژدی پاك بکاتەوە.

﴿وَمَا لِأَحَدٍ عِنْدَهُ مِنْ نِعْمَةٍ تُجْزَى إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الْأَعْلَى وَلَسَوْفَ يَرْضَى﴾ وە لە لای ئەو کەسەی دارایی خۆی بەخشی نیاز و ئومێدی بە چاکەی هیچ کەسێ نەبوو پاداشتی چاکەی بدرێتەوە، جگە لە داواکردنی ڕەزامەندی پەروەردگاری بالاتر لە هەموو کەسێ و، لەمەودوا ئەو کەسە ڕازی ئەبێ لە پاداشتی خۆی زانایان زۆریان ئەڵێن، هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتانە، لە بارەی ئەبوبەکرەوە هاتوونەتە خوارەوە.

# ﴿ سورەتی ضوحا ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (١١) ئایەتن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
وَٱلضُّحَىٰ ﴿١﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ ﴿٢﴾ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴿٣﴾
وَلَلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ ٱلْأُولَىٰ ﴿٤﴾ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ
فَتَرْضَىٰٓ ﴿٥﴾ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـَٔاوَىٰ ﴿٦﴾ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا
فَهَدَىٰ ﴿٧﴾ وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ ﴿٨﴾ فَأَمَّا ٱلْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ
﴿٩﴾ وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ ﴿١٠﴾ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴿١١﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان**

زانایان ئەڵێن: پێغەمەری خودا، دووای ئەوەی یەکەم جار سروشی بۆ هات، دوای ئەو جارە بۆ ماوەی دوو ساڵ سروشی تری بۆ نەهات، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ زۆری خەفەت ئەخوارد و لای وابوو خودا وازی لێهێناوە، زۆر ئارەزۆمەندی هاتنە خوارەوەی سروش بوو بۆلای، هەندێ تر لە زانایان ئەڵێن لای بێباوەڕان وابوو موحەممەد خوداکەی ڕقی لێ هەڵساوە و، وازی لێهێناوە بەهەرجۆرێ بێ خودای مەزن فەرمووی:

﴿وَالضُّحَى وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى﴾ وە من سوێند ئەخۆم بە کاتی چێشتەنگاو کە کاتی بەرزبوونەوەی خۆرە لە سەرەتای ڕۆژدا و، سوێند ئەخۆم بە شەو، کاتێ تاریکی‌یەکەی هەموو شتێ ئەگرێتەوە، گیانداران پشو ئەدەن و، ماندوویی ڕۆژیان نامێنێ.

﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى﴾ سوێندم بەو شتانە: پەروەدگاری تۆ وازی لە تۆ نەهێناوە و، تۆی ناخۆش نەویستووە لە جیهاندا لەو کاتەوە تۆی درووست کردووە و، تۆی خۆش ئەوێ و، سروش بە بەردەوامی دێتە خوارەوە بۆ سەرتۆ.

﴿وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَكَ مِنَ الْأُولَى وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى﴾ وە بە ڕاستی ژیانی پاشەڕۆژ چاکترە بۆ تۆ لە ژیانی جیهان و لە یەکەم جاری هاتنە خوارەوەی سروش بۆلای تۆ، ئەوەبوو ڕۆژ بە ڕۆژ سەدان کەس موسڵمان ئەبوون، نەتەوەکانی تر و هۆزەکانی تری عەرەب، هاتن و

باوەڕیان هێنا، هەر بەو جۆرە بەردەوامــە هــەتا ڕۆژی دوواییـی، پلــەی تـر لــە پاشــەڕۆژدا زۆر گەورەترە، سەرەڕای ئەوەیش خودای پەروەردگاری تۆ لە پاشەڕۆژدا شتی زۆر چاکی تری وات پیٚ ئەبەخشیٚ لـە پاداشت و لـە پاڕانەوە بۆ ئادەمیزاد بە تایبــەتی بـۆ موسـڵمانان، دوواییی ڕازی ئەبیٚ و خۆشنوود ئەبیٚ لەو چاکانە.

لـە دووایدا خودای مەزن باسی هەندیٚ لەو چاکانە ئــەکا بــەر لــەوەی بکـریٚ بـە پێغەمــەر لەگەڵ پێغەمەری کردووە، وە ئەوەتە ئەفەرمویٚ:

﴿أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيماً فَآوَى﴾ ئایا خودا بە هەتیوی تۆی نەزانی و باوکت نەبوو بەخێوت بکـا و، دووایی خودا تۆی حەسانەوە و چاودێری کردی، بەوەی دوای ئەوەی باوکت لە مەدینــە مـرد و، تۆ لـە منداڵدانی دایکتا بووی و، دوای لـە دایکبوونــت عەبدولموتــەلیبی باپـیرت بـۆ مـاوەی هەشت ساڵ تۆی بەخێوکرد و زۆر بە باشـی، دووای مردنـی باپـیرت ئـەبوتالیبی مـامت تـۆی بەخێوکرد هەتا تەمەنی ۲۰ ساڵی، دووای مردنی ئەو قوڕەیشی‌یەکان ڕێگەیان بـۆ ئاسـانکرا و، تۆیان ناچار کرد کۆچ بکەی بۆ مەدینە و، لەوێش باشتر من تۆم بەخێوکرد و حەسایتەوە.

﴿وَوَجَدَكَ ضَالاً فَهَدَى﴾ وە خـودای زانیبـووی بەسـەرگەردانی تـۆ لــە بـارەی کــاری تاقمەکەتەوە و، گومڕاییان لـە بارەی بیر و باوەڕی پوچیانەوە و، لاسایی کردنەوەی باپیریــان لــە بت پەرستیدا و کردەوەی خراپی‌یان و پارچە پارچەبوونی بیرو ڕایان و، نەت ئەزانی چـۆن بیـان خەیتە سەر ڕێگەی ڕاست هەتا سروش هاتە خوارەوە بۆلای تۆ پوچ کردنەوەی هــەموو شـتێکی تێدابوو، دووایی خودا تۆی شارەزایی یاسا و دەستووری خۆی کردی و تۆی کرد بە پێغەمەر بۆ هەموو بوونەوەران.

﴿وَوَجَدَكَ عَائِلاً فَأَغْنَى﴾ وە خودا بە هەژاری تۆی زانیبوو، دووایی خودا تۆی ساماندار کرد بە بازرگانی و سامانی خەدیجەوە و، بەو دەست کەوتەی لـە بیٚباوەڕانەوە بۆت پەیدا ئەبوو.

﴿فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلا تَقْهَرْ وَأَمَّا السَّائِلَ فَلا تَنْهَرْ﴾ دووای ئەوەی خۆت هەتیوی و هــەژاربوویی وا شایستە ستەم لـە دارایی هەتیوان نەکەی و، بە بیٚ نرخ تەماشایان نەکەی و، ئەو کەسەی داوای شتێکی لیٚکردی سەرزەنشتی مەکە و، بە نائومێدی نەڕوا و، بە گوێرەی توانــا دەسـت گــیرۆیی بکە.

﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾ وە تــۆ سوپاســی چاکــەکانی پــەروەدگاری خــۆت بکــە، تـۆی کردووە بە پێغەمەر و ئەو هەمووە چاکەیە پیٚبەخشیوی، باسی بەختیاری و بەهرەمــەندی خـۆت بکە.

# ﴿ سورەتی ئەلئینشیراح ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٨) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ﴿١﴾ وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ ﴿٢﴾ الَّذِي
أَنقَضَ ظَهْرَكَ ﴿٣﴾ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴿٤﴾ فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٥﴾ إِنَّ
مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٦﴾ فَإِذَا فَرَغْتَ فَانصَبْ ﴿٧﴾ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَارْغَب ﴿٨﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان**

لە بارەی ئەم سورەتەوە، تاوس و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، ئەڵێن: ئەم سورەتە و سورەتی ضوحا یەك سورەتن و، بە (بسم الله الرحمن الرحیم) جیا نەکراونەتەوە.

﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ﴾ ئایا ئێمە دڵی تۆمان فراوان و گوشاو نەکرد بۆ تۆ لەو کاتەدا تۆ سەرگەردان بووی و خەفەتت ئەخوارد بە دەست بێباوەڕانی گەلەکەتەوە، نەت ئەزانی چۆن ڕزگاریان بکەی لە دەست بت پەرستی و لاسایی کردنەوەی باوباپیرانیان، هەتا قورئان هاتە خوارەوە بۆ سەر تۆ و، ڕێگەی ڕزگاری ئەوانی بۆ تۆ ڕوون کردەوە، دووایی دڵی تۆ کرایەوە و ئارامی گرت.

﴿وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ الَّذِي أَنقَضَ ظَهْرَكَ﴾ وە ئێمە لامان برد ئەو بارە گرانەی ئەوتۆ پشتی تۆی قورس کردبوو، بەهۆی خەم خواردنتەوە لەسەر ئەو بت پەرستی و گومڕایی تاقمەکەت لەسەری بوون و، دووایی خودا بەهۆی قورئانەوە قورسایی سەرشانی لابردی و فێری چاککردنی ئەوانی کردی.

﴿وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ﴾ وە ئێمە باسی تۆ و ناوی تۆمان بەرزکردەوە، هەر بەو جۆرە قورسایی سەرشانی تۆمان لابرد، ئەبێ چ شتێ بەرزتر و گەورەتربێ لەوەی لە نوێژ داناوی تۆ لەگەڵ ناوی خودادا ئەبرێ و، لە بانگدا شەو و ڕۆژ پێنج جار ناوتان بەیەکەوە ئەبرێ، پەیڕەوی کردنی تۆ پەیرەوی خودایە.

﴿فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْراً إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْراً﴾ دووایی لەگەڵ هەموو ناخۆشی و تەنگانەیەکا خۆشی و ئاسانی هەیە، بە ڕاستی لەگەڵ ناخۆشیدا خۆشی هەیە، دووپات کردنەوەی ئەو

ڕستانە هەر لەبەر بەهێزکردنی ئەو ڕووداوەیە و، جێگیربوونی‌یەتی لە دڵدا، نەمانی گومانە لای زۆربەی ئادەمیزاد، جگە لەو مانایە ئەگەر بکرێ بەڵگەی لەسەرنی‌یە، چاك وایە وازی لێبهێنرێ.

﴿فَإِذَا فَرَغْتَ فَانْصَبْ وَإِلَى رَبِّكَ فَارْغَبْ﴾ دووایی هەرکاتێ تۆ لە ڕاگەیاندنی یاسای خودا بە ئادەمیزاد لێ بویتەوە، دوایی ئەوە تۆ خۆت ماندوو بکە بە پەرستنی خوداوە و کاری پاشەڕۆژە و سوپاسی خودا بکە و، دووایی هانای خۆت هەربۆلای پەروەدگاری خۆت بـە و، بە دڵ ڕوو بۆلای جگەی ئەو مەکە و، داوای یارمەتی لە جگەی خودا مەکە.

# ﴿ سورەتی تیــن ﴾

لـە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٨) ئایەتن.


بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ﴿١﴾ وَطُورِ سِينِينَ ﴿٢﴾ وَهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ٱلۡأَمِينِ ﴿٣﴾
لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ ﴿٤﴾ ثُمَّ رَدَدۡنَٰهُ أَسۡفَلَ سَٰفِلِينَ
﴿٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونٖ ﴿٦﴾
فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعۡدُ بِٱلدِّينِ ﴿٧﴾ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَحۡكَمِ ٱلۡحَٰكِمِينَ ﴿٨﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحیم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان**

﴿وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ﴾ وە من سوێند ئەخۆم بە بەری درەختی هەنجیر، جێگەی خۆیەتی سوێندی پێ بخورێ، چونکە بەری هەنجیر سودی زۆرە: گەدە نەرم ئەکا، خوێن ئەپاڵێوێ، گورچیلە پـاك ئەکاتەوە، بەردی میزڵدان لا ئەبا، کونەکانی سی و جگـەر ئەکاتـەوە، مایەسـیری نایـەڵێ، زۆر نەخۆشی تریش لائەبا و، من سوێند بەبەری درەختی زەیتوون، شایسـتەی ئەوەیـە سـوێندی پـێ بخورێ، چونکە میوەیە و، شەو چێرەیە، ڕونێکی زۆر پاکی هەیە و، زۆر سوودی تریشی هەیە... تین و زەیتوون دوو کێون لـە شامدان کە عیسا لـە شام لـە دایك بووە.

هەندێك لـە زانایان ئەڵێن: تین و زەیتون ناوی دوو کێون. یا ناوی دوو مزگەوتن. یانـێ تـین ناوی ئەو مزگەوتەیەنوح لـەسەر کێوی جـودی درووسـتی کـردووە، زەیتـون نـاوی مزگـەوتی بەیتولموقەدەسە، زۆر بیر و بۆچوونی تر هەیە.

﴿وَطُورِ سِينِينَ وَهَذَا الْبَلَدِ الْأَمِينِ﴾ وە من سوێند ئەخۆم بـە کێـوی تـوری سـینین کـە موسـا گفتوگۆی لـە خزمەت خودا کردووە لـەسەری و، سوێند ئەخۆم بەو شارەی خاوەنی ئاسایشە بۆ دانیشتووان و، موحەممەد لـە ناو ئەودا لـە دایـك بـووە و کـراوە بـە پێغەمـەرو جێگـەی هاتنـە خوارەوەی سروشە.

﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِـي أَحْسَـنِ تَقْوِيـمٍ﴾ سـوێندم بەوانـەی باسـکران، ئێمـە ئادەمیزادمـان درووست کردووە لـە جوانترین باڵا و وێنە و پەیکەردا، خاوەنی ئەقڵە و بیری بەرز و بەسوودە،

هێز و سورشتێکی وامان لە گیانی ئادەمیزاددا داناوە بالاترە لە هەموو گیانداریَ، ئەگـەر خـۆی بیەویَ ئەو سروشتەی خۆی نەگۆڕیَ بۆلای خراپە، خۆ ئەگەر لایدا لە سرووشتی پاکی خۆی و بڕوا لـەگەڵ ئارەزۆی خراپی خۆیا پەستترین و نزمترینی بوونەوەری لیّ دەرئەچیَ و ئەچێتە ڕیـزی پیاوخراپان و جێگەی خواری خوارەوەیدۆزەخـی ئـەدرێتیَ ئەگـەر لایـدا لـەو شـتەی بـۆی و لەسەری درووست کراوە، وەك خودا ئەفەرمویَ:

﴿ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ﴾ لە پاشا ئێمە ئادەمیزادمان گێڕاوەتەوە بۆلای پەسـتترین و نـەوی ترین شێوە و سروشت لـەگیاندارانی تر بیّ نرخ تر ئەبیّ، چونکە ئەوان لـە سروشتی خۆیان لایان نەداوە بە وێنەی ئادەمیزاد. هەرچەندە ئادەمیزاد بۆ پەرەپێدانی ڕەوشتی پەســەند درووسـتکراوە بەلام هەندێکیـیان بیّفەرمانی خودا ئەکەن و سوپاسی چاکەی خودا ناکەن، ئەخرێنە ناو خواری خوارەوەی دۆزەخ.

﴿إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ مەگـەر کەسـانێکی ئـەوتۆ لـە ئادەمیزاد باوەڕیان هێنابـیَ و، کـردەوە چاکـەکانیان کردبـیَ، دووایـی بـۆ ئـەو کەسـانە هەیـە پاداشتێکی وا هەرگیز کۆتایی پیّنایە و کەم نابێتەوە.

﴿فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِالدِّينِ أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ﴾ دوایی چ شتێکە هانی تۆ بدا و پـاڵـت پێوە بنیّ ڕۆژی پاداشت پرسیار بە درۆبخەیتەوە و، بـاوەڕی پـیّ نـەهێنی، دووایـی ئـەو هـەموو بەڵگەیە لەسەر بوونی بە تایبەتی لـەسەر درووسـتکردنی ئـادەمیزاد لـەسـەر جوانـترین دیمـەن و پەیکەر و بالا. ئایا خودا فەرمانڕەواترینی هەموو فەرمان ڕەوا و دادوەریَ نییە، بەڵیَ: هەر وایـە و هەروا ئەبیّ. چونکە ئادەمیزادی درووست کردووە بە جوانترین شێوە و، ئێمە شایەتی ئـەدەین لـەسەر ئەوەی لەهەموو دادوەریَ بە دادترە، ئیتر چۆن ئەبیّ ئادەمیزاد بیّفەرمانی خودا بکا؟

# ﴿ سورەتی ئەلعەلەق ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (١٩) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ اقْرَأْ وَرَبُّكَ
الْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾ كَلَّا إِنَّ
الْإِنسَانَ لَيَطْغَىٰ ﴿٦﴾ أَن رَّآهُ اسْتَغْنَىٰ ﴿٧﴾ إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ الرُّجْعَىٰ ﴿٨﴾ أَرَأَيْتَ
الَّذِي يَنْهَىٰ ﴿٩﴾ عَبْدًا إِذَا صَلَّىٰ ﴿١٠﴾ أَرَأَيْتَ إِن كَانَ عَلَى الْهُدَىٰ ﴿١١﴾ أَوْ أَمَرَ
بِالتَّقْوَىٰ ﴿١٢﴾ أَرَأَيْتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٣﴾ أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ اللَّهَ يَرَىٰ ﴿١٤﴾ كَلَّا لَئِن
لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ﴿١٦﴾ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ
﴿١٧﴾ سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾ كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِب ۩ ﴿١٩﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان**

بێژراوە: یەکەمین سورەت هاتووەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ سورەتی (فاتیحە)یە کەمێ لە زانایان ئەڵێن: یەکەمین جار سورەتی (ئەلمودەسیر) هاتووەتە خوارەوە. زۆرتر لە زانایان فەرموویانە: ئەوەی ڕاستیبێ یەکەمین جار سورەتی (ئەلعەلەق) هاتووەتە خواەوە، ئێمە داوامان لێ‌نەکراوە بگەڕێین بە دوای مێژووی هاتنە خوارەوەی قورئاندا، بەلاّم هەرچۆنێ بێ پێویستە موسڵمانان بڕوایان وابێ هەموو سوورەتەکانی قورئان لە لایەن خودای گەورەوە هاتووەتە خوار.

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەر لە هاتنە خوارەوەی سروش بۆلای، زۆر ئارەزۆی لە چۆڵەوانی بووە، بەو بۆنەیەوە چەند جارێ خواردنی لەگەڵ خۆی ئەبرد و، چەند شەوێ لە ئەشکەوتی (حیرادا) ئەمایەوە بۆ پەرستنی شەوانە و بیرکردنەوە. لە ناوکاودا لەو ئەشکەوتە جبرەئیل هات بۆلای پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، بە پێغەمەری فەرموو: (اقْرَأ) پێغەمەر فەرمووی: من خوێنەوار نیم. پێغەمەر فەرمووی: جبرەئیل باوەشی پێداکردم و گوشیمی بە خۆیەوە، بە جۆرێ ئازارم پێ گەیشت،

دووایی بەرەڵای کردم، سێ جار ئەو کارەی لەگەڵ کردم. لە پاشانا جبرەئیل فەرمووی (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ) هەتا گەیشتە (مَا لَمْ يَعْلَمْ)، دووایی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ گەڕایەوە بۆلای خەدیجەی ژنی، فەرمووی: دام پۆشە، ئەویش دایپۆشی هەتا ترسەکەی نەما، دووایی فەرمووی: ئەی خەدیجە: من ڕووداوێکی ترسناکم تووش بووە، بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە و فەرمووی: من لە خۆم ئەترسم، خەدیجە ووتی: تۆ مەترسە موژدە بە خۆت بدە، بە خودا سوێند ئەخۆم، خودا ئازاری تۆ نادا، تۆ کەسێکی خزم دۆست و، دەست گیرۆکەری هەژارانی، دواجار پێغەمەری برد بۆلای (وەرەقە) ئامۆزای خەدیجە کە باوەڕی بە عیسا هێنابوو، نووسراوی بە زمانی عیبری ئەنووسی، چەند جار ئینجیلی نووسیبووەوە، پیاوێکی پیری تەمەن زۆربوو، خەدیجە ووتی: ئامۆزا، گوێ لە برزای خۆت بگرە، وەرەقە بە پێغەمەری ووت، برازای خۆم چ شتێکت دیوە، پێغەمەر بەسەر هاتی خۆی لە ئەشکەوتی حیرادا بۆ گێڕایەوە، وەرەقە ووتی: ئەوەی هاتووە بۆلای تۆ نامووسی گەورەیە کە هاتووە بۆلای موسا، بەشم لە بەشتا بێ، خۆزگایە من زیندوو ئەبووم، کاتێ خزمەکانت تۆیان لە مەککە دەرئەکرد، پێغەمەر فەرمووی: ئایا من لە مەککە دەرئەکەن؟ وەرەقە ووتی: بەڵێ، هەر پیاوێ بەو شتەوە هاتبێ دوژمنایەتی زۆری کراوە، ئەگەر من زیندوو بووم یارمەتیت ئەدەم.

دووای ئەو جارە سروش نەهات بۆ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ماوەیە، پێغەمەر خەفەتی ئەخوارد، زۆر جاران لە خەفەتا ئەیەویست خۆی فڕەبدایەتە خوارەوە لەسەر کێوان، دووایی زۆر جار جبرەئیل خۆی پیشان ئەدایەوە، ئەیووت: تۆ پێغەمەری خودای، لەو کاتانەدا خۆشی ڕووی تێ ئەکرد.

بێگومان سروش هاتووەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمەر، لە تەمەنی چل ساڵیدا، بەر لەوەی بکرێ بە پێغەمەر باوەڕی بە خودایەکی تەنها هەبووە و، هاوبەشی بۆ خودا دانەناوە و، بڕوای زۆر توند بووە و، سەرچاوەی ئەو باوەڕەیشی لە دوو شتەوە بۆی پەیدابووە، یەکەمیان لە ئەقڵی تەواوی خۆیەوە بووە. دووهەمیان بۆ پێغەمەر شتێکی گرنگ نەبووە، ئەو پێغەمەر کە گەورەی هەردوو جیهانە، بەهۆی ئەقڵی تەواوی خۆیەوە ڕانومایی وەربگرێ بۆلای بڕوا بە خودایەکی تاك و تەنها، لە زۆر کاتا هەندێ لە پیاوان بەر لە هاتنی ئایینی ئیسلام، بەهۆی ئەقڵی خۆیانەوە باوەڕیان هەبووە بە خودایەکی تەنها، وێنەی وەرەقەی کوڕی نەوفەل، زەیدی کوڕی عەمر، عوسمانی کوڕی ئەلحوبەی ریس، جگەی ئەوانیش.

ئەو بڕوایەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لە ئیبراهیمی باپیری‌یەوە بۆی مابووەوە، هەرکەسێ ژیان و مێژووی ژیانی پێغەمەر موتاڵا بکا ئەزانێ بڕوای بە خودای تەنها هەبووە، هەرگیز سوژدەی بۆ بت نەبردوە، نە بە منالی و نە بە گەورەیی. بۆ نموونە ئەگێڕنەوە: بەر لە تەمەنی پیاوەتی، پیاوێ بە پێغەمەری ووت: ئەی جوان، لەبەر ڕاستی لات و عوزا ، فلان هەواڵم بدەرێ، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: پرسیارم لێ مەکە بەهۆی لات و عوزاوە، من لە هەموو شتێکی ئەو بتانە توڕە و بێزارم.

دوای ئەوەی خـودای مـەزن بـەهۆی جبرەئیلـەوە فـەرمووی: تـۆ بخوێنـە، پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: من خوێنەوار نیم، سێ جار ئەو گفتوگۆیەی‌بۆ دووپـات کرایـەوە، دواجـار پێغەمـەر فەرمووی، چ شتێ بخوێنم، جبرەئیل بەوی ووت:

﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ تۆ بەهۆی نـاوی پـیرۆزی پـەروەدگاری ئـەوتۆی خـۆت کـە هەموو بوونەوەرانی درووست کردووە، ئەو سروشەی لە لایەن ئێمەوە بۆت دێ بیخوێنە، بێتـە بەری تۆ و لە بیرت ناچێتەوە بە ڕەوانی ئەتوانی بیخوێنیتەوە بەسەر ئادەمیزاددا، ئەو خودایە ئەم بوونەوەرانەی درووست کردووە ئەتوانێ تۆ بکا بە خوێنەوار. لەبەر ئەوەی ئادەمیزاد لە هەموو بوونەوەرانی تر بە نرخ تر و بەڕێزترە لای خودا، بە تایبەتی باسی ئەکا و ئەفەرموێ:

﴿خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ﴾ پەروەدگاری تۆ ئادەمیزادی درووست کردووە لە خوێن پارەیەکی ڕەق، ئەوەی شایانی باسبێ، ووشەی ﴿اقْرَأْ﴾ کە یەکـەمین ووشـەیە، ئـەو سرووشـەی هـاتووە بۆلای پێغەمەر یەکەمین جار بەوە دەستی پێ کراوە: تۆ بخوێنە، کەواتە ئەوەمان فێرئەکات، کـە پێغەمەر نێردراوە بۆلای ئادەمیزاد، لە ناو گەلێکا نەزانین و بت پەرستی و دوور لـە شارسـتانی زاڵ بوون بەسەریانا، فەرمان ئەدا بە ووشەی (اقْرَأْ) بـە هـەموو ئـادەمیزاد بخوێنـن و زانسـت و زانیاری فێربن و، ئەوەیشمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە، کە ئایینی ئیسلام لە یەکەم جاری هاتنیا داوای قـەلاچۆکردنی نەخوێنـەواریمان لێ ئـەکا و، داوای بڵاوبوونـەوەی خوێنـدن و زانیاری‌مـان لێ ئەکات. نەك جارێ بەڵکو دووجار فەرمانمان پێ ئەدا و خوێندنـی پێویسـت کـردووە، وەك بـۆ جاری دووەم ئەفەرموێ:

﴿اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ﴾ تۆ بخوێنە و، پـەروەدگاری بـەڕێزی تـۆ لـە هـەموو بەڕێزان بەڕێزترە، وێنەی نی‌یە، کەسێکی ئەوتۆیە ئادەمیزادی فێری نووسین و زانسـت کـردووە بەهۆی خامە و پێنووسێکی بێ گیانەوە، یانێ کە خودا بتوانێ بە هۆی پێنووسەوە ئـادەمیزاد فـێر نووسین بکا، ئەتوانێ تۆ فێری خوێندنی سروش بکا. خودای گەورە ئادەمیزادی لە خوێنێکی بـێ نرخەوە بەرزکردوەتەوە،بۆلای نوسین بە خامە، سودی خامە نایەنە ژمارە: ئەوەتا کاتانی پێشـوو ئەبەستی بە کاتەکانی دوواییەوە، هەموو لایەکی جیهانی بەستۆتەوە بەیەکەوە، بە تایبەتی دوایـی چاپ و کۆمپیوتەر کە زانست و نوسینی کردووە بەبەشی هـەموو ئـادەمیزاد، بگـرە ئەوانـەیش کوێرن فێری خوێندن ئەبن بەهۆی پیتی دەرکـەوتوی تایبـەتی بۆیـان، هەرچـەندە زمـان ئـەوەی لەدڵدابێ ڕونی ئەکاتەوە، بەڵام ئەگەر خامە نـەبێ بـا ئـەیباو نامێنێ. دووایـی بـۆ پتـەوکردنی فەرمودەی پێشەوە، بۆ ئەوەی هیچ شتێ لە دڵی پێغەمەردا نەمێنێ، خودا ئەفەرموێ:

﴿ عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴾ خودا ئادەمیزادی فێری شتێ کـردووە لەوبـەر نـەیزانیوە، لـە تاریکی نەزانین و، نەخوێنەواریەوە بۆلای ڕوناکی زانیاری و خوێندن، بەمەرجێ تەمـەڵ نـەبێ و

ئەقلّی خۆی بخاتە کارەوە. ئەوەی شایانی باسبێ پێغەمەر نەخوێندەواربووە، نەیزانیوە بە پێنوس بنوسێ، کەواتە سروشە و لەلایەن خوداوە بۆی هاتووە.

﴿ كَلَّا إِنَّ الْإِنْسَانَ لَيَطْغَى أَنْ رَآهُ اسْتَغْنَى إِنَّ إِلَى رَبِّكَ الرُّجْعَى ﴾ ڕاست و بێگومانە: بەڕاستی هەندێ لە ئادەمزاد لە سنور دەرئەچێ و لە خودا یاخی ئەبێ، لەبەرئەوەی سامان و دارایی و پلەو پایەی بەخۆیەوە بینی و، یادی خودا ناکاتەوەو، لە بیری خۆی ئەباتەوە کە پارچە خوێنێکی بێزلێکراوە بوەو، هەژارو بێ سامانبوە، ئەوەتە بە هۆی زانست و داراییەوە، چەکی کاول کەر دروست ئەکاو، خۆیانی پێ لەناو ئەبەن و بیر لە ڕابوردوی خۆیان ناکەنەوە، بە ڕاستی هەر بۆلای ئێمەی پەروەردگاری تۆیە گەڕانەوەی هەموو ئادەمیزاد. کەواتە زانیاری و دارایی و پلەو پایەی جیهان فریوی تۆ نەدا هێزی خودا بە تواناترە لە چەکی کیمیاوی و بۆمی تازە دروست کراوی ئەوان.

﴿ أَرَأَيْتَ الَّذِي يَنْهَى عَبْداً إِذَا صَلَّى ﴾ ئایا تۆ کەسێکی ئەوتۆت نەدیوەو بەوت نەزانیوە ڕێگە لە بەندەی من ئەگرێ کاتێ بیەوێ نوێژ بکا. ئەو ئایەتە لەوەوە هاتۆتە خوار، ئەبو جەهل ووتی: ئەگەر موحەمەدم بینی نوێژ بکا پێم ئەخەمە سەری ملیو، هاتو پێغەمەر نوێژی ئەکردو گەڕایەوە بە دوایی خۆیا، پێیان ووت: بۆ گەڕایتەوە، ووتی چالێکی پڕ لە ئاگرم بینی لە نێوان من و ئەودا.

﴿ أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ عَلَى الْهُدَى أَوْ أَمَرَ بِالتَّقْوَى ﴾ زۆرترینی زانایان مانای ئەم ئایەتەیان بەم جۆرا نەکردوە: ئایا تۆ ئەزانی ئەگەر کەسێ لەسەر ڕێگەی ڕاست و ڕانومای بێ، یا فەرمان بدا بە لە خودا ترسان، ئایا نەیزانیوە بە ڕاستی خودا ئەو کەسە ئەبینێ و، ئەزانێ بە نیازی دڵی، بە چاکی پاداشتی ئەداتەوە.

﴿ أَرَأَيْتَ إِنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّى أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللَّهَ يَرَى ﴾ ئایا تۆ زانیوتە ئەگەر کەسێ ڕاستی بە درۆ بخاتەوە، پشت بکاتە ڕاستی ئایا ئەو کەسە نەیزانیوە خودا بە کرداری ئەو ئەزانێ و، تۆڵەی لێ ئەکاتەوە.

خاوەنی تەفسیری کەشاف بەم جۆرە مانای کردوە: تۆ هواڵ بدە بە من ئایا ئەو کەسەی ڕێگە لە نوێژکردن ئەگرێ ئایا لەسەر ڕێگەیەکی چاکە ڕێگە لە پەرستنی خودا ئەگرێ، یان فەرمان ئەدا بە لە خودا ترسان بە بیروباوەڕی خۆی، یا ڕاستی بە درۆ ئەخاتەوەو پشت ئەکاتە ئایینی ڕاست بەو جۆرەی ئێمەی باوەڕدار ئەیلێین. ئایا ئەو کەسە نەیزانیوە بەوەی کە خودا ئاگادارە لەسەر ڕانومایی ئەو لەسەر گومڕایی ئەو، پاداشتی ئەداتەوە بە گوێرەی نیازو کردەوەی خۆی، بۆ زیاتر ئاشنا بوون لەسەر مانای ئەو ئایەتانە، تەماشای تەفسیری (غرائب القران ورغائب الفرقان) بکەن.

﴿ كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعاً بِالنَّاصِيَةِ نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ﴾ بە ڕاستی ئەو بێ باوەڕە یاخیە؛ واز لە گومڕایی خۆیی بهێنێ، ئەگەر وازی لێ نەهێنێ بە سەختی بەموی پێشانی سەری ڕای ئەکێشین بۆناو ئاگری دۆزەخ. پێشانی کەسێکی درۆزنی بە هەڵەداچوویی تاوانبار.

﴿ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ ﴾ دووایی با ئەو درۆزنە تاوانبارە داوا لە دانیشتوانی جێگەی دانیشتوی خۆی بکا کە یاریدەی بدەن ڕزگاری بکەن لەو سزایەی، ئێمە بانگی فریشتەکانی بەهێزی کار بەدەستانی دۆزەخ ئەکەین پاڵی پێوە بنێن بۆلای ئاگری دۆزەخ.

﴿ كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ ﴾ تۆ نەکەی گوێ بگری لەو کەسە تاوانبارەو، واز لە نوێژکردن بهێنی، تۆ سوژدە ببە بۆ خودای تاك و تەنها و لە جگەی خودا مەترسەو، تۆ خۆت نزیك بکەرەوە لە خوا بە هۆی کردنی کاری چاکەوە.

بۆ زانین: سوژدە بردن، ئەکرێن بە چەند بەشێکەوە: سوژدەی ناو نوێژە فەرزەکان، سوژدەی سەهو، سوژدەی خوێندنی هەندێ لە ئایەتەکانی قورئان، سوژدەی سوپاس کردن بۆ خودا لە کاتی هاتنی چاکەیەکی خودا، یا لە کاتی لابردنی ڕووداوێکی ناخۆش، ئەو سوژدانە هەموویان سونەتن جگە لە سوژدەی ناو نوێژە فەرزەکان.

**کۆتایی هات بە یاریدەی خودای مەزن ٩ / ١٠ / ٢٠٠٠ زاینی**

**١٢/ مانگی ڕەجەب ( ١٤٢١ ) کۆچی**

# ﴿ سوەرتی ئەلقەدر ﴾

لەمەکە هاتوەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٥) ئایەتن

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ ﴿١﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ ﴿٢﴾
لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ ﴿٣﴾ تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ
فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴿٤﴾ سَلَٰمٌ هِىَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ ﴿٥﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ﴾ بەراستی ئێمە قوئانمان ناردوەتە خوارەوە، لەناو شەوێکی بەرێزدا، بۆیە بەرێزە، چونکە قورئانی تێدا هاتوەتە خوارەوە، قورئان بەیەك جار نەهاتۆتە خوارەوە، بەڵکو بە بەش بەش هاتوەتە خوارەوە، بەرێزە ئەو شەوە، پەرستن لە شەوەدا بەرانبەر بە پاداشتی هەزار مانگە.

بۆزانین: زانایان بیریان جیاوازە لە دیاری کردنی شەوی (لیلة القدر)، هەندێکیان ئەڵێن: هەر لە کاتی سەردەمی پێغەمەردا بووە، دوواتر نەماوە، زۆربەی زۆری زانایان ئەو بیرو بۆچوونە بە ڕاست نازانن و ئەڵێن: ئەو شەوە بەردەوامە هەتا کۆتایی پێ هاتنی جیهان، لە دیاریکردنی کاتەکەیدا بیرو بۆچونیان جیاوازە: هەندێکیان ئەڵێن: کاتەکەی ئەگوێزرێتەوە ساڵ بە ساڵ، هەرجارێ لە کاتێکی ساڵێکا ئەبێ، هەندێ لایان وایە لە سەرەتای ساڵەوە، هەتا کۆتایی ساڵ لە شەوێکدا پەیدا ئەبێ، هەندێ تریان ئەڵێن: لە سەرەتای مانگی ڕەمەزان هەتا کۆتایی ئەو مانگە پەیدا ئەبێ. زۆربەی زانایان ئەڵێن: لە (١٠) ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزاندایە، بە زۆری لەشەوە تاکەکاندا، بەزۆرتر لە شەوی (٢٧)ی مانگی ڕەمەزاندا پەیدا ئەبێ. زۆر جێگەی شایانە (أبن العربی المعافری الأندلوسی المالکی) لە نامەی خۆیا (أحکام القرآن) ئەڵێ: لە (٢٧)ی مانگی ڕەمەزاندا ئەبێ، چونکە زانایان پیتەکانی ئەو سورەتەیان ژماردووە، کاتێ گەیشتنە ووشەی (هی) بو بە (٢٧) پیت، بۆیە بڕیاریاندا ئەو شەوە (لیلة القدر)ە. بۆ ئەم مەبەستە تەماشای مانای تحفه المحتاج بکە لاپەڕەی (٤٦٢). شافیعی ڕەزای خودای لێبێ، ئەفەرموێ: ئەو

گفتوگۆیە لە کەسێکەوە دەرئەچێ تامی فیقهی نەچەشتبێ، ئەیش فەرمویێ فەتوای حەنەفی لاوازە لەو بارەیەوە لە بارەی فەتوای دەرکی و بیانی.

﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ﴾ وە چ شتێکی سەرسوڕێنەرە بە تۆی ڕابگەیەنێ لەیلەتو لقەدر چ شتێکە، پاداشتی پەرستنی خودا لەو شەوەدا، بەرانبەرە بە پاداشتی پەرستەن لە هەزار مانگدا. ئەو شەوی لەیلەتولقەدرە چاکترە لە هەزار مانگ.

ئەو فەرمودەی خودایە لەوەوە هاتوە یارانی پێغەمەر ووتیان: تەمەنی گەلانی پێشوو درێژبووە، پەرستنی زۆریان کردوە، پاداشتیان لە ئێمە زۆزەترەو، ئێمە تەمەنمان کورتە.

﴿تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ مِنْ كُلِّ أَمْرٍ﴾ فریشتەکان و جبرەئیل لەو شەوەدا لە ئاسمانەوە دێنە خوار بەهۆی دەستوری خوداوە، لەبەر گەیاندنی یاساو فەرمانی خودا بە ئادەمیزاد.

﴿سَلَامٌ هِيَ حَتَّى مَطْلَعِ الْفَجْرِ﴾ شەوی لەیلەتولقەدر شەوی ئاشتی و خۆشی و چاکەی خودایە، خراپەی تێدا نیەو، ئاشتی و چاکەی بەردەوامە هەتا کاتی بەیانی، دەرگای خۆشی کراوەیەو بۆ موسڵمانان.

# ﴿ سورەتی ئەلبەینە ﴾

زۆربەی هەرە زۆری زانایان ئەڵێن: لە مەدینە هاتوەتە خوارەوە. هەندێکیان ئەڵێن: لەمەکە هاتوەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٨) ئایەتن

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ
حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ الْبَيِّنَةُ ﴿١﴾ رَسُولٌ مِّنَ اللَّهِ يَتْلُو صُحُفًا مُّطَهَّرَةً ﴿٢﴾
فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ ﴿٣﴾ وَمَا تَفَرَّقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ إِلَّا مِن
بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَةُ ﴿٤﴾ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ
لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَٰلِكَ دِينُ
الْقَيِّمَةِ ﴿٥﴾ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ
فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أُولَٰئِكَ هُمْ شَرُّ الْبَرِيَّةِ ﴿٦﴾ إِنَّ
الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُولَٰئِكَ هُمْ خَيْرُ الْبَرِيَّةِ ﴿٧﴾
جَزَاؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ
فِيهَا أَبَدًا رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ رَبَّهُ ﴿٨﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

بەر لەوەی پێغەمبەر بکرێ بە پێغەمبەر خاوەن نامەکانی گاورو جوەکان لە نامەکانی خۆیانا خوێندبویانەوە، لەمەودوا خودا پێغەمبەرێ ڕەوانە ئەکا ڕێگەی ڕاست شارەزای ئادەمیزاد ئەکا، هەروەها بت پەرستان بیستبویان پێغەمبەرێکی بەو جۆرەئەنێررێ، هەردولایان پێك هاتبون لەسەر ڕەوانە کردنی ئەو پێغەمبەرە بەڵێن پێ دراوە، زۆرجاران لەناوخۆیانا ئەبوو بە ئاژاوەیان، هەریەکە لە خاوەن نامەکان و بت پەرستان خۆیانیان بە ڕاست ئەزانی و، ئەوانی تریان بە ناڕاست ئەزانی، لە پاشانا پێك هاتن فەرماندانی نێوانیان دووا بخەن هەتا کاتی هاتنی ئەو

پێغەمەرە، هەرکاتێ پەیدابوو باوەڕی پێ ئەهێنن و فەرمانبەرداری ئەبن. کەچی کاتێ پێغەمەر نێررا، لە بەڵێنی خۆیان پەشیمان بوونەوەو، جیاوازی کەوتە نێوانیان زۆربەیان لەسەر بێ باوەڕی خۆیان و بت پەرستی مانەوە، بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو باسانە، خودا ئەفەرموێ.

﴿لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ مُنْفَكِّينَ حَتَّى تَأْتِيَهُمُ الْبَيِّنَةُ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنابوو بە موحەممەد لە خاوەن نامەکانی گاورو جوەکان و، بت پەرستان جیا نەبوونەوە لەبێ باوەڕی و بت پەرستی خۆیان و، وازیان لە بیروباوەڕی خۆیان ناهێنن هەتا کاتی دێت بۆلایان بەڵگەی ڕون و ئاشکراو، ئەو پێغەمەرەی بڕوایان وابوو دێت و چاك و خراپ جوێ ئەکاتەوە، دوایی ئەو پێغەمەرە ڕەوانە کرا، هەندێکیان موسڵمان بوون و، هەندێ تریان لەسەر بێ باوەڕی مانەوە.

ئەبێ بزانرێ بێ باوەڕان دوو ڕەگەز بوون: خاوەن نامەکان هۆی بێ باوەڕیان ئەو شتە بوو، لە ئاینی خۆیانا پەیدایان کرد. جوەکان ئەیان ووت: عوزەیر کوڕی خودایە، گاورەکان ئەیان ووت: عیسا کوڕی خودایە و سێهەمی خودایە، بت پەرستان سەرەو لای هیچ نامەیە نەبوو، خودای مەزن لەو ئایەتەی پێشوودا باسی فەرموون.

﴿رَسُولٌ مِنَ اللَّهِ يَتْلُو صُحُفاً مُطَهَّرَةً فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ﴾ ئەو بەڵگە ڕون و ئاشکرایە بریتیە لە پێغەمەرێ ڕەوانە ئەکرێ لەلایەن خوداوە کە موحەممەدە، نەخوێنێتەوە بەسەریانا چەند پەڕەیەکی پاك و دور لە گۆڕان و دەستکاری، لەناو ئەو پەڕانەدا هەیە نامەیەکە قورئانە، زۆر بە نرخ و ڕاستە، ئەو شتەی خودا ڕەوانەی کردووە لەنامە پێشوەکانی ئیبراهیم و، تەوراتی موساو ئینجیلی عیساو زەبوری داودو، هەموو ئەو شتەی نێرراوە بۆ پێغەمەرەکانی تر، ئەو قورئانە زۆریان ڕون ئەکاتەوە بۆیان.

﴿وَمَا تَفَرَّقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ إِلَّا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَةُ﴾ وە ئەو خاوەن نامانەی ئەوتۆ نامەیان پێ بەخشرابوو پارچە پارچە نەبوون، هەریەکەیان بە بیرو باوەڕێکی جیاواز مەگەر لە دوای هاتنی بەڵگەی ڕوون و بۆلایان لەلایەن پێغەمەرەکانی خۆیانەوە، ئەوەبوو جوەکان دوای موساو گاورەکان دوای عیسا چەندین تاقمی جیاوازیان لێ پەیدابوو، هەروەها درێژەیان بەبێ باوەڕی و گومڕایی خۆیاندا، هەر بەو جۆرە دووایی هاتنی پێغەمەر درێژەیان دا بە بێباوەڕی و باوەڕیان بە پێغەمەر نەهێنا لەبەر ئەوەیش نەبوو، بێ ئاگا بن لە ئایینی خۆیان، بەڵام لەبەر سودی خۆیان بوو لە جیهاندا.

﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ﴾ وە گاورو جوەکان لە تەورات و ئینجیلدا هیچ فەرمانێکیان پێ نەدرابوو، جگە لەوەی ئەوان خودا بپەرستن، بە نیازی پاکەو دور لە هاوبەشدانان ئایین هەر بۆخودابێ، باوەڕداربن بە هەموو پێغەمەرەکان، لادەن لە هەموو ئاینی پڕو پوچ.

﴿وَيُقِيمُوا الصَّلاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ﴾ وە نوێژوکانیان بەرپاکەن بە گوێرەی یاساو، زەکاتەکانیان ببەخشن بە هەژاران و، ئەو شتانەی فەرمانیان پێ درا لە پەرستنی خوداو نوێژکردن و زەکات دانە، ئەوە ئایینی ڕاستی نامە ئاسمانەیەکانە، دوایی لە چ لایەکەوە ئەو هەمووە ئایین و بیروباوەڕە پەیدابون، ئەو کارەپیشەی خاوەن نامەکانبێ، هاوار بۆ ئێمەی موسڵمان پارچە پارچە بووین لە ئاینی خۆمان و، ئەو هەمووە پارت و تاقمانەمان لێی بووەوە، دووای پێغەمەر شتی تازەی نارەوامان پەیداکردوە.

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أُولَئِكَ هُمْ شَرُّ الْبَرِيَّةِ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەتوتۆ باوەڕیان نەهێنابوو لە خاوەن نامەکان و، بت پەرستان لەناو ئاگری دۆزەخدان لە پاشە ڕۆژدا بەردەوامن لەناویدا، بەڕاستی ئەو کەسانە خرابترینی بونەوەرانن.

﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُولَئِكَ هُمْ خَيْرُ الْبَرِيَّةِ﴾ پاداشتی ئەو کەسانە باوەڕیان هێناوەو، کردەوە چاکەکانیان کردووە، چاکترینی بوونەوەرانن.

﴿جَزَاؤُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ذَلِكَ لِمَنْ خَشِيَ رَبَّهُ﴾ پاداشتی ئەو باوەڕدارانە لە خزمەت پەروەدگار چەندین بەهەشت و باخ و چیمەنی بەرین و بەرزە ئەڕوا بە ژێر درەخت و ئەو لاو لای کۆشکەکانیان چەندین ڕووباری ئاوی شیرین و بەتام بەردەوامن لە ناو ئەو بەهەشتانەدا هەتا هەتایە. خودا لەو کەسانە خۆشنودبوون ڕازی بووە، چونکە لە سنوری خوادا لایان نەداوەو، ئەوانیش لە جیهاندا ڕازی و خۆشنوبوون و، ملکەچی فەرمانەکانی ئەوبوون و، فەرمودەکانی خودایان لا گران نەبووە، ئەو ڕەزامەندی و خۆشنودیە بۆ کەسێکە لە پەروەردگاری خۆی ترساوەو، بێ فەرمانی خودایان نەکردووە لە جیهاندا. بەڵام ئەو کەسانەی بەناو موسڵمانن و بێ فەرمانی خودا ئەکەن بێ بەشن لەو پاداشتە.

# ﴿ سوەرتی زەلزەلە ﴾

لە مەکە هاتوەتە خوارەوە، هەندێ لە زانیان ئەڵێن: لە مەدینە هاتۆتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٨) ئایەتن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا
﴿٢﴾ وَقَالَ ٱلْإِنسَٰنُ مَا لَهَا ﴿٣﴾ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾
بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا
لِّيُرَوْا۟ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٦﴾ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا
يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا﴾ هەر کاتێ زەوی لە بەر نەمانی هێزی کێشەکەی، یا لەبەر شتێ تر جولێنرا، بە جۆرە جولانی شایانی گەورەیی و قورسی زەویێ و زۆر سەختبێ.

﴿وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾ وەکاتێ زەوی هەموو ئەو شتە قورس و بارەگرانەی لەناویایەتی لە مردوەکان و گەنج و شارو نەوتو ئاوو شتی فرەی دایە سەرەوە، بێگومان کاتێ زەوی لە شوێنی خۆی ترازا پارچە پارچە ئەبێ و، هەر شتێ لەناویابێ دەرئەکەوێ. ئەو کاتە ئادەمیزاد سەرسام ئەبن.

﴿وَقَالَ الْإِنْسَانُ مَا لَهَا﴾ وە ومەردمان ئەڵێن: ئەو زەویە چ شتێ وای لێ کردوە ئەجولێ بە جۆرێکی نائاسایی و، چ شتێکی بەسەرداهاتوە، بەو جۆرە سەختیە ئەلەرزێ؟.

زۆرجارانیش لەم جیهانەدا ئەبینین و بیستومانە لەکاتی بومەلەرزەدا، لە زۆر جێگە زەوی شەق ئەباو ئاگرو بەرد فڕە ئەداو، زۆر گوندو شار قوت ئەداو لەناویان ئەبا.

﴿يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا﴾ لەو ڕۆژەدا کە ئەو شتانە ڕوی دا، زەوی بە زمانی تایبەتی خۆی، هەواڵی جولانی خۆی بۆ ئادەمیزاد ئەگێڕێتەوە کە ئەو جولانە سەرەتای نەمانی جیهان و هاتنی ڕۆژی دووایە. گفتوگۆی ئادەمیزاد ئاشکراکردنی ئەو شتانەیە قوتی داوە، ساڵەهای ساڵ. هەموو ئەو شتانەی بۆ زەوی پەیدا ئەبن لە ڕۆژی دووایدا لە خۆیەوە پەیدا نابن.

﴿بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَى لَهَا﴾ بەڵکو بە هۆی ئەوەوەیە، پەروەردگاری تۆ فەرمان ئەدا بـە زەوی و، دەستوری پێ ئەدا گفتوگۆ بکا و هەواڵ بدا بەو شتانەی لــە نـاویدا بـووە، ئـەو کاتـەی ڕۆژی دوایی خودا ئەقڵ و گفتوگۆ ئەبەخشێ بە زەوی، زەویش وەك بونەوەرانی تر تەمەنی بـۆ دیـاری نەکراوە، بۆیە موحەمەد عەبدە ئەفەرموێ کاولبونی زەوی بەهۆی شـتێکەوە بـێ بیکـا بـە تـۆز زەوی بە ڕۆیشتنی کانەکان تەمەنی (ئەگونجێ کۆتایی پێ نایە) ئەوەیش لەوانەیە ئاماژە بکا بۆلای تەقینەوەی بونبای نەوەوی لەسەر ڕوی زەوی.

زۆرکەس لـەسەرەتای ئیسلامەوە، وایان ئەزانی خودا تەماشای کـردەوەی چاکـەو خراپەکـە ناکاو، پاداشت و تۆڵە لـەسەریان ناداتەوە، خودا ئەفەرموێ.

﴿يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتاً لِيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ﴾ ئەو ڕۆژەی بونەوەران ئەبن بـە بونـەوەرێ تـری جگەی ئەمڕۆ ئادەمیزاد بە پەشێوی بە گەورەو بچوکیانەوە ئەڕۆن بۆلای پاداشتی کردەوەکـانی خۆیان ببینن.

﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَـرَهُ﴾ دووایـی هـەر کەسـێ بـە ئەندازەی کێشانەی بچوکترین مێرووڵەیا کەمتر لـەوەیش چاکە بکـا، لــەو ڕۆژەدا پاداشـتەکەی ئەبینێ و، هەرکەسێ بە ئەندازەی کێشانی بچوکترین مێرولـەیا کەمتر خراپە بکا سزاکەی ئەبینێ.

زانایانی تازەی ئەم سەردەمە ئەڵێن: زەڕە بچوکترە لـە بەشێکی (١٠) بلوێن ملی مەترو، بــە گەورەترین ئامێری بچوك کردنەوە نەبێ نابینرێ، زانایانی کۆن ووتویانە: زەڕە شایانی بەشکردن نیە.

پرسیار: ئایا باوەڕدارو بێ باوەڕ لـە پاداشت و تۆڵــەدا یەکسـانن، یـا بـێ بـاوەڕان پاداشـتی چاکەیان نادرێتەوە؟.

وەڵام: بێ باوەڕان سزایان ئەدرێ لـەسەر بێ باوەڕیەکەیان پاداشتی چاکەیان ئەدرێتــەوە، بـە جۆرێ خودا ئەیزانێ لـە جیهاندا، یا بە سوکبونی سزایان لـە پاشە ڕۆژدا.

# ﴿ سورەتی ئەلعادیات ﴾

لە مەکە هاتۆتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: لە مەدینــە هاتۆتـە خـوارەوە. ژمـارەی ئایەتەکانی (١١) ئایەتن.


بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
وَالْعَادِيَاتِ ضَبْحًا (١) فَالْمُورِيَاتِ قَدْحًا (٢) فَالْمُغِيرَاتِ صُبْحًا
(٣) فَأَثَرْنَ بِهِ نَقْعًا (٤) فَوَسَطْنَ بِهِ جَمْعًا (٥) إِنَّ الْإِنسَانَ
لِرَبِّهِ لَكَنُودٌ (٦) وَإِنَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ (٧) وَإِنَّهُ لِحُبِّ
الْخَيْرِ لَشَدِيدٌ (٨) ۞ أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِي الْقُبُورِ (٩)
وَحُصِّلَ مَا فِي الصُّدُورِ (١٠) إِنَّ رَبَّهُم بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّخَبِيرٌ (١١)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

گێڕدراوەتەوە لە هەندێ زانایانەوە: پێغەمەری خودا (د.خ) کۆمەڵێ لــە هاورێکـانی خـۆی نارد بۆلای هۆزی بەنی کەنانە، درەنگ هاتنەوە، دوو ڕوەکان ووتیان کـوژراون، ئـەو سـورەتە هاتوەتە خوارەوەهەواڵی بێ وەی ئەوان و درۆکردنی دوو ڕوەکانی ڕاگەیاند بە پێغەمــەر (د.خ) فەرموی.

﴿وَالْعَادِيَاتِ ضَبْحاً﴾ وە من سوێند ئەخۆم بەو چـارەو یانـە بـە خـێرایی ڕائەکـەن و دێـن و ئەڕۆن و پرمەی لوتیان دێ لە کاتی پەلاماردانیان بۆ دوژمن.

﴿فَالْمُورِيَاتِ قَدْحاً فَالْمُغِيرَاتِ صُبْحاً فَأَثَرْنَ بِهِ نَقْعاً فَوَسَطْنَ بِـهِ جَمْعـاً﴾ دووایـی مـن سـوێند ئەخۆم بەو چارەویانە لە کاتی پەلاماردانیان بۆ دوژمن و، بە خێرایی ئـەڕۆن و، ناڵـێ دەسـت و قاچیان ئەدا لە بەردو ئاگر ئەکەنەوە، بریسکەی ئاگر بەرز ئەبێتەوە، دووایی من سـوێند ئـەخۆم بەو چارەویانە بە خێرایی پلاماری دوژمن ئەدەن لە بەیانیدا لەناکاودا بەبێ ئاگاداری دژومـن و، دووایی لە باینیدا تۆز پەیدا ئەکەن و، دوایی لەناو ئەو تەپو تۆزەدا، خۆیان ئەخەنە ناوەڕاست و ناوجەرگەی دوژمانانی موسڵمانان‌دا بە کۆمەڵ.

﴿إِنَّ الْإِنْسَانَ لِرَبِّهِ لَكَنُودٌ وَإِنَّهُ عَلَــى ذَلِـكَ لَشَـهِيدٌ﴾ سـوێندم بەوانـەی باسـکران: بەڕاسـتی ئادەمیزاد سوپاسی پەروەردگاری خۆی ناکا، بە بەخشینی دارایی خۆی لە ڕێگەی ئایینی خوداو.

بەڕاستی ئەو ئادەمیزادە ئاگاداری ناسوپاسی و چروکی خۆیەتی و، کردەوەی خۆی شایەتی ئەدا سوپاسی چاکەکانی خودای خۆی ناکا.

﴿وَإِنَّهُ لِحُبِّ الْخَيْرِ لَشَدِيدٌ﴾ وە بە ڕاستی ئادەمیزاد بۆ خۆشەویستی دارایی و سامانی جیهان زۆر بە سەختی هەوڵ ئەدا بۆ پەیداکردنی و خۆشەویستە لای، کەچی بۆ کاری چاکە و بەخشینی دارایی خۆی لە ڕێگەی ئایینی خودا زۆر ڕژد و چروکە.

بە ڕاستی هەرکەسێ دارایی زۆر خۆشبوێ، خۆی دوور خستووەتەوە لە مافی مرۆڤایەتی و بڕوای بە هیچ چاکەیە نەبێ، جگە لە کۆکردنەوەی دارایی، ئەگەر ئێمە وورد ببینەوە لە نەگبەتی مرۆڤایەتی هۆی پێشبڕکێ‌کردنە لەسەر کۆکردنەوەی سامان (هربرت ماركبوز) مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی (کۆلۆمبیا، هارفارد و مایز) لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، لە نامەکەی خۆیا: (الإنسان ذو العبد الواحد) ئەڵێ: (لە چ لایەکەوە ئەم هەموو چەکانە لەم سەردەمەدا ئەکرێ جگە لە خراپە هیچ تر ناکات، لەم کاتەدا دارایی و دەسەڵاتی پەیداکردووە بەسەر ئادەمیزاددا و، ئادەمیزاد هەموویان بوون بە بەندە بۆی).

﴿أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِي الْقُبُورِ وَحُصِّلَ مَا فِي الصُّدُورِ إِنَّ رَبَّهُمْ بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَخَبِيرٌ﴾ ئایا دووایی ئادەمیزاد نازانێ بە دوارۆژی خۆی و بەسەرهاتی کاتی مردووەکان زیندوو ئەکرێنەوە و، لە گۆڕەکانیان دێنە دەرێ بۆ پرسیار و پاداشت و، دەرئەکەوێ شتێ پەنهانیان داوە لە نیازی چاك و لە نیازی خراپ. بە ڕاستی لەو ڕۆژەدا پەروەدگاری ئەوان ئاگای لە کردار و گوفتاری ئەوان هەیە.

خودای مەزن لەو سورەتەدا سوێندی خواردووە بە چارەوێ جەنگ کردن و ئامادەکردنی چەك لەبەر ئەوەیە هانی باوەڕداران ئەدا لەسەر جەنگکردن بۆ بەرزی ئایینی خودا و، لە زۆر ئایەتەکاندا هانی باوەڕدارانی داوە خۆیان پڕچەك بکەن هەموو کاتێ بە جۆرە چەکێ شایستەی ئەو کاتە بێ، سوێند خواردنی خودا بە چارەوێ؛ چونکە ئەو کاتە بەهێزترینی چەك بووە.

## ﴿ سورەتی ئەلقاریعە ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (١١) ئایەتن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
ٱلْقَارِعَةُ ﴿١﴾ مَا ٱلْقَارِعَةُ ﴿٢﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْقَارِعَةُ
﴿٣﴾ يَوْمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلْفَرَاشِ ٱلْمَبْثُوثِ ﴿٤﴾
وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ ﴿٥﴾ فَأَمَّا
مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٦﴾ فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ
﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٨﴾ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ
﴿٩﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا هِيَهْ ﴿١٠﴾ نَارٌ حَامِيَةٌۢ ﴿١١﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان**

﴿الْقَارِعَةُ مَا الْقَارِعَةُ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْقَارِعَةُ﴾ ئەو شتەی دڵان ڕائەکێشێ و، ئەی‌لەرێنی چ شتێکە ئەلقاریعە. ئەلقاریعە ناوێکە لە ناوەکانی ڕۆژی دووایی، وەك ئەلحاقە و ساخە و تامەوغاشیە، چ شتێکی سەرسوڕێنەر و سەختێکی ئەوتۆیە بە تۆی پیشان بدا قاریعە چ شتێکە؟ هەندێ لە ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە ئەمەیە:

﴿يَوْمَ يَكُونُ النَّاسُ كَالْفَرَاشِ الْمَبْثُوثِ وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ الْمَنْفُوشِ﴾ ڕۆژێکە ئادەمیزاد وەك پەپولە بڵاو ئەبنەوە و، سەرگەردانن نازانن چی بکەن و، کێوەکانیش وەك خوری شیکراوەیان لێ دێ و، بە بایەکی سووك بڵاو ئەبنەوە.

﴿فَأَمَّا مَنْ ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَاضِيَةٍ﴾ دووایی هەرکەسێ کێشانەی کرداری چاکی قورسبێ و، شاراوەکانی پاك بێت، دووایی ئەو کەسە لە ناو گوزەران و ڕابواردنی خۆشیدایە، خۆی زۆری لاپەسەند و بە نرخە.

﴿وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ وَمَا أَدْرَاكَ مَا هِيَهْ نَارٌ حَامِيَةٌ﴾ وە هەرکەسێ کێشانەی کرداری چاکی سوکبێ، دوایی جێگەی ئەو کەسە هاوی‌یەیە، بە وێنەی منالێ بڕوا بۆلای دایکی و، چ شتێکی گرانبێ بە تۆی پیشانبدا هاویە چی‌یە، هاویە ئاگرێکی زۆر گەرمە.

ئەو فەرموودانەی خودای مەزن ئەوەمان بیر ئەخاتـەوە ئـادەمیزاد ئەیـەوێ بـەترازو شـتێکی خۆی بکێشێ هەتا بزانێ قورسە یـا سـووکە، وەك ئێسـتا تـرازووی وا سـووك هەیـە، تـەڕی و ووشکی و بەرزی و نزمی و سستی و خێرایی پێ ئەکێشرێ، لـە پاشەڕۆژیشـدا ترازوویـە هەیـە چاکی و خراپی و دڵپاکی و دڵپیسی پێ ئەکێشرێ، چۆنیەتی ئەو ترازووە هەر خودا ئەیزانێ.

# ﴿ سورەتی تەکاسور ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە.
ژمارەی ئایەتەکانی (٨) ئایەتن.


بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ ﴿١﴾ حَتَّىٰ زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ ﴿٢﴾ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٤﴾ كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ الْيَقِينِ ﴿٥﴾ لَتَرَوُنَّ الْجَحِيمَ ﴿٦﴾ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ الْيَقِينِ ﴿٧﴾ ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ ﴿٨﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان**

﴿أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ حَتَّى زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ﴾ دارایی زۆرکردن، خۆهەڵکێشانتان بە کوڕ و سامانی زۆرەوە، ئێوەی لاداوە لە ڕاستی و لە کردەوە چاکەکان و، ئەڵێن: ئێمە دارایی و پلەو پایەمان زۆرترە. ئێوە بیرناکەنەوە و، هەروەها لەسەر بێ ئاگایی و گومڕایی خۆتان ئەڕۆن هەتا ئەمرن و کۆتایی بە ژیانتان دێت و، ئەبن بە هاوڕێی گۆڕستان و دانیشتووانی ناو گۆڕستان. کەواتە ئێوە واز لەو کارانەی خۆتان بهێنن.

﴿كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ وازبێرن لە زۆرکردنی دارایی و خۆهەڵکێشان، دووایی ئەوانە هیچ سودێ بەوان نابەخشن، لەمەودوا خۆتان ئەزانن تووشی چ سزایەکی گران ئەبن، لە پاشانا دووبارە ئەڵێم: ئێوە پەشیمان ببنەوە لە بێ‌ئاگایی خۆتان، لەمەودوا ئەزانن کاری خراپتان کردووە.

﴿كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ الْيَقِينِ﴾ ئەو شتەی ئێوە بە چاکی ئەزانن بۆ خۆتان، وانی‌یە و گومانی پووچە، ئەگەر بزانن بە زانینێکی بێگومان بەسەر هات و دوارۆژی ئەو کەسانەی خۆیان هەڵئەکێشن بە دارایی زۆر و پلەوپایەوە، خۆتانتان ئەگێڕایەوە لە خۆ هەڵکێشان و پەشیمان ئەبوونەوە، زانینێ کردەوەی چاکی لەگەڵا نەبێ لەگەڵ نەزانینا یەکسانن.

﴿لَتَرَوُنَّ الْجَحِيمَ﴾ بە ڕاستی سوێند بە خودا ئێوەی تاوانبار دۆزەخ ئەبینن و ئەچنە ناوی دۆزەخەوە. لەبەر ئەوەی هەندێ کەس خۆی بە موسڵمان دائەنێ و، دڵخۆشی خۆی ئەداتەوە و ئەڵێ:

خودا لێم ئەبووریّ و کـردەوەی چـاك ناکـا و، بێ‌فـەرمانی زۆری خـودا ئـەکا و، هـەموو کردەوەکانی دژی فەرمودەی خودان، خودای مەزن وولامی ئەداتەوە، ئەفەرموێ:

﴿ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ الْيَقِينِ ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ﴾ من سوێند ئەخۆم بە خـودا بـە ڕاسـتی ئێوەی تاوانبار بە چاوی سەری خۆتان دۆزەخ ئەبینن و ئەچنە نـاوی دۆزەخ، کەواتـە ئێـوە لـە خودا بترسن و پەشیمان ببنەوە لـە گومانی پڕوپووچی خۆتان، گفتوگـۆی بـێ‌کردەوە سـوود بـە ئێوە نابەخشێ. لـە پاشانا سوێندم بە خودا: ئێوە پرسـیارتان لێ ئـەکرێ لـە ڕۆژی دوایـدا لـەو چاکانەی خودا بە خشیویە بە ئێوە لـە چ شتێکا بەکارتان هێناوە کە خۆتـانی پێـوە هەڵئەکێشـا. ئەگەر لەبێ‌فەرمانی خودا بەکارتان هێنابن سزاتان ئەدا بە سەختترین سزا.

# ﴿ سورەتی ئەلعەسر ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٣) ئایەتن.



﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان**

﴿وَالْعَصْرِ إِنَّ الْإِنْسَانَ لَفِي خُسْرٍ﴾ وە من سوێند ئەخۆم بەو کاتەی ئەوتۆ چەندین ڕووداو و کرداری تێدا پەیدا بووە لەمەوبەر، لەمەودوایش لەودوا پەیدا ئەبێ. بە ڕاستی ئادەمیزادێ گەورە بووبێ و، لە تەمەنی منالّی تێپەڕی‌بێ، لە زیان و گومڕایی و لەناوچووندان بە فەرمانی خودا و قورئان، ئیتر ئەو کەسە خاوەنی بە توانا بێ‌دەستەلاّتی خۆی بسەپێنێ بەسەر ئادەمیزاددا، یا گفتوگۆی ڕەوانبێ و جۆری ئامۆژگاری برازێنێتەوە، یا بتوانێ بۆمباری کوشندە و کیمیایی لە ناوبەری گیانداران بەکاربهێنێ، ئەو ئادەمیزادانە ئەو کارە خراپانە ئەکەن زیانۆمەندن.

﴿إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ جگە لە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە و، کردەوە چاکەکانیان کردووە و، هەندێکیان ئامۆژگاری هەندێ تریان کردبێ بە کردنی کاری ڕاست و ڕەوا ۆ، ڕایان سپاردبێ کە بە باوەڕ بە خودا و، بە ئامۆژگاری یەکتری بە خۆڕاگرتن لەسەر ئازار و کاری سەختی ڕۆژانە لە جیهاندا و، هەموو شتێ لە خوداوە بزانن.

خودای مەزن سوێندی خواردووە، بەو کاتەی ڕووداو و کردەوەی تێدا پەیدا ئەبێ، زیانۆمەندن ئەو ئادەمیزادانەن خۆیان خراپەکارن، نەك کاتەکان چونکە کات خۆی لە خۆیا نە چاکە و نە زیان بە نەخشە و، نە چاکەی بۆ ئەبێژرێ و نە خراپە. خودای مەزن سوێندی پێ خواردووە، لەبەر ئەوەی کات زۆر بە نرخە و، هەموو شتێکی چاك و خراپی تێدا ئەکرێ بەختیاری بۆ ئەو کەسەیە کاتی خۆی بەفیڕۆ نەدا، بە ڕاستی کات دەست مایەی ژیانە، ئەگونجێ تاکە کەسێ یا کۆمەڵێ گەلێکی بێ‌باوەڕ و چەوساوە بکەن بە خوداپەرست و ڕزگاریان بکەن لە ستەمی کار بەدەستانی تاوانبار، هەتادێ.

# ﴿ سورەتی ئەهومەزە ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٩) ئایەتن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ﴿١﴾ ٱلَّذِى جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُۥ ﴿٢﴾
يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ ﴿٣﴾ كَلَّا ۖ لَيُنۢبَذَنَّ فِى ٱلْحُطَمَةِ ﴿٤﴾
وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحُطَمَةُ ﴿٥﴾ نَارُ ٱللَّهِ ٱلْمُوقَدَةُ ﴿٦﴾ ٱلَّتِى تَطَّلِعُ
عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ ﴿٧﴾ إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ ﴿٨﴾ فِى عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍۭ ﴿٩﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان**

﴿وَيْلٌ لِكُلِّ هُمَزَةٍ لُمَزَةٍ الَّذِي جَمَعَ مَالاً وَعَدَّدَهُ﴾ بێ نرخی و ئابڕووچوون و سـزای سـەخت بۆ هەموو کەسانێکن تانە و تەشەر ئـەدەن لـە نامووسـی ئـادەمیزاد و، ئەیڕوشـێنن و، هـاتوچۆ ئەکەن لە نێوانیا، بۆ تێکدانی دۆستایەتی و خۆشەویستی‌یان و درۆ و بوختان و ئەکەن هەتا ئەیان کەن بە دوژمنی یەکتری. کەسێکی ئەوتۆیە دارایی زۆر کۆئەکاتەوە و، جار لە دوای جار ئـەی ژمێرێ و، بەو ژماردنە خۆشحاڵئەبێ و، خۆی لێبایی ئەبێ.

﴿يَحْسَبُ أنَّ مَالَهُ أخْلَدَهُ﴾ ئەو کەسە گومانی وایـە کـە بـە ڕاسـتی ئـەو دارایی‌یـەی خـۆی کۆکردووەتەوە و ئەی‌ژمێرێ و ئەی‌پارێزێ لە مردن و لە ڕووداوی خراپ و لـە سـزای ڕۆژی دوایی، هەموو کەسێکی لا بێ‌نرخە. خودای گەورە لە زۆر شـوێنی قورئـاندا هەڕەشـەی لـەو کەسانە کردووە. بەڵام هیچ جارێکی‌یان وەك ئەم جارە سەخت نەبووە کە ئەفەرموێ:

﴿كَلَّا لَيُنبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ﴾ ئەو دارایی‌یەی ئەو بە گوێرەی ئـەو گومانـەی خـۆی نابێ، بـە ڕاستی ئەو کەسە فڕە ئەدرێنە ناو حوتەمەوە و یـاخی بـووان و دارایـی پەرسـتان ئـەڕووخێنێ و ڕسوایان ئەکا.

﴿وَمَا أدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةُ نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ الَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى الْأَفْئِدَةِ﴾ وە چ شتێکی زۆر گـران و سەختە بە تۆی بناسێنێ حوتەمە چ شتێکە؟ حوتەمە ئاگری خودایە و، ئـاگری ئـادەمیزاد نی‌یـە،

ئاگری سزای خودایە، نەك ئاگری درەخت، ئاگرێکی هەڵگیسراوی ئەوتۆیە سزاکەی ئەگاتە ناو دڵەوە و، سەری دڵ ئەکەوێ و، هەموو ئەندامەکانی تاوانباران ئەسووتێنێ. بە تایبـەتی دڵ کـە جێگەی بێباوەڕو تانەیە.

﴿إِنَّهَا عَلَيْهِمْ مُؤْصَدَةٌ فِي عَمَدٍ مُمَدَّدَةٍ﴾ بە ڕاستی ئەو ئاگرە پێوە دراوە لـەسەریان و، هـەموو لایەکیان ئەگرێتەوە ڕاکردنیان بۆ نییە، بۆ هەر لایە برۆن هەر ئاگرە و هەڵمەتیان بۆ دێنێ، لـە ناو ئەستوون و پێوندا بەسترِاونەتەوە و، بەدرێژی ڕاکێشراون لـەناو ئەو پێونەدا.

# ﴿ سورەتی ئەلفیل ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٥) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ ﴿١﴾ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ
فِي تَضْلِيلٍ ﴿٢﴾ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ﴿٣﴾ تَرْمِيهِم
بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ ﴿٥﴾

ئەم سورەتە ئاماژە بۆ ڕووداوی فیل ئەکا. لە ساڵی (٥٧١)ی زایینیدا ڕووی داوە لە مەککە، ئەو ڕووداوە پلەیەکی زۆر گرنگی هەبووە لەو سەردەمەدا، چونکە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی خودای مەزن کە ڕێزی کەعبەی تێدا ڕەچاو ئەکرێ، پیلان و خراپەی ئەو کەسانە پووچ ئەکاتەوە لە دژی کەعبە بەرپای بکەن، ئەو ڕووداوەیش هاوکاتە لەگەڵ ساڵی لە دایکبوونی پێغەمەری خودای مەزن ﴿ﷺ﴾.

درێژەی ئەم ڕووداوەیش بەم جۆرەیە: کاتێ هەرێمی (یەمەن) و شارەکانی یەمەن داگیرکران لە لایەن (نەجاشی) پادشای حەبەشەکە ناوی (ئەسحەمەبوو) دووایی ئەبرەهەی کوڕی سەباحی کرد بە پادشای یەمەن لە جیاتی خۆی کاروباری یەمەن ببا بەڕێوە، پادشاکانی حەبەشە گاور بوون، دووایی لە (سەنعا)ی پایتەختی (یەمەن) (کلیسایەکی) درووست کرد ناوی نا (ئەلقەلیس) بە نیازی ئەوەی عەرەبەکان ڕوو وەربگێڕن لە کەعبە، بۆلای ئەو کلیسایە و، لە جیاتی کەعبە حەج لەوێ بکەن وهەموو کارێکی پێویستی بۆ ساختە هێنا، بە جۆرێکی ئاشتیانە هەوڵێکی زۆری داو بۆی نەچووە سەر، دووایی دەستی‌دایە زۆرداری و توند و تیژی لەگەڵ عەرەبەکان، ئەڵێن: پیاوێکی کەنانەیی چووە ناو ئەو کەنیسەیەوە و، پێویستی خۆی تێدا جێبەجێ‌کرد و، ڕقی هەڵسا و هەلی بۆ ڕەخسا، بە نیازی ڕووخانی کەعبە سووپایەکی زۆری بە هەموو ئامێرێکی کاولکەرەوە پێك هێنا، بە جۆرێ عەرەبەکان توانای بەرهەڵستی‌یان نەبێ، بەرەو شاری مەککە کەوتە ڕێ بۆ ڕووخاندنی خانەی خودا، چەند فیلیان لەگەڵ خۆیان برد بەسەر قافڵەیی فیلێکی گەورە بە ناوی (مەحمود)ەوە لە ڕێگەدا تووشی بەرگری نەبوون، هەتا گەیشتنە جێگەیە لە نزیکی مەککە، کە پێیان ئەوت: (ئەلموعەلەس) لەو جێگەیە سوپاکەی‌مۆڵدا، کاتێ نزیکی (تائیف) بوونەوە هۆزی (سەقیف) پیاوێکی‌یان بۆ شارەزایی ڕێگەی

مەککە بە ناوی (ئەبورِیغالْ) لەگەڵ ناردن لە ئەلموعەلەس مرد و دووایی گۆڕەکەی لە لایەن ڕیبوارانەوە بەردە باران ئەکرا. دووایی ئەبرەهە نوێنەرێکی خۆی بە نووسراوێکەوە نارد بۆلای قورەیشی‌یەکانی دانیشتووی مەککە، نووسیبووی: (من نەهاتووم جەنگ لەگەڵ ئێوە بکەم، بە ڕاستی من هاتووم کەعبە برووخێنم، ئەگەر جەنگمان لەگەڵ نەکەن، ئێمە پێویستمان بە خوێن ڕشتنی ئێوە نی‌یە، لە نامەکەیا نووسیبووی، ئەگەر گەورەی قورەیشی‌یەکان نەیویست جەنگمان لەگەڵ بکات، لەگەڵ خۆتا بیهێنە! لەو کاتەدا گەورەی قورەیشی‌یەکان (عەبدولموتەلیبی) کوڕی هاشمی کوڕی عەبدولمەنافبوو، باپیری پێغەمەر. عەبدولموتەلیب زۆر گەورە و بە سەرو سیمابوو، کاتێ زانی تواناى جەنگی نی‌یە، دەستووری دا بڕوا بۆلای ئەبرەهە، ووتوێژی لەگەڵ بکات، چووە لای و، پێی ووت: سێ‌یەکی دارایی قورەیش و جگەی قورەیشت ئەدەمێ بگەڕێرەوە، واز لە ڕووخاندنی کەعبە بهێنە، ئەبرەهە داواکەی وەرنەگرت. دووایی عەبدولموتەلیب ووتی: کەواتە پیاوانی تۆ دووسەد حوشتری منیان هێناوە، فەرمان بدە بم دەنەوە، ئەبەهە ووتی: من وام ئەزانی بەم سەر و سیمایانەوە، داوای نەڕووخانی کەعبەم لێ‌ئەکەی هۆی ڕێزی خۆت و باوباپیرت و هەموو عەرەبە، کەچی داوای دانەوەی هەموو هوشترەکانت ئەکەی عەبدولموتلیب ووتی: من خاوەنی هوشترم، خاوەنی کەعبە خودایە.

دووایی عەبدولموتەلیب گەڕایەوە بۆلای دانیشتووانی مەککە، دەستووری پێدان پەنا ببەن بۆلای کێوەکان و خۆتان بپارێزن لە سوپای ئەبرەهە، لە پاشا عەبدولموتەلیب و چەن کەسێ لە قورشەیشی‌یەکان چوون بۆلای کەعبە و لە خودا پاڕانەوە، داوای سەرکەوتنیان بەسەر ئەبرەهەدا کرد.

عەبدولموتەلیب دەستی گرت بە بازنەی کەعبەوە، فەرمووی: ئەی پەروەدگاری من: جگە لە تۆ هیوام بە کەسی تر نی‌یە، ئەی پەروەدگار ئەم قۆرخەی خۆت بپارێزە بە ڕاستی دوژمنی خانەی تۆ دوژمنی تۆیشە، ڕێگەیان پێ مەدە ئەم خانەیەی تۆ برووخێنن، لە پاشانا عەبدولموتەلیب و ئەوانی تر، خۆیانیان گەیاندە ئەوانەی لە پێشەوە چووبوون بۆ سەر کێوەکان، هەرچەندە هەندی تر ئەڵێن: عەبدولموتەلیب خۆی لای کەعبە مایەوە، ئەوەیش ئازایی و ئایین پەروەری و نیشتمان پەروەری ئەو دەرئەخا، چاوەڕوانبوون بزانن ئەبرەهە چ شتێ بە کەعبە ئەکات.

لە لایە ترەوە ئەبرەهە بە خۆی و بە سوپا فیلەکانی‌یەوە، ڕوویان کرد بۆلای کەعبە بە نیازی مەبەستی خۆی و ڕوخانی کەعبە. پێش هەنگی فیلەکان و فیلەکانی تر ڕاکشان بەسەر زەوی‌دا و بەرە و کەعبە نەڕۆیشتن، زۆریان هەوڵدا بێ سوود بوو، بەڵام ڕوویان بکرایە بۆلایە تر فیلەکان ئەکەوتنە لۆقە، لە پاشانا ئەوەی خودا ویستی بیکا بۆ لەناوبردنی ئەو سوپایە و ئەبرەهە

کردی بەوان. بۆ ئەو مەبەستە خودای مەزن چەند پۆلێکی باڵندەی بـۆ نـاردن، هەریەکـە لـەو باڵندانە سێ بەردی ڕەقی لە گڵی سورکراویان ڕژانـد بـە سـەرە ئـەو سـوپایەدا و، هـەموویان تووشی ئاوڵەبوون و مردن و لە ناوچوون.

زانایان لە دیاری‌کردنی ئەو بەردانە سەرگەردانن و نـازانن بـە چ جـۆرێ بـوون، ئایـا ئـەو بەردانە بەردی دۆزەخ بوون؟ ئادەمیزاد ئەو جۆرە باڵندانەیان بینیبوو لەوەبەر، یـا ئـەو بەردانـە نەخۆشی ئاوڵەیان پێوە بووە، یا جۆرە میکرۆبێ تری کوشندە، یا جـۆرە نەخۆشـی‌یە تریـان پـێ توشبوون. مێژوو بۆمانی گێڕاوەتەوە زۆر سوپا بە مەلاریا و تاعوون لە ناوچوون، بـە هـەرچۆنێ بێ ئەو باڵندانەسوپای بەهێزی خودابوون و، خودا ڕەوانەی بردوبوون بۆ لەناوبردنی ئـەو سـوپا ستەمکارە، ئەو ڕووداوە ئەفسانە نی‌یە. بەڵکو ڕووداوێکی ڕاست و بێگومانە، لـە کـاتی هاتنـە خوارەوەی ئەو سوورەتەدا، زۆر کەس مابوون کە بە چاوی خۆیـان ئـەو ڕووداوەیـان بینیبـوو، ئەگەر ئەو ڕووداوە گومانی تێدابووایە، دوژمنانی پێغەمەر ئەیان قۆزتەوە و، ئەیان کرد بە بەڵگە لەسەر گومان پەیداکردن بە قورئان، بۆ ڕاستی ئەو ڕووداوە خودای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان**

﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ﴾ ئایا تۆ نەتزانیوە پەروەدگاری تـۆ چ کـارێکی بـە خاوەن فیلەکان کرد، کە بریتی بوونلە ئەبرەهـە و سـوپاکە، هەرەچـەندە تـۆ نـەتبینیوە. بـەڵام ڕووداوێکی زۆر گرنگ و بەناوبانگە. کە ئەو کەسانە ئەو ڕووداوەیان بینیوە، ئەیان ووت: فلان شت لە ساڵی فیلدا بووە. زانایان ئەڵێن: پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەو ساڵەی ڕووداوی فیلدا لە دایـک بووە؟

﴿أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ﴾ ئایا پەروەدگاری تۆ پیلان و فڕوفێڵی ئەوانی لە ناو نەبرد و پوچی نـەکردەوە، زۆر ڕاسـت و بێگومانـە پوچـی کـردەوە، لـە نـاوی بـردن بـە ئاگـاداری دانیشتووانی ئەو سەردەمەی ئەوان. لە ناو بردنیان بەم جۆرە بوو.

﴿وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْراً أَبَابِيلَ تَرْمِيهِمْ بِحِجَارَةٍ مِنْ سِجِّيلٍ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَأْكُولٍ﴾ پەروەدگاری تۆ پۆل پۆل باڵندەی ڕەوانە کرد بۆ سەر خاوەن فیلەکان، بـەردی ڕەقـی لـە گـڵ سوورکراوەیان تێ‌گرتن، دووایی کردنیان بە کای خـوراو و، کـرم و مۆرانـە تـێ‌دان و ڕزاڵ ڕزاڵ بوون.

# ﴿ سورەتی قورەیش ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٤) ئایەتن.


بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ ﴿١﴾ إِيلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ ﴿٢﴾ فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَٰذَا الْبَيْتِ ﴿٣﴾ الَّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ ﴿٤﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان**

بەر لەوەی دەست بکەین بە ماناکردنی ئەم سوورەتە، باسی پەیمانی قورەیشی‌یەکان ئەکەین لەگەڵ هەرێمەکانی دراوسێ‌کانیانا:

عەبدولمەنافی گەورەی قورەیشی‌یەکان، چوار کوڕی هەبووە: ١. هاشمی باوکی عەبدولموتەلیبی باپیری پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، ٢. عەبدوشەمس، ٣. موتەلیب، ٤. نەوفەل، هەر یەکە لەو پیاوە گەورانە پەیمانێکی بازرگانی‌یان بەستبوو لەگەڵ هەرێمەکانی دراوسێ‌کانی نیوەدوورگەی عەرەب:

هاشم پەیمانی بەستبوو لەگەڵ پادشای ڕۆم، عەبدوشەمس لەگەڵ پادشای حەبەشە. موتەلیب لەگەڵ پادشای یەمەن. نەوفەل لەگەڵ پادشای ئێران.

ئەو چوار برایە بەهۆی ئەو پەیمانانەوە، ئەیانتوانی بەبێ ترس بە سەربەستی هاتوچۆ بکەن بۆلای ئەو هەرێمانە بۆ بازرگانی زستان و هاوینان و قازانجی زۆر بکەن. بەهۆی ئەو پەیمانەوە، بەبێ ترس و بە ئاسایش ئەڕۆیشتن و ئەهاتنەوە، ئەو پەیمان و یەکگرتنەیان چاکەیەکی زۆر گەورە بوو، خودای مەزن بەوانی بەخشیبوو لەکەس نەئەترسان و کەس ئازاری نەئەدان. لە کاتێکا ستەم و دەست درێژی ئەکرایە سەر جگەی ئەوان و ڕاو و ڕووتوو تاڵان و کوشتن و بێ‌یاسایی پەرەی سەندبوو، کەچی ئەوان بەهۆی میهرەبانی و ڕێزی خانەی خوداوە، هاتوچۆیان ئەکرد بۆ شارەکان و خۆیانیان ڕزگار ئەکرد لە برسێتی و لە گرانی و قازانجی زۆریان ئەکرد، دووایی خودای مەزن بەو بۆنەوە ئەفەرموێ:

﴿لِإِيلافِ قُرَيْشٍ إِيلافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ﴾ لەبەر سوودی بەنرخی پەیمانی قورەیشی‌یەکان، کە بریتی بوون لە بەستنی پەیمانی ئەوان لەگەڵ دراوسێ‌کانیان، بۆ هاتوچۆکردنی ئەوان لە زستانا بۆلای یەمەن و، لە هاویندا بۆلای شام بۆ بازرگانی بە بێ ترس، لەبەر ڕێزی خانەی خودا، هیچ کەسێ ئازاری ئەوانی نەئەدا و ڕێزیان لێ ئەگرتن، لەکاتێکا ئەو چاکەیە خوای گەورە لەگەڵ ئەوانی کردبوو، لەگەڵ هیچ هۆزێکی تری عەرەبی نەئەکرد. جا لەبەر ئەو چاکە بێ‌وێنەیە پەروەردگاری خۆیان.

﴿فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ الَّذِي أَطْعَمَهُمْ مِنْ جُوعٍ وَآمَنَهُمْ مِنْ خَوْفٍ﴾ دووایی پێویستە ئەو قورەیشی‌یانە پەروەدگاری ئەم خانەیە بپەرستن، ئەو پەروەدگارەی ئەوتۆ لەبەر برسێتی سەخت خواردەمەنی بەخشی بەوان و، لەبرسێتی ڕزگاری کردن، ئەگەر ئەو خانەیە نەبووایە، لەبەر بێ‌دەرامەتی شوێنەکەیان و ڕاو و ڕووتی ناوخۆیان هەمیشە برسی ئەبوون و، ئەو خودایەی ئەوتۆ ئاسوودە و دڵنیای کردن لە ترس و لە دەست درێژی ستەمکاران، هەر لەبەر ڕێزی خانەی پەروەدگاری خۆیان. (کەواتە پیتی لام لە ووشەی ﴿لإِيلافِ﴾ پەیوەستە بە کرداری ﴿فَلْيَعْبُدُوا﴾وە).

بۆ زانین: زانایان لە دیاری‌کردنی مانای قورەیش بیریان جیاوازە: هەندێکیان ئەڵێن لە (قیرش)ەوە هاتووە کە بە مانا کۆکردنەوە و کەسابەت کردنە؛ لەبەر ئەوە قورەیشی‌یەکان خەریکی کۆکردنەوەی دارایی و بازرگانی بوون، هەندێ تریان ئەڵێن (قیرش) تیمساحی ناو دەریایە، هەر گیانداری بڕوا بەلایا ئەیخوا، هیچ شتێ ناتوانێ ئەو بخوا و سەربکەوێ بە سەریا، هەروەها هۆزی و قورشیش بە توانان و خواردەمەنی زۆر شارەکان ئەخۆن و کەس ناتوانێ دارایی ئەوان بخوا لەبەر ڕێزی خانەی خودا.

قورەیشی‌یەکان بەو عەرەبانە ئەڵێن: لە کوڕ و نەوەی (نەضری کوڕی کەنانە بێ)، جگەی ئەوانە قورەیش نین. قوڕیشی‌یەکان دانیشتووی دەرەوەی مەککە بوون (قوسەی) کوڕی کیلاب کۆی کردنەوە و، لە مەکە جێگیربوون، دانیشتووانی مەککە پێك هاتبوون لە خولی شەشەمی زاینیدا لە سێ تاقم: (١) قورەیشی‌یەکان خاوەنی هەموو مافێ بوون. (٢) هاوسوێنەکانی قورەیش لە عەرەبەکانی تر. (٣) کۆیلەکان خاوەنی خۆیان و دارایی نەبوون، قورەیشی‌یەکان سەربەستبوون بەبێ ترس بازرگانی‌یان ئەکرد لە نێوان مەککە و شام و یەمەندا، ڕێزیان ئەگیرا لەبەر خانەی خودا.

خودای‌مەزن بەم سورەتە بیری ئەو قورەیشیانە ئەخاتەوە بتەکان ئەپەرستن لە جگەی خودا و، پێغەمەری خودا بە درۆئەخەنەوە و لە سزای خودا ناترسن و، ڕووداوی خاوەن فیلەکانیان بیر ئەخاتەوە چۆنی کردن بە کای خودا و، کەواتە قورەیشی‌یەکانیش بە وێنەی ئەوان لا ئەبا،

ئەوەیشییان بیر ئەخاتەوە خواردەمەنی زۆریـان پـێ بەخشـیون بـەهۆی چوونیـان بـۆ بازرگـانی زستانان و هاوینان لـە یەمەن و شامدا، لـە خۆیان و لـە داراییان دڵنیان لـە دانیشتن و گەڕانیانا، ئەگەر میهرەبانی خودا نەبووایە ئەیان فڕاندن، لـەگەڵ ئەو هەمووە چاکانەدا بـۆ خـودای مـەزن ناپەرستن و، واز لـە بت پەرستی نایەرن، بۆ سوپاسی خودا ناکەن؟

زانایان بیریان جیاوازە: ئایا ئەو سورەتە سوورەتێکی سەربەخۆیە، یا لـەگەڵ سوورەتی فیلـــدا یەك سوورەتن و، ئەم سوورەتە درێژە دانە بە سوورەتی فیل. زۆربەی زۆری زانایان لایـــان وایـە سورەتێکی سەربەخۆیە.

# ﴿ سورەتی ئەلماعون ﴾

لە مەككە هاتووەتـە خـوارەوە. هـەندێ ل زانايـان ئـەڵێن هـەندێكی لـە مەككـە هاتووتـە خوارەوە. هەندێ تری لـە مەدينە هاتوونەتە خوارەوە. ژمارەی ئايەتەكانی (٧) ئايەتن.


بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴿١﴾ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى
يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ﴿٢﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣﴾
فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ
﴿٥﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ﴿٦﴾ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ﴿٧﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان**

هەندی كەسی واهەن نوێژی زۆر ئەكـەن و ڕۆژوو ئـەگرن كـە پـارەی تـێ ناچـێ و، وای دەرئەخەن پياو چاك خودا پەرستن، لـەگەڵ ئەوەيشدا سـودێ لـێ وەرنـاگرن، زۆرداريـان بـێ دەستەڵاتەكان ئازار ئەدەن، ساماندارەكانيان ئاگايان لە هـەژاران نيـە و، بـەزەييان بـە هـەتيوانا نايەتەوە و، بۆ كردنی نوێژەكانيان تەمەڵن يا نايان كەن، لەوبارەوە خودای مەزن ئەفەرموێ.

﴿أَرَأَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ﴾ ئايا تۆ زانيوتە بە كەسێكی ئەوتۆ پاداشـت و پرسيار بـە درۆ ئەخاتەوە و بڕوای پێی نی‌یە، هەروەها ئەم سوورەتە بەڵگەی بێگومان و ڕوونـە لـەسـەر ئـەوەی خودای گەورە داوای برايەتی ئەكا لە نێوان ئايين و كرداردا و، كردار بەشـێكە لـەئايين، بۆيـە خودای گەورە ئەفەرموێ بەو كەسانە چرووك و باوەڕدار نين و بێ بەزەيين لـەگەڵ هەتيوان.

﴿فَذَلِكَ الَّذِي يَدُعُّ الْيَتِيمَ وَلا يَحُضُّ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ﴾ دووايی ئەو كەسە باوەڕی بە ئايين و پاداشت، نی‌یە، كەسێكی ئەوتۆيە پاڵ بە هەتيوانەوە ئـەنێ و، مـافی خۆيـانی ناداتـێ و، بـەواتا هەڵئەشاخێ و بەزەيی بەوا نايەتەوە و، ئازاری ئەدا، ئەو كەسە ستەمكارە، ئيـتر بـا نوێـژ بكـا و ڕۆژوو بگرێ و، كاری دەركەوتوو درۆشمی سەرديوارە كاتێ سود ئەبەخشێ، خۆی بپارێزی لـە بێفەرمانی خودا، ئەو كەسەی لـە جيـهاندا شـايەتيمان بـهێنێ، وەك موسـڵمانە لـە كاروبـاری جيهاندا، پاشەڕۆژی بە دەستی خودای گەورەيە، ئەو كەسەی باوەڕی بە پاداشت نی‌يە كەسێكی ئەوتۆيە، هانی دانيشتووان نادا لـەسەر خواردەمەنی دان بە هەژاران و، يارمەتی يەكتری نادەن و،

بۆ جێبەجێ‌کردنی کاری کەسانی پەك کەوتە و، بێ بەشان لە سەر کار و فرمان و دایان نامەزرێنن لەسەر کارێ‌پێ بژی، بێگومان ئەو کەسەی هانی مەردووم نەدات بۆ دەست گیرۆیی هەژاران خۆیشی یارمەتی‌یان نادا.

﴿فَوَيْلٌ لِلْمُصَلِّينَ الَّذِينَ هُمْ عَنْ صَلاتِهِمْ سَاهُونَ﴾ دووایی سزای سەخت و نەمان بۆ ئەو نوێژکەرانەی ئەوتۆیە لە کردنی نوێژەکانیانا ئاگایان لە کردنی نوێژەکانیان نی‌یە، بەشی زۆری نوێژکەران نازانێ نوێژ بۆ چ کەسێ ئەکا و، بۆچی ئەکا و، لەوانەیە هەموو قورئانیشی تێدا بخوێنێ و، ئەگەر ئەو کەسە بە ڕاستی نوێژ بکا، چۆن بەزەیی بە هەتیوا نایەتەوە و، دەست گیرۆیی هەژاران چۆن ناکا؟

﴿الَّذِينَ هُمْ يُرَاؤُونَ وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ﴾ کەسانێکی ئەوتۆن ئەوانە نوێژ بە ڕوپامایی ئەکەن و، ئەگەر ئادەمیزادێ چاوی لێ نەبێ نوێژ ناکا و، هەموو شتێ سوودی تێدا بێ لەبەر ڕەزامەندی خودا نایدا بە هیچ کەسێ بۆ ڕوپامایی ئەیدا، هەتا بڵێن: پیاوچاکن، ووشەی ماعون بریتی‌یە لە هەموو شتێکی بەسوود، با وەکو گەوچکێ بێ، یا بچوکتر لە کەوچکێ.

ئەو سوورەتە نیوەی هاتۆتە خوارەوە لە مەککە دەربارەی عاسی کوڕی وائیل و، وەلیدی کوڕی موغەیرە، ئەو نیوەی‌کەی تری لە مەدینە هاتووتە خوارەوە دەربارەی دووڕووەکان، نوێژیان بە ڕووپامایی ئەکرد.

# ﴿ سورەتی ئەلکەوسەر ﴾

لە مەکە هاتۆتە خوارەوە ژمارەی ئایەتەکانی (٣) ئایەتن.



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ ﴿١﴾ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ ﴿٢﴾
إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ ﴿٣﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان**

﴿إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ﴾ بە ڕاستی ئێمە بەخشیومان بە تۆ هەموو شتێکی چاك و بەسوود و بە نرخ لە هەردوو جیهاندا، وەك پێغەمەرایەتی و، زانست و زانیاری، باسکردنت بە چاکە و، بە پەیڕەوانی زۆر بەتۆ، هەتا ڕۆژی دوایی، هەندی لە زانایان ئەڵێن: کەوسەر بریتی‌یە لە ڕووبارێکی بەهەشت، ئاوەکەی زۆر خۆش و بە تامە، خودا ئەیبەخشێ بە پێغەمەر و ئۆمەتەکەی.

ئەو شتانە باسکران هەرچەندە بێباوەڕان بە کەمی ئەزانن: بەڵام یەکجار گەورەن و سوودیان زۆر زۆرە، سەرمایەیێکی زۆر بە نرخ و گەورەن.

چ شتێکی گەورەترە لە پێغەمەرایەتی کە بریتی‌یە لە پەیوەندی لەگەل خودای مەزندا و، بریتی‌یە ل قورئان و دەستووری ئیسلام کە شارەزایی ئادەمیزاد ئەکەن بۆلای فێربوونی چاکە و ڕەوشتی بەرز و برایەتی و ئاشتی خوازی.

چ شتێکی گەورەترە لەوە هەموو شەو و ڕۆژێ پێویستە ناوی پێغەمەر و ناوی خودا بهێنرێ لە نوێژەکاندا، لە لایەن زۆرتر لە ملیارێ ئادەمیزاد و، سڵەواتی لەسەر بدەن و شایەتیمانی پێ بهێنن دووای خودای گەورە.

دوای ئەوەی خودای مەزن موژدە دەدا بە پێغەمەر بەو شتانە و بە شتی زۆرتری سوود بەخش، داوا لە پێغەمەر ئەکا لەبەر ئەو هەموو چاکانە بەندەیی خۆی دەربڕێ بە چاکترین و سوپاس بە دەست گیرۆیی هەژاران ئەفەرموێ:

﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾ دووایی تۆ لەبەر ڕەزایەتی خودا و لەبەر سوپاسکردنی نوێژەکانت بکە بە بەردەوامی و، بە نیازی پاکەوە و، چوارپێکان سەربڕە و بیان کە بە قوربانی و، گۆشت و پێستەکانیان ببەخشە بە هەژاران و، دووای ئەوانە خودای مەزن دڵخۆشی پێغەمەر ئەداتەوە کە تاوانجی‌یان ئەگرتە پێغەمەر و ئەفەرموێ:

﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ﴾ بە ڕاستی ئەو کەسەی تۆی خۆشناوێ، هەر ئەوە بێ وەجـاخ و بـێ چاکەیە، چونکە لـە دوای مردنی ناوی بە خراپە ئەبرێ، ئەو کەسە هەرچەندە بڵێ، موحەممەد و منداڵەکانی ئەمرن و وەجاخ کوێرە. بەڵام هەر خۆی وەجـاخ کوێـرە، بـاوەکو منـاڵی زۆریشـی هەبێ، دوژمنی تۆ بە وێنەی تۆزە و بای سەخت ئەیبا بە ئاسماندا. بێ‌بـاوەڕان پێغەمـەریان لـەبـەر خۆی خۆش نەئەویست، چونکە پێغەمەر خـۆی لـە خۆیـا پیـاوێکی نـازدار و خۆشەویسـتبووە. بەڵکو ئەو ئایینەیان خۆش نەئەویست، پێغەمەر داوای ئەکرد باوەڕی پێ بهێنن.

ئەو سوورەتە لەوە هاتووەتە خوارەوە هەندێ لـە دوژمنـانی پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾، کاتـێ ئـەیاندی پێغەمەر منداڵی نێرینەی نی‌یە، زۆریان پێ خۆشبوو ئەیان ووت: موحەممەد وەجاخ کوێرە و منـاڵی نی‌یە جێگەی خۆی بگرێتەوە، ئەو خۆ هەڵکێشان و تاوانجەی دوژمنان کاری کردە سەر پێغەمەر و، خەفەتی ئەخوارد. بە بۆنەوە خودای گەورە ئەو سوورەتەی ناردە خوارەوە.

بۆ زانین: قوربانی خۆی لـە خۆیا سوونەتە و پێویست نی‌یە. بـەڵام کـاتی وا ئـەبێ ئـادەمیزاد پێویستی ئەکا لـەسەر خۆی. وەك ئەوەی بەر لـە مانگی قوربان بڵێ: ئەو مەڕە یا ئەو بزنە ئەکەم بە قوربانی، یا بڵێ: نەزربێ لـەسەرم قوربانی‌یە بکەم، دووایی ئەو نەزرە حەیوانێ دیـاری ئـەکا. جا قوربانی سوونەت خاوەنەکەی ئەتوانێ خۆی و خێزانی هەموو گۆشتەکەی بخۆن، چـاك وایـە بیبەخشێ بە ئادەمیزاد، کەمێکی بۆ خۆی دابنێ، بەڵام قوربانیە پێویست کراوە و، قوربانی‌یە بـۆ مردوو بکرێ بە گوێرەی ڕاسپاردەی خۆی، نابێ ئەوانە لێی بخۆن نە خۆیان و نەخێزانـەکانیان و نە ساماندااران، کەسانێ قوربانی‌یەکە ئەکەن. ئەبێ ئەمەیش بزانرێ: بزن و مەڕ بۆ تاکە کەسـێ ئەکرێ بە قوربانی. گا و حوشتر بۆ حەوت کەس ئەکرێ بە قوربانی، ئـەبێ و ئـەو بـزن و ئـەو ڕەشەووڵاخەی ئەکرێن بە قوربانی تەمەنیان لـە دوو ساڵ کەمتر نەبێ. مەڕ تەمەنی لە یەك سـاڵ بەرەو ژوور بێ، هوشتر تەمەنی لە پێنج ساڵ بەرەو ژوورتربێ.

# ﴿ سورەتی ئەلکافیرون ﴾

لە مەکە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٦) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ﴿١﴾ لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾
وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾
وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان**

هەندی لە بێباوەڕان، وێنەی عاسی کوڕی وائیل و، وەلیدی کوڕی موغەیرە و، جگەی ئەوانیش لەو کەسانەی خودای مەزن ئەیزانی باوەڕ نایەرن و ووتیان بە پێغەمەر: تۆ ساڵێ خوداکانی ئێمە بپەرستە، ئێمەیش ساڵێ خودای تۆ ئەپەرستین، دووایی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: من شتی وا هەرگیز ناکەم، ووتیان: تۆ واز لە هەندێ لە خوداکانی ئێمە بهێنە ئێمە بڕوا بە تۆ ئەهێنین و خودای تۆ ئەپەرستین، پێغەمەر فەرمووی: چاوەڕوانی شتێ ئەکەم لای پەروەدگاری خۆمەوە بۆم بێ، خودای گەورە ئەم سوورەتەی نارده خوارەوە، دووایی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ڕووی کرد بۆلای (المسجد الحرام)، ڕاوەستا و سوورەتەکەی بەسەردا خوێندنەوە، دووای ئەوەی بێ ئومێد بوون ئازاری پێغەمەریان داو، پێغەمەری خودا ڕووی تێکردن و بەوانی ووت بە گوێرەی فەرمانی خودا.

﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ لا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ﴾ تۆ بڵێ: ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕ نایەرن، من ئێستا باوەڕ بە شتێ نایەرم ئێوە ئەیپەرستن.

﴿وَلا أَنْتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ﴾ وە ئێوەیش ئێستا باوەڕ بەو خودایە نایەرن من ئەیپەرستم.

﴿وَلا أَنَا عَابِدٌ مَا عَبَدْتُمْ وَلا أَنْتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ﴾ وە من لەمەودواش شتێ ناپەرستم ئێوە ئەیپەرستن لە بتەکان و، ئێوەیش لەمەودوا ئەو خودایە ناپەرستن من ئەی پەرستم.

﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾ هەربۆخۆتانە ئایینی خۆتان و وازی لێنایەرن و، ئایینی من لەسەریمی ئایینی خۆمە و وازی لێ ناهێنم، دووای هاوبەشدانان بۆ خودا هەر بۆختانە، دانانی خودا بە تاك و تەنهاو بێ هاوبەش هەر بۆ من بێ، من هیچ پەیوەندی‌یەکم بە ئێوە و بە پەرستراوەکەتانەوە نی‌یە و، ئێوەیش هەروابن بۆ خۆتان، دووپاتکردنەوەی پەرستن گرنگی‌دانە بە مەبەستی پەرستن.

ئەو بێباوەڕانە لەو سوورەتەدا بە فەرموودەی خودا ڕوویان بەلاوە کراوە، چەند بەشێکن: هەیانە دارایی پەرست و ئارەزۆ پەرست و پیاوانی بە دەسەڵات ئەپەرستن. هەیانە لە بنچینەدا بڕوایان بە بوونی خودا نی‌یە. هەیانە سروشت پەرست و فریشتە پەرست وئەستێرە پەرستن. هەیانە هاوبەشی بۆ خودا دائەنێن، ئەوانە هەموویان ئێستا شاگردیان هەن و، ئەیانەوێ ئادەمیزاد لە باوەڕهێنان بە خودا و بە ڕۆژی دووایی لەو فەرموودانەی قورئان و پێغەمەر لابدەن، هەریەکەیان بە تاکتیکی تایبەتی خۆیان.

خودای مەزن لەم سوورەتەدا بە ڕستەی ئایەتی شەش بڕیاری بە سەربەستی بیر و باوەڕ داوە بۆ هەموو کەسێ، ئەقڵی پێداون، بە ئارەزۆی خۆیان هەر بیر و باوەڕێ هەڵبژێرن خۆیان بەرپرسن، ئەو سەربەستی‌یە ئیسلام بەر لە زۆرتر لە (١٤٢١) ساڵ فەرمانی پێداوە. بە داخەوە ئێستا کاربەدەستانی ستەمکار سەربەستی‌یان نەهێشتووە و، مەگەر شتێ سوودی خۆیانی تێدا بێ. بەو بۆنەوە خوێنی هەزاران ئادەمیزادێ بێتاوانی تێدا ئەڕژێ. ئەبێ لە بیرمان نەچێ ئایینی ئیسلام ڕێگە ئەدا بەسەربەستی بیر و باوەڕ، بە مەرجێ دەست درێژی و تاوانج نەگرنەئایینی ئیسلام و سەربەستی ئایینی ئیسلام.

# ﴿ سورەتی نەسر ﴾

لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٣) ئایەتن.



﴿ بسم الله الرحمن الرحیم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان**

لە سەرەتای ئیسلامدا موسڵمانان زۆر کەمبوون و، هەژار و بێ دەستەلاتبوون، بێباوەڕان ساماندار بوون و ژمارەیان زۆربوون، ئازاری باوەڕدارانیان ئەدا، پێغەمەر زۆر خەفەتی ئەخوارد کە گەلەکەی باوەڕ نایەرن و، بە درۆیشی ئەخەنەوە، لە لایەوە ترەوە خەفەتی زۆرتری ئەخوارد کە باوەڕداران زۆر ئازار ئەدرێن و، زۆربەیان بێ ئومێدبوون، لە دڵەوە ئەیان ووت: سەرکەوتنی ئێمە زۆر دوورە، ئاگایان لەوە نەبوو خودای مەزن سەرکەوتنی باوەڕدارانی نزیك خستووەتەوە، دووایی خودای مەزن بەو سەرکەوتنە دڵخۆشی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەداتەوە، ئەفەرموێ کاتێ ئێوە سەرکەوتن سوپاسی خودا بکەن و لە خۆتان بایی مەبن، وەك ئەفەرموێ:

﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ﴾ هەرکاتی یارمەتیدانی خودا هات بۆلای تۆ و، ئایینی خودا سەرکەوتوو پەرەسەند و، دڵی ئادەمیزاد کرایەوە بۆ وەرگرتنی ئایینی ئیسلام و شاری مەککە گیرا.

﴿وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجاً﴾ وە تۆ ئادەمیزادت ئەبینی ئەچوونە ناو ئایینی خودا و، ئایینی ئیسلام کۆمەڵ لە دوای کۆمەڵ و تاقم لە دوای تاقم. هۆزەکانی عەرەب بۆ ئیسلام بوونیان چاوەڕوانی ئەوەیان ئەکرد شاری مەککە بگیرێ، دوای گرتنی مەککە کاری موسڵمانان گەورەبوو، لە ماوەیەکی کەمدا ئایینی ئیسلام بڵاو بوویەوە، عەرەبەکان بەهۆی ئایینی ئیسلامەوە بوون بە یەك و، دوای پارچەپارچەبوونیان و، دوای لاوازییان هێزیان پەیدا کرد و، بوون بە پێشەوای هەموو گەلان بۆلای چاکە کردن.

﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ﴾ دووای کۆمەکی کردنی خودای مەزن بۆ تۆ و، دوای کردنەوەی دڵی ئادەمیزاد، دوای ئەوەی خودای گەورە بەڵێنی خۆی بردە سەر، نۆپاکی و

خاوێنی بۆ خودا دەربڕە و، دووری بخەرەوە لە کاری ناشایستە، بەهۆی سوپاس کردن بۆ پەروەدگاریێ، کە خاوەنی توانایەکی وایە کەس زاڵ نابێ بەسەریا، ئەگەر چەن ڕۆژێ مۆڵەتی بێ‌باوەڕان بدات، دووایی لە ناویان ئەبا و، تۆ داوای لێبوردن بکە لە پەروەردگاری خۆت بۆ خۆت و، بۆ هاوڕێکانت لەو بێ ئومێدی‌یە پەیدایان کردبوو لە دڵیانا.

﴿إِنَّهُ كَانَ تَوَّاباً﴾ بە ڕاستی پەروەدگاری تۆ زۆر میهرەبانە وخاوەنی پەشیمانی وەرگرتنە لە بەندەکانی خۆی بە زۆری.

بوخاری موسلیم ئەڵێن: عومەری کوڕی خەتتاب پرسیاری کرد لە پیاوەپیرەکانی بەدر: ئێوە چ شتێ ئەڵێن دەربارەی هاتنە خوارەوەئەو سوورەتە: هەندێکیان ووتیان: خودای‌مەزن داوای لێبوردن و سوپاسکردنمان لە نیازی بێئومێدمان لێ‌چ ئەکا کە وامان ئەزانی سەرناکەوین، عەبدولای کوڕی عەبباس فەرمووی:

هاتنە خوارەوەی ئەو سوورەتە ئاماژەیە بۆ نزیك بوونەوەی کۆچی دووایی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾.

# ﴿ سورەتی تـەبـەت ﴾

لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٥) ئایەتن.


بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ مَا أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ ﴿٢﴾ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ﴿٣﴾ وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ ﴿٤﴾ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ ﴿٥﴾

لە سەرەتای هاتنی ئاییمی ئیسلامدا، خودای مەزن فەرمانی‌دا بە پێغەمەر (ﷺ) خزمە نزیکەکانی بترسێنێ لە سزای خودا و، بەر لە هەموو کەسێ داوایان لێ‌بکا باوەڕ بە خودا و بە پێغەمەر و ئایینی ئیسلام بهێنن، بۆ ڕاگەیاندنی فەرمان ڕۆژێ چووە سەر سەکۆی (سەفا) کە لە ناوەڕاستی مەککەدا، بانگی دانیشتووانی مەککەی کرد، هەموویان هاتن بۆلای و، دووایی پێغەمەر فەرمووی: ئەگەر من بلێم: سوپایەکی زۆر لەودیوی ئەو کێوەن ئەیانەوێ لە ناکاودا پەلامارتان بدەن، ئایا ئێوە بڕوام پێ ئەکەن؟ ئەوانیش ووتیان: بڕوات پێ ئەکەین. چونکە ئێمە هەرگیز درۆمان لە تۆ نەدیوە، دووایی پێغەمەر فەرمووی: بە ڕاستی من نێردراوی خودام بۆ سەر ئێوە و هەموو ئادەمیزاد. کەواتە باوەڕ بە خودا و بە پێغەمەرایەتی من بهێنن. ئەبولەهەبی مامی ووتی: (لەناوچوون بۆ تۆ بێ، ئایا تۆ بانگی ئێمەت بۆ ئەوە کردووە)، لەو کاتەوە بەدواوە ئەبو لەهەب، دوژمنایەتی سەختی پێغەمەری ئەکرد و ئەیووت درۆزنە، هەروەها ژنەکەیشی زۆر لەو خراپتر بوو، هەموو کاتێ بوختان و درۆی بۆ پێغەمەر ساز ئەکرد، بەو بۆنەوە خودای گەورە، ئەم سوورەتەی ناردە خوارەوە و فەرمووی:

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان**

﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ﴾ لە ناوچێ و نەمێنێ هەردوو دەستی ئەبو لەهەب، نەمانی هەردوو دەستی هێمایە بۆ نەمانی خۆی، چوونکە دەستی ئادەمیزاد سەرچاوەی هەموو کارکردنێکە، ئەگەر دەستی نەما وەك خۆی نەمابێ وایە، کوردەواری خۆشمان ئەڵێن بە کەسێ کارێ خراپ بکا: (دەستی بشکێ) و، ئەبو لەهەب لە ناوچوو بە ڕسوایی، لە دوای جەنگی بەدردا.

ئەبولەهەب ناوی (عەبدولعوزا)ی کوڕی عەبدولموتەلیبی کوڕی هیشامە و مامی پێغەمەرە ﴿ﷺ﴾ دوژمنی سەرسەختی پێغەمەر بووە.

﴿مَا أَغْنَى عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ﴾ دارایی و شتێ کردی لە دژی پێغەمەر کە لە ناوی بدا سوودی پێ نەبەخشێ دوای جەنگی بەدر بە چەند ڕۆژێ بە گەڕۆلی مرد، لە دوارۆژدا سزای گرانتری ئەدرێ، وەك ئەفەرموێ:

﴿سَيَصْلَى نَاراً ذَاتَ لَهَبٍ وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ﴾ لەمەودوا ئەبولەهەب و ژنەکەی هەڵگری سەرچاوەی دوژمنانی و تێکدانی نێوان ئادەمیزاد، هاندانی دانیشتووانە لە دژی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ وەك هەڵگری دارە بۆ خۆشکردنی ئاگر. ئەو ژنە ناوی ئوریایە خوشکی ئەبوسوفیانی باوکی موعاویە بووە، زۆر جاران دڕك و پیسایی لە ڕێگەی پێغەمەر دائەنا گفتوگۆی خراپی ئاراستەی پێغەمەر ئەکرد.

﴿فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِنْ مَسَدٍ﴾ لە ملی ئەو ژنەدایە گوریسێکی ئەستووری بادراو لە پووشی خورما بۆ هەڵگرتنی درەخت بۆ خۆشکردنی ئاگری دوژمنایەتی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، لە ڕۆژی دووایشدا زەنجیری سورۆکراوەی ناودۆزەخ ئەکرێتە ملی ڕۆژێ لە ڕۆژان کۆڵی درەختی بە کۆڵەوەبووە، گورسیکە گیرایە ملی و خنکانی.

فەرموودەی خودای مەزن هاتە دی. ئەبولەهەب نەخۆشی زۆر پیسی گرت و، کەس نەئەچوو بە لایەوە، نەوەك نەخۆشی‌یەکەی ئەو بگرێت، بەبێ کەسی مردوو، دوای سێڕۆژ نرایە ناو گۆڕەوە.

هەرچەندە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ دوژمنی سەرسەختی بووە لە ژنان و لە پیاوان، خودای گەورە ناوی نەبردووە وەك ئەوان، لەبەر ئەوەبووە، ئەبولەهەب و ژنەکەی بە ناوبانگترینی دوژمنی پێغەمەر و ئایینی پیرۆزی ئیسلامبوون.

# ﴿ سورەتی ئەلئیخلاس ﴾

بەلای زۆربەی زانایان لایان وایە لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. هەندێ ئەڵێن: لە مەدینە هاتوونەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٤) ئایەتن.



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ اللَّهُ الصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴿٤﴾

## ﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

## به ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

بنچینەی ئایینی ئیسلام پێکهاتووە لە مانە: (١) باوەڕبوون یەکێتی خودا و هەموو سیفەتەکانی خودای مەزن. (٢) باوەڕبوون بە پێغەمەرایەتی پێغەمەر و، بە قورئان ئەو دەستوورەی خودا بۆی ناردووە. (٣) باوەڕ بوون بە زیندووبوونەوە و پرسیار و پاداشت. ئەو سوورەتەی ئیخلاس باسی بەشی یەکەم ئەکا و ئەفەرموێ:

﴿قُلْ هُوَ اللّٰهُ أَحَدٌ﴾ تۆ بڵێ: خودایە تاك و تەنها بە خۆی و بە سیفەتەکان و بە کردەوەکانیەوە، هاوبەشی نی‌یە لە هەموو شتێکا، هەموو ئەو کارانەی ئەیکا بۆ ئەوەیە سوود ببەخشێ بە بوونەوەران یا زیانیان لێبگێڕێتەوە.

﴿اللّٰهُ الصَّمَدُ﴾ پێویستی بە هیچ شتێ نی‌یە، هەموو شتێ پێویستیان بەو هەیە، چوونکە خودا درووستی کردوون و، سەرچاوەی هەموو بوونەوەرانە، کەسێکی ئەوتۆیە لە هەموو پێویستی و ڕووداوێکا پەنا هەر بۆلای ئەو ئەبرێ.

﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ﴾ خودا منالی نەبووە و، ئەگەر منالی ببێ ئەبێ وێنەی ئەو بێ و میراتبەری بێ، خودا بێ وێنەیە و، و میراتبەری نی‌یە و، لە کەسیش پەیدا نەبووە، ئەگەر لە کەسێ بووبێ، ئەبێ لەو کاتە بووبێ بە خودا لەو کەسە پەیدا ئەبێ.

﴿وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَدٌ﴾ وە هیچ کەسێ نەبووە بە هاوسەر و هاو وێنەی خودای مەزن، ئەگەر بیر بکەینەوە ئایەتی دووەم مانای ئایەتی یەکە و، ئایەتی سێ‌هەم مانای ئایەتی دووەمە و، ئایەتی چوارەم مانای ئایەتی سێ‌هەمە.

ئەو سوورەتە بەرپێچدانەوەی ئەو کەسانەیە ئەڵێن: دوو خودا هەیە: خودای چاکە و خودای خراپە. بەدرۆخستنەوەی ئەو کەسانەیە ئەڵێ: بتەکان هاوبەشی خودان، وولامی ئەو کەسانەیە ئەڵێن: عوزیر و عیسا و فریشتەکانی منالی خودان.

# ﴿ سورەتی ئەلفەلەق ﴾

لە مەدینە هاتوونەتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: لە مەککە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٥) ئایەتن.


بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان**

﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ﴾ تۆ بڵێ: من پەنا ئەگرم بەهۆی پەروەدگاری دڕینی شتێکە بۆ پەیداکردنی شتێ تر، هەموو بوونەوەرانی لە نەبوونەوە هێنایە بوون، یانێ بوونی بوونەوەران داپۆشرابوو، خودا دەری خست، تاریکی بە ڕووناکی بوون دەری خست، کانی ئاو و باران و ڕووەك و منالّی دەرهێناوە پەیدابوون.

زۆربەی زانایان ئەڵێن: ﴿الْفَلَقِ﴾ بە مانا بەیانیانە، چوونکە تاریکی لائەبا و ڕووناکی دێتە جێگای لەبەر ئەوەی زیان و خراپەی ئەو بوونەوەرانە زۆرزۆرن، خودای گەورە ناوی هەندێکیان ئەبا و، ئەفەرموێ:

﴿وَمِنْ شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ﴾ وە لە زیانی تاریکی شەو کاتێ تاریکی‌یەکەی هەموو شتێ ئەگرێتەوە. بەو بوونە ڕێگە ئاسان ئەبێ تاوانباران مەبەستی خراپی خۆیان جێبەجێ ئەکەن، لە پیلان و دزی و کوشتن و تالانکردن و داوێنپیسی و شتی خراپی تر لەوانەیە توشت ببێ لە وونکردنی ڕێگە ئازاری دڕندە ترس و خەفەت.

﴿وَمِنْ شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ﴾ وە تۆ بڵێ: من پەنا ئەگرم لە خراپە و لە زیانی ئەو کەسانە ئادەمیزاد ئەخەڵەتێنن بە فێڵ و دەست برێن و، دوایی تووشی ئازاریان ئەکەن، بە درۆ و بوختان نێوانی ژن و پیاو، نێوانی باوك و کوڕ و، نێوانی دۆست برا تێك ئەدەن، بە وێنەی ژنانی جادووگەر جادو ئەکەن لە گرێی دەزوودا کاتێ نوشتەیان بۆ ئەنووسن، فووی پێدا ئەکەن، بە ڕاستی دوزمانی و بوختان دەورێکی زۆر گەورەی هەیە لە تێکدانی نێوان ئادەمیزاددا، وەك ئەبێژرێ جادوگەران نێوانی ئادەمیزاد تێك ئەدەن.

﴿وَمِنْ شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ﴾ وە تۆ بڵێ: من پەنا ئەگرم لە خراپە و زیانی ئەو کەسانەی پێیان خۆشە ئادەمیزادێك خۆشی و چاکەیان لە ناوبچێ کاتێ هەوڵ ئەدەن بۆ نەمانی ئەو چاکەیە و، ئاوات ئەخوازن بۆ نەمانی چاکەیان. خودا فەرمانی داوە بە پێغەمەر، داوای پەناگرتن بکا لە خراپەی هەموو بوونەوەرێ، لە دوای هەموویانەوە خراپەی حەسوودی چونکە ئەوانە زیانیان سەختە و ئاشکرایە.

بۆ زانین: هەندێ لە زانایان ئەڵێن: جولەکەیە جادووی کرد لە پێغەمەر بەکرێدانی (١١) گرێ لە ژێی کەوان و، فڕەدایە ناو بیرێکەوە، دووایی پێغەمەر نەخۆش کەوت، ئەم سوورەتە و سوورەتی دووایی هاتە خوارەوە کە (١١) ئایەتن، جبرئەیل هەواڵی دا بە پێغەمەر بە جێگەی جادووەکە و، ژێ کەوانەکەیان دەرهێناوە و، ئەو (١١) ئایەتەیان بەسەر پێغەمەردا خوێندووە و، لە جادووەکە ڕزگاری بوو، زۆربەی زانایان ئەو کارە بە ڕاست نازانن؛ ئەڵێن: چۆن ئەبێ پێغەمەر جادووی لێ بکرێ، چوونکە ئەبێتە هۆی گومان پەیداکردن لە یاسای ئیسلامدا.

## ﴿ سورەتی نـاس ﴾

لە مەدینە هاتوونەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٦) ئایـەتن. هـەندێ ئـەڵێن لـە مەککـە هاتووەتە خوارەوە.



بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان**

﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ تۆ بڵێ مـن پـەنا ئـەگرم لـە پـەروەدگاری هـەموو ئـادەمیزاد کـە پەروەردەیان ئەکا لـە مناڵدانی دایکیانەوە هەتا کاتی مردنیـان، جـارێ بـە خۆشـی و جـارێ بـە ئازارەوە، هەرچەندە ئەو ئایەتە ڕووی پێ‌کراوە بۆلای پێغەمەر، بەڵام هەموو ئادەمیزاد ئەگرێتەوە لەو پەناگرتنەدا.

﴿مَلِكِ النَّاسِ إِلَهِ النَّاسِ﴾ پەروەدگارێکە پادشا و خاوەنی هەموو ئادەمیزادە، ئاگای لە کار و کردەوەیانە، پەرستراوی هەموو ئادەمیزادە، پەرستراوی تر هەموویان پڕوپووچن.

لەو ئایەتەدا خودا ئەفەرموێ خودا پادشـای هـەموو ئـادەمیزادە، بێگومـان پادشـای هـەموو بوونەوەرانە بەڵام بە تەنها باسی ئادەمیزادی کردووە؛ لەبەر ئەوەیە هەر ئادەمیزاد گومانیـان لـە دروستکردنی خودادا هەیە بۆ هەموو شتێ، هەر ئەوان بە شێوەیەکی گشـتی لـە خـودا یـاخی ئەبن.

﴿مِنْ شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ﴾ لەبەر ئەوە هەر خودا پادشا و پەرستراوی هەموو ئادەمیزادە با پەنابگرن لـە خودا لـە زیان و خراپەی کەسێ دوودڵی و بیرکردنەوەی کاری خراپ پەیدا ئـەکا لە دەروونتدا، خۆی پەنهان ئەدا و، ئەکشـێتە دواوە کاتـێ ئـادەمیزاد پـەنا بگـرێ لـە خـودا و ئاگاداری خۆی بێ، کاتێ ئاگای لـە نەما دێتەوە بۆلای.

﴿الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ﴾ خراپە و زیانی کەسێکی ئەوتۆ دوودڵی و بیرکردنەوەی خراپ ئەخاتە ناودڵی ئادەمیزادە لە جنۆکە و لە ئادەمیزاد، تاوان و خراپە ئەڕازێنینەوە بۆیان و هانیان ئەدەن بۆ کردنیان.

بۆ زانین: لەمەوبەر باسی ئەوە کرا کە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەهۆی جاد و لێکردنەوە نەخۆش کەوت، زۆربەی زانایان ئەو ڕووداوە بە ڕاست نازانن، وەك لە سوورەتی (ئەلفەلەق)دا باسی کرا، لەبەر ئەوەی توانای پێغەمەر کەم ئەکاتەوە و، چۆن گومانی وا ئەبرێ پێغەمەر بفەرموێ فلان شتم کردووە و نەیشی کردبێ و، بە گوێرەی ڕاستی جادوو نیە مایەکی ڕاستی بۆ نیە و، فێڵ و فڕی بەرچاوی خەڵەتانی ئادەمیزادە و، ئەمانە لە لایەکەوە و، لە لایە ترەوە ئایا نوشتە نووسین و فووکردن بە نووشتەدا درووستە یا درووست نیيە، زۆربەی زۆری هاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لایان وایە نووشتەنووسین درووستە، هەروەها ئەو زانایانەی دووایی لایان درووستە، بە جۆرێ بە زمانی سوورەیانی وعیبری و هیندی نەبێ ماناکانیان نەزانرێ، چونکە جێگەی بڕوانین و پشتیان پێ نابەسرێ، بە تایبەتی ئەگەر نووشتە لە فەرموودەی خودا و پێغەمەرەوە بنووسرێن درووستە. من پەنا ئەگرم بەهۆی خوداوە لە خراپەی دەروونی خۆم و کردەوەی خراپی خۆم. خودا پەروەردگار و پەرستراومە، موحەممەد پێغەمەرمە، قورئان پێشەوامە، خودایە لە گوناهی خۆم و باوکم و دایکم و خێزانم خۆشببە و، یارمەتی کوڕ و کچەکانم بدە لەسەر ڕێگەگرتنی ئایینی پیرۆزی تۆدا بەردەوام بین. ئامین.

**بە یاریدەی خودای مەزن کۆتایی بە تەواوی تەفسیری قورئان هات**

**( ٢٠ )ی مانگی ڕەجەب ( ١٤٢١ ) کۆچی بەرانبەر ( ١٧ / ١٠ / ٢٠٠٠ )ی زایینی**

# سەرچاوەكان


| ژمارە | سەرچاوەكان |
|---|---|
| ١ | جامع البيان في التفسير القرآن. تأليف الإمام الكبير ابي جعفر محمد بن جرير الطبري. |
| ٢ | تفسير غرائب الفرقان للعلامة نظام الدين الحسن بن محمد القمي النيسابوري |
| ٣ | أنوار التنزيل واسرار التأويل للقاضي ناصر الدين ابي سعيد عبد الله بن عمر البيضاوي. |
| ٤ | لباب التأويل في معاني التنزيل تأليف الإمام العلامة علاءالدين علي بن محمد المعروف بالخازن. |
| ٥ | تفسير النير المسمى بمدارك التنزيل و حقائق التأويل ابي البركات عبد الله بن أحمد النسفي. |
| ٦ | تنوير المقياس من تفسير ابن عباس لأبي طاهر محمود بن يعقوب الفيروز آبادي. |
| ٧ | التفسير الكاشف تاليف محمد جواد مغنية. |
| ٨ | مجمع البيان في التفسير القرآن لمؤلفه الشيخ ابو علي بن الحسن الطبرسي. |
| ٩ | حاشية شيخ زادة على تفسير القاضي البيضاوي لمحمد بن مصلح الدين القوجي. |
| ١٠ | الجواهر في تفسير القرآن الكريم تأليف الأستاذ الحكيم الشيخ طنطاوي جوهري. |
| ١١ | تفسير الكشاف لأبي القاسم محمود الزمخشري. |
| ١٢ | التفسير الكبير للعلامة فخرالدين الرازي. |
| ١٣ | لسان العرب المحيط للعلامة ابن منظور مع معجم لغوى علمي للعلامة الشيخ عبدالله العلايلي. |
| ١٤ | القاموس المحيط تاليف محى الدين محمد بن يعقوب الفيروز آبادي. |
| ١٥ | مسالك الذهب في معرفة قبائل العرب للشيخ الفاضل محمد أمين البغدادي. |
| ١٦ | كتاب فرهنك مردوخ تأليف فاضل شريف آية الله شيخ محمد مردوخي الكردستاني. |
| ١٧ | اعراب القرآن لأبي جعفر أحمد بن محمد بن اسماعيل النحاس. |
| ١٨ | كتاب المنجد في للغة والأعلام تاليف لويس معلوف. |
| ١٩ | المعارف لإبن قتيبة الدينوري. |
| ٢٠ | تقريب المرام في شرح تهذيب الكلام لأفضل المتاخرين عبد القادر السنندجي الكردستاني. |

| | |
|---|---|
| ٢١ | قرآن مجيد مترجم حسينى باللغة الفارسية. |
| ٢٢ | مفردات القرآن للعلامة الراغب الأصفهاني. |
| ٢٣ | كتاب الكنز المدفون للعلامة الشيخ جلال الدين السيوطي. |
| ٢٤ | التعريفات للسيد شريف على بن محمد أبي حسن حسيني الحرجاني. |
| ٢٥ | شبهات واباطل حول تعدد زوجات الرسول بقلم محمد على الصابوني. |
| ٢٦ | الإسلام يتحدى تأليف وحيد الدين تعريب ظفر الإسلام مراجعة دكتور عبد الصبور شاهين. |
| ٢٧ | شروح التخليص مختصر العلامة سعد الدين التفتازاني. مواهب الفتاح . عروس الأفراح. |
| ٢٨ | حياة الحيوان الكبري لاستاذ العلامة الشيخ كمال الدين الدميري. |
| ٢٩ | شرح العقائد الغسفعة للعلامة التفتازاني. |
| ٣٠ | المعجم المفهرس لالفاظ القرآن الكريم وضعه محمد فئواد عبد الباقي. |
| ٣١ | أسنى المطالب في الأحاديث مختلفة المراتب تاليف الإمام الشيخ محمد ابن السيد درويش الشهير بالحوت. |
| ٣٢ | فتوحات مەكى ابن العربي. |
| ٣٣ | بەرگى دووهەمى مێژووى ابن ئەلئەسير. |
| ٣٤ | دفاع عن السلام لوارنيت فاغليري. |
| ٣٥ | الإسلام والعقل. |
| ٣٦ | زاد العماد. |
| ٣٧ | أضواء البيان بەرگى يەكەم. |
| ٣٨ | مستقبل الذرة لتريقوي. |
| ٣٩ | التغذية والمشروبات الروحية لدكتور أمين روه يحة. |
| ٤٠ | أحكام القرآن للجصاص. |
| ٤١ | روح البيان |
| ٤٢ | روح المعاني لآلوسي. |

| | |
|---|---|
| ٤٣ | الإسلام سوانح وخواطر. |
| ٤٤ | ايام امريكا لدكتور زكي محمود. |
| ٤٥ | في بحار المجلس للشيخ تانجار. |
| ٤٦ | حاضرة الإسلام سروب شرداز وترجمة الأمير شكيب ارسلان. |
| ٤٧ | اظهار الحق للشيخ نعمة الله هيندي. |
| ٤٨ | الرحلة المدزسية للشيخ جواد البلاغي. |
| ٤٩ | بروتوكۆلات حكماء صهيون. |
| ٥٠ | محمد في الأسفار الدينية العالمية لعبد الحق فدرياني. |
| ٥١ | دائرة المعارف الفرنسية الكبرى. |
| ٥٢ | اطلاق الحمامة لعلباين من ترجمة ماهر عسل. |
| ٥٣ | تفسير المنار. |
| ٥٤ | دائرة المعارف البريطانية. |
| ٥٥ | الأستراتيجية الأمريكية في السياسة العالمية تأليف نيكولاس بكمان الأمريكي. |
| ٥٦ | مفتي المحتاج الى معرفة معاني الفاظظ المنهاج في الفقه الشافعي شرح الشيخ محمد الشربيني الخطيب. |
| ٥٧ | تحفة المحتاج بشرح المحتاج في الفقه الشافعي للعلامة شهاب الدين أحمد ابن حجر اليتمى. |
| ٥٨ | بلغة المسالك الى مذهب الإمام مالك تاليف الشيخ احمد بن العادي المالكي. |
| ٥٩ | الإقناع في فقه الإمام أحمد بن حنبل تاليف قاضي دمشق العلامة ابي النجا شرف الدين موسى لحجاوي. |
| ٦٠ | نيل المارب بشرح دليل الطالب للشيخ الإمام عبد القادر ابن عمر الشيشاني على مذهب الإمام أحمد. |
| ٦١ | القرآن والعلم الحديث. |
| ٦٢ | معجم المصطلحات العلمية والفنية. |

| | |
|---|---|
| ٦٣ | التكامل في الإسلام دانراوى أحمد أمين عراقي. |
| ٦٤ | تەفسيرى جەمەل. |
| ٦٥ | الجريدة النفسية في التأريخ الكنيسة. |
| ٦٦ | اصول االشرائع (دانراوى) بتنام فەيلەسوفى انگليزى. |
| ٦٧ | احكام القرآن لإبن العربي (المقاغري الأندنوسي المالكي). |
| ٦٨ | كتاب العبقرية الإسلامية. دانراوى عقاد. |
| ٦٩ | تەفسيرى مەراغى. |
| ٧٠ | بحر المحيط. دانراوى ئەبو حەيانى ئەندەلوسى. |
| ٧١ | (قصة الحضارة) دانراوى (د.ل ريوانست) |
| ٧٢ | (التاج الجامع للأصول في احاديث الرسول) |
| ٧٣ | تەفسيرى (الميزان) |
| ٧٤ | رۆژنامەى (الأخبار القاهري) ١٧ تمزى ١٩٦٩ |
| ٧٥ | (كتاب العبقرية الإسلامية) دانراوى (العقاد). |
| ٧٦ | گۆڤارى (يونسكۆ). |

# پێڕست

## خوێنەری هێژا لەم جزمەدا ئەرکی چاوپیاخشانی ئەم هەڵانە بگرە ئەستۆی خۆت

| هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ |
|---|---|---|---|
| رجعهم | رابعهم | ٣ | ٦ |
| ڕوادا | ڕوداو | ٤ | ٧ |
| وَن بەڕەوای | بەڕەوای | ٤ | ١٠ |
| تەتابوغ | تەتابوع | ٦ | ٦ |
| فەمانی | فەرمانی | ٦ | ١٩ |
| باوەڕی یان | باوەڕیان | ٩ | ٢٢ |
| بەهەشیمان | بەهەشتیان | ١٥ | ١٦ |
| پێغەمەرەی | پێغەمەری | ١٦ | ١٢ |
| گرنترین | گرنگترین | ١٨ | ٢٢ |
| حودا | خودا | ٢٢ | ٢ |
| ڕقێی | فەیێی | ٢٢ | ٧ |
| سودییان | سودیان | ٢٩ | ٦ |
| یێو | ئێوە | ٣٢ | ٣ |
| لەبارەوە نێو | لەو بارەوە ئێوە | ٣٢ | ١٠ |
| زۆر | زۆرە | ٣٨ | ١٤ |
| نەستار | ئەسفار | ٣٩ | ٩ |
| ئەستار | ئەسنعار | ٤٤ | ١٠ |
| باوەڕییان | باوەڕیان | ٤٧ | ١٢ |
| تاقمانا بور | تاقمانەبوون | ٤٧ | ١٥ |
| ئایان | ئەیان | ٥٠ | ٣ |
| ئەدوڕوانە | ئەو دووڕوانە | ٥٧ | ١٢ |
| برایی | برای | ٥٨ | ١٠ |
| شایستەی ی | شایستەبێ | ٦٢ | ١٦ |
| بێ حەیزە | سێ حەیزە | ٦٩ | ٢ |
| ئەو کەسانە | ئەو کەسانە مەکە | ٩٣ | ٢٥ |
| بەسەرییانا | بەسەریانا | ١٠٤ | ١١ |
| باسیا | باسیان | ١٠٦ | ١٥ |
| ترییان | تریان | ١١١ | ١٣ |
| ئەوتۆن ئەوان | ئەوتۆن | ١١٣ | ٢٠ |
| تاواناران | تاوان باران | ١١٦ | ١٣ |
| لەیش | لەپێش | ١١٧ | ١٩ |
| دواکەوتنی بن | دواکەوتنی من | ١١٩ | ٤ |
| پاکییان | پاکیان | ١٢٨ | ٢ |
| پەروەردگرای | پەروەدگاری | ١٠٣ | ١٠ |
| لفأخذناه | فأخذناه | ١٣٣ | ١٨ |

| هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ |
|---|---|---|---|
| نەهێناوە | هێناوە | ١٤٩ | ٢٦ |
| دووروا خراوە | دواخراوە | ١٥٩ | ٢٨ |
| مەڕنح ون | مەڕنح | ١٦٤ | ٢٣ |
| لەناوچون هیچ توانایە | زیادەبە | ١٦٥ | ١١ |
| ئێوەی | ئێوەی بێ | ١٧١ | ١٧ |
| تۆبە | تۆیە | ١٧٣ | ٨ |
| بەخشندەو | بەخشندەی | ١٧٤ | ١٠ |
| بەو | ئەو | ١٧٦ | ١١ |
| بەوجوە | بەو جۆرە | ١٧٧ | ١٦ |
| لەشەیتانە | لەشەکانیان | ١٨٠ | ١٠ |
| لای ئێوە | ئارەزوی بکا لە ئێوە | ١٨١ | ٢٥ |
| ترییان | تریان | ١٨٣ | ٨ |
| دۆزی خ | دۆزەخ | ١٨٣ | ٢٣ |
| ببە | بە | ١٨٤ | ١٦ |
| ترییان | تریان | ١٨٩ | ١٢ |
| وەزیرەی | وەزیری | ١٩٣ | ٢٥ |
| ئەیان حستنە ئەو | ئەیانخستە ناو | ١٩٦ | ٣ |
| ڕاژە | ڕۆژە | ١٩٩ | ١١ |
| بەخشندەو | بەخشندەی | ٢٠٠ | ١٣ |
| بەسەریانا | بەسەریانا نیە | ٢١١ | ٥ |
| ئەنازری | ئەنازێ | ٢١١ | ٦ |
| من و | من | ٢١٦ | ١٤ |
| بەکەسانە | بەکەسا | ٢١٧ | ١٦ |
| خودای | خودا | ٢٢٠ | ١٣ |
| لەشەودا | لەو شەوەدا | ٢٣٠ | ١١ |
| شتی | شتی تر | ٢٣٠ | ١٥ |
| خۆشنو | خۆشنود | ٢٣٤ | ١٨ |
| بوختان و | بوختان | ٢٤٤ | ١٢ |
| بردبون | کردبون | ٢٤٨ | ٨ |
| خودا | خوراو | ٢٥٠ | ٢٦ |
| ل قورئان | لە قورئان | ٢٥٤ | ١٦ |
| بێ ح ئەکا | لێ ئەکا | ٢٥٩ | ٩ |
| ئاگای | ئاگای لەخۆی | ٢٦٥ | ٢٤ |
| التفسیر | تەفسیر | ٢٦٧ | ٩-٣ |
| | | | |